# مێژووی گەلی کورد

## لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ

&

## نەتەوەی کورد تورکمان نیە


نوسینی

صاڵح قەفتان



چاپی سێیەم

سلێمانی ٢٠٠٥

کتێب: مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ

نوسەر: صاڵح قەفتان

چاپخانە: ئۆفێستی شڤان

چاپی سێیەم : ساڵی٢٠٠٥

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردنی (٣٦٩)ی ساڵی ٢٠٠٤ ی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی

کوردستانی پێسپێردراوە

## ڕونکردنەوەیەک

## لەسەر (مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ)

لەساڵیادی کۆچی دوایی مێژونووسی گەورەی گەلەکەمان، مامۆستا (صالح قەفتان)دا سەری ڕێز بۆ ئەو نەمرە ماندوو نەناسە دائەنەوێنین. پێمخۆشە لەم بۆنەیەدا لەچاپدانەوەی بۆ جاری دووەمی ئەم بەرهەمە دەگمەن و بەنرخەی مامۆستا بکەم بەدیاری بۆ گیانی پاکی مامۆستای پایەبەرز صالح قەفتان کە لە( ١٩٦٨/٨/٣٠)دا کۆچی دوایی کردوە، بەهیمەت و تەقەلای هەموولایەک بەمرازی خۆمان گەیشتین و توانیمان جارێکیتر بەدیدەی خوێنەری کوردی شاد بکەینەوە. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەو بەرهەمو ڕەنجەی مامۆستای مێژونووس هەمیشە بەزیندویەتی ئەمێنێتەوە، لەچاپدانەوەی بۆ جاری دووەم دیارییەکی گەورەیە بۆ نەوە تازەپێگەیشتووەکانی نەتەوەکەمان و خوێنەران، کەئەم کتێبە لەسەردەمی خۆیدا سودێکی زۆری لێبیترناوە، واتە لەکۆتایی ساڵەکانی شەستەکاندا ڕەواجێکی زۆری هەبوو، بگرە تا ساڵی نەوەتەکانیش. کە پێموایە ئەکرێ لەزانکۆ لەبەشی مێژوو وەک سەرچاوەیەک سودی لێوەربگیرێت.

ئەگەرچی من پسپۆڕی بواری مێژوو نیم، بەلام ئەوەندەی لەمێژووی کورد شارەزام و ئەوەندەی ئەو کتێبە مێژووییانەم خوێندۆتەوە وئەوەندەی سودم لەو کتێبە بینیوە، دڵنیام وئەزانم کە سەرچاوەیەکی گرنگ و دەگمەنە ئەتوانرێ بەسەرچاوەیەکی مێژوویی نەتەوەی کورد

دابنرێت... لەساڵی هەشتاکاندا کە وەك کتێبێکی دانوسقە و دەگمەنی مێژووی کورد شان بەشانی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسیی و کوردوکوردستانی ئەمین زەکی بەگ ومێژووی ئەدەبی عەلادین سجادی وچەند سەرچاوەیەکی گرنگی ئەو ساڵانە بوو، کە خزمەتێکی گەورەیان بە خوێندکارانی کورد کرد. لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا هەر بەو گرنگی و بەنرخییەی ماوەتەوە، مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە.. یەکێکە لەو شاکارە بەنرخ و دانوسقانەی کە هەمیشە گرنگییەکی خۆی ئەبێت لەئێستا و لەداهاتوودا، وەك لەرابردوودا هەیبوو.. ئەوەی زیاتر هانیدام ئەوە بوو کە زۆربەی زۆری کتێبە مێژووییەکان یەك لەدوای یەك لەچاپ دەدرێنەوە. بۆیە جێی خۆیەتی وەك وەفا و ئەمەکێك بۆ ئەو کەڵە پیاوە، ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ و جارێکی تر بەچاپی بگەیەنینەوە، بەچاپکردنەوەی وەك دیارییەك بۆ رۆحی پاکی مامۆستا صالح قەفتان، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ خاتوو گوزیدە قەفتانی کچیدا دیدارێکمان سازدا و رێکەوتین، کە ئەویش زۆرخۆشحاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەی کە لەبیری ئەوەدا بووە کە چۆن و بەچ رێگەیەك ئەو کتێبەی باوکی چاپ بکاتەوە. کاتێکیش من ئەو پێشنیارەم کرد و ئامادەیی خۆمم دەربڕی کە ئەوئەرکە ئەگرمە ئەستۆ، پێشنیارەکەی زۆر بەدڵ بوو. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و تێبینی من بوو ئەوەیە ئەم کتێبە بەرێنوسی ساڵەکانی شەستەکان وحەفتاکان نوسراوە، بۆیە من پێم باش بوو کە هەوڵ بدرێ لەگەڵ رێنوس و زمانی ئەدەبی ئەم سەردەمەدا یەك بخرێتەوە، بەڵام ئەوەی کە من توانیم و پێم باش بوو و وە ئەو دەسەڵاتەشم تیا هەبوو، کەمێك

گۆڕانكاریم تیا كرد، بەڵام زۆرتری نەویست، بۆیە بەلامەوە باش بوو لەچاپی سێیەمدا تێبینی ئەوە بكرێت و بەهەند وەربگیرێت....

وەك سەرچاوەیەكی مێژووییش كە ئەكرێ بە بەلگەو سەرچاوەیەكی گرنگ دابنرێت، لەهەمان كاتیشدا هەوڵ ئەدەم كە بتوانم بەرهەمەكانی تری مامۆستا صالح قەفتان لە بەرگێكی تردا هەموو كۆبكەمەوە وبتوانم چاپیان بكەم. كە بەرهەمێكی زۆری هەیە. هەروەها زۆر سوپاسی هەموو ئەو كەسانەی كە ڕێنمایی و ئامۆژگاریی و تێبنییان هەبوو لەسەر چاپدانەوەی ئەم كتێبە، بەتایبەتی خانوادەی خوالێخۆش بوو. بەڵام لەچاپی سێیەمدا بەباشمزانی كە یەكێك لەبەرهەمە گرنگەكانی تری نوسەر لەگەڵدا چاپ بكەم، كە ئەمەش سەرچاوەیەكی گرنگە بۆ ئەم ساتەوەختەی كە مەسەلەی كورد و كەركوك گەیشتۆتە ئاستێكی گرنگ و چارەنوساز و چەسپاندنی مافەڕەواكانی گەلی كورد.

فازیل هیمەت

٢٠٠٤/٨/٢٠

## سەرەتا

ئەم نوسراوەی ئێستا لەبەر دەستایە باسی مێژووی کورد ئەکا لە زۆر کۆنەوە هەتا ئەمڕۆ، بە درێژیو بەپێنوسێکی رەوان، هەموو ئەو پلەو رووداوانەی بەسەر گەلی کوردا هاتوە ئەیخاتە پێش چاو، وەکو هەموو نوسراوێکیتر ئەمیش لایەنی تەواوو ناتەواوی هەیە. لایەنی تەواوی زۆر تیایە بەلای منەوە هەرە گرنگیان ئەوەیە کە نوسەر بە هەستێکی نیشتمانپەروەرێتییەوە مێژووەکەی نوسیوەتەوە، بەلاّم ئەم هەستە وای لێ نەکردووە لەرێ لابدات‌و دەمار بیگرێ و لەخۆیەوە رووداو دروستبکات‌و بەخۆڕایی بەشانوباهوی ئەتەوەو مێژووە کەمانا هەلّدات، لەبەر ئەوە ئەبینن پەتی نوسینی زانستی بەرەللاّ ناکات، وە لەو شوێنانەی ئەهێنێ، شانازی ئەکات و بەسەریا هەلّئەدات وە لە شوێنی تریش پلاری رەخنە ئەهاوێ‌و نازاپانە ئەو ئەخۆشی و ناتەواوییانە دەستنیشان ئەکات کە لە مێژەوە بوونەتە هۆی دواکەوتن‌و یەکنەگرتنی میللەتی کوردو نیشتمانەکەی. لایەنێکی گرنگی تریش هەیە، ئەوەش ئەوەیە، کە هەتا ئەمڕۆ هەرچی لەسەر مێژووی کۆن‌و سەدەکانی دوای پەیدابوونی ئیسلامی مێژووی کورد، بە جۆرێکی وەها ئالۆزاو نوسراوەتەوە مەگەر پسپۆڕێك سەری لێدەرکات بەلاّم نووسەری ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی ماوەیەکی درێژ مامۆستا بووە توانیوێتی ئەم مێژووە دوورودرێژە بەجۆرێکی وەها رێکوپێك بنووسێتەوە کەهەموو خوێندەوارێك بە ئاسانی تێبیگات‌و روخسارو وێنەی کۆن‌و نوێی میللەتەکەی بەروونی بێنە بەرچاو، هەر لەبەر ئەمەشە ئەمەوێ ئەوە بلّێم کە ئەم نوسراوە یەکەمین هەولّدان‌و بەرهەمە لەم لایەنەوە، ئەشێ لەقوتابخانەکاندا بخوێنرێت.

رەنگە قورسترین لایەنی ناتەواوی ئەم نوسراوە کەسەرنج زۆر رائەکێشی ئەوەبێ، کە نووسەر زۆر بەکورتی لە مێژووی نوێی گەلی کورد دواوە، بگرە هیچی دەربارەی بزوتنەوەی رزگاری کورد لە کوردستانی عێراق لەسەرەتای

سەددی بیستەمەوە نەنوسیوە. لێرەدا جێی رەخنەو لۆمەیە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی مێژووی نوێی گەلەکەمان وەك ئەو سووتەمەنییە وایە کە ئاگری خەباتی رزگاری ئەمڕۆی کورد جۆش ئەداو نەك هەر لەبەر ئەوەش ئەو مێژووە داستانی بزوتنەوەی رزگاری راستەقینەی کوردە، بەڵکو لەبەر ئەوەش نووسەر لەوسەردەمە پڕ لە رووداوانەدا ژیاوەو بگرە بەشداری بەشێك لەو رووداوانەیکردوە بەتایبەتی سەردەمی بزوتنەوەکانی شێخ محمودی نەمر، لەبەر ئەوە نەیتوانی زۆر بەدرێژی لەسەر ئەو ماوەیە بنووسێ‌و شتی نوێمان زۆر بداتێ، بەمە سامانێکی مێژوویی گەورەی لەدەستداین، چونکە ئەمڕۆ پێویستیمان زۆر بەو باس‌و رووداوانە هەیە کە لە دەروونو سنگی ئەم و ئەودا شارراونەتەوەو هێشتا نەخراونەتە سەرکاغەز. ئەو باسانە کە نوسینەوەی هێندەی تر کونو قوژبنی مێژووی نوێمان بۆ روناك نەکاتەوە. لەبەر ئەوە ئەمە بەهەل ئەزانم کە داوا لە هەموو ئەو کەسانە بکەم کە شتێك دەربارەی مێژووی نوێمان ئەزانن (جا زۆربێ یان کەم )بیخەنە سەر کاغەز پێش ئەوەی لەگەڵ خۆیانا بیخەنە گۆڕەوە. دوایی هیوامانە کە بڵاوکردنەوەی ئەم نوسراوە هاندەرێك بێت بۆ نوسەری تر چییان هەیە دەربارەی مێژووی کورد بیخەرە بەردەست چونکە میللەتەکەمان زۆر پێویستی هەیە بەشارەزایی لە مێژووەکەی. دواشت نەمەوێ بڵێم: کە ئەم کتێبە لە کۆنەوە نوسراوەتەوە، بێ ئەوەی دەستکاری بکەین، بڵاومانکردەوە. چونکە ئەم جۆرە نوسینە پلەیەکە لە پلەکانی نوسین‌و ئیملای کوردی.

**دکتور کاوس قەفتان**

**بەغدا/ ئابی ١٩٦٨**

*******

## پێشڕەو

بەدیار چاومانەوە ئیمڕۆ دنیای ئینسانیەت لەهەموولایەکەوە مشووری حاڵی خۆی ئەخوات، لەم عالەمەدا هەر نەتەوەیەك لە نیشتمانی خۆیا بۆ خۆشیی پاشە ڕۆژی، خەریکی پێکەوەنانی کۆشكو سەرای زیندەگانیو شارستانییە، کەچی بەرامبەر ئەمە ئێمە کولانەیەکمان پێکەوە نەناوە لەناحیەی زانستیدا بۆ داگیرساندنی چرای هۆشیاری لە مێشکی مرۆڤی نەتەوەکەمانا، لە مێژووەکەی (ئەمین زەکی بەگ) بەولاوە ئەسەرێکی بەنرخی ترمان نەهێناوەتە کایەوە. هەمووشمان ئەمانە ئەزانین و پێی لێ ئەنێین کە لەم ڕووەوە چ کلۆڵییەکمان بەسەرهاتووە. خۆزگە لەناو ئەم عالەمەدا بەتەنیا ئێمە لە کەمتەرخەمیدا ئەوەندە پێشکەوتوو نەبووینایە!.

لەزۆر دەمێکەوە مەراقم بوو کە مێژوویەکی میللی بنووسمەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بە تەواوی شارەزای زمانی بێگانە نەبووم تا لە موتاڵای ئاساری ئەوانەوە ئەوی پێویستە بۆ نووسینی مێژوویەکی وەها پەیای بکەمو ئەمتوانی تەقەلایەك بدەم، چونکە هەموو ئەیزانین کە مێژوو نووسین شتێکی ئاسان نییەو، هەر قسەی وشك کەڵكو مەسلەحەتی عیلمی تیانییە. هەواڵی ڕابوردوو خوێندنەوە، ئەگەر لەسەر بناغەیەکی ڕاستو دروست نەبێتو وریاییەکی نەدەبیو کەڵکێکی زانستی نەبەخشێت، چ ڤانزاجێکی ئەبێ؟ مادام لە خوێندنەوەی (مێژوو) مەبەست ئەوەیە کە ڕووناکییەك بۆ ئەفکار پەیدا بێتو لە تەجرەبەی کۆن بۆ حاڵی حازر کەڵك وەرگیرێتو بۆ وریاییو قایمکاری پاشەڕۆژ خۆ حازربکرێتو ئەمەش ئەبێ لەسەر بناغەیەکی زانیاریو وردبوونەوەیەکی خونەرەوەری مێژوویی بنیاتبنرێت، ئینجا ئەو کەڵکە دەسگیر ئەبێ.

کەوابوو بەپێی ئەم تێبینیانە بۆ ئەوەی بتوانم مێژوویەکی میللی بنووسمەوە، لە چاودرڕانیکردنی هەڵێك بەولاوە هیچ دەردەتانێکی ترم نەمابوو،

بەردەکەتدا تێکۆشینی (ئەمین زەکی بەگ) نەیهێشت ئەم ئاواتە ببەمە گڵەوە.
هەر کە مێژووە بەنرخەکەی دەرچوو ئەم فرمانە بۆ من گەلێك ئاسان بوو، چونکە ئەم پیاوە بزور گەوارە، ئاساری تەئریخی، جوغرافیو ئەتنۆگرافی هەموو نەتەوەکانی ڕۆژاوای نزیکی زۆر بەسەلیقەیەکی زانیارانە پشکنیوەو، لە کتێبەکانیا ناوی نەتەوەکانی هێناوە، وە ڕووداوەکانی لە دوای بژاردن بەیان کردووەو لە ئەنجامی کارا گەنجینەیەکی عیلمیو مێژوویەکی هونەروەری نەتەوەی (کورد)ی ئەوتۆی بەرهەمهێناوە کەمانەندی نەبێت و هەرئەوەی پێ ئەوێ کە لەسایەی موتالاکردنی ئەم گەنجو جەواهێرانی عیلمییەوە کەسێك بیەوێ مێژوویەکی میللی بۆقوتابیانی مەکتەب (مەدرەسی) بەرهەم بێنێت و بیخاتە کایەوە تاکو پەیڕەوکاری ئەو سەرداری زانستییە ببێ، بەڵکو بەو بۆنەیەوە چرای هوشیاربوونەوەی نەتەوەکەمان لە ئاسۆگەی (ئەمەل) دەرکەوێ؟! ئەنجا منیش بەهیوای دەسوەشاندنێکی وەهام، بەڵام لە ترسی غەڵەتکردن زۆر بەشێنەیی ئەم چەندوەختە خەریك بوومو، دووەم شەڕی جیهانیو حاڵەتی خووی خۆمو مەترسی دەستدرێژی (دەوری بائید) زۆر دوایخستم، بەڵام نەبەزیم و لە تەقەلادان دوانەکەوتم، هەتا ئاواتم بەجێهاتو ئەم نووسراوەم بەرهەمهێنا، وە بە ناوی (مێژووی نەتەوەی کورد)دوە ناومناو پێشکەشی کۆمەڵی لاوانم کرد. جا دوایی وتەم و لە پاداشتی ئەم ئەرکەما ئەوپەڕی نیازم ئەوەیە کە لە پێناوی هۆشیار بوونەوەی (گەلەکە)، ئەگەر کەڵکێکم بوو بێت، ئەوەم بەخزمەتێکی (مەعنەوی) بۆ حیساب بکرێ خۆم بە بەختیار ئەژمێرم.

نوسەر
سلێمانی ١٦/٤/١٩٥٩

سەرەتا:

## پەیدا بوونی نادەمیزاد لەسەر زەمین

لەسەر ئەم زەمینە هەندێك تیرەی ئینسان هەیە هێشتا بەڕووتی ئەژین، هیچ هۆیەکی مەدەنییانە نازانن کە بەو هۆیەوە خۆیان بژێنن. ئەکشتوکاڵ ئەزانن، ئەحەیوان بەخێوکردن. وەك ڕوت وانە، کێوییانە ئەژین بەڕاوی حەیوان وە یا بەری دارو درەخت بەرەگیا کۆ ئەکەنەوە، ئەوە ئەخۆن. ئینجا نادەمیزادەکانی سەر ئەم زەمینە لە پێشا هەموو وەها بوون، کەس نازانێ باسی ڕابوردوویان چلۆنبووە، بەڵام کە نووسین‌و خوێندنیان داهێنا ئەوسا توانییان باس‌و هەواڵی خۆیان بنوسن‌و بگێڕنەوە. لەبەر ئەوە مێژوو نووسەکان هەواڵی مێژوویی نادەمیزادیان کردووە بە دوو بەشەوە، ئەوانەی کە نوسینیان ئەزانیوە ناویانناون (ئینسانی پێش مێژوو)، وە ئەوانەی کە نوسینیان بوومو باسی خۆیان نوسیوە ئەوانەشیان ناو ناوە (نادەمیزادی دەوری مێژوو)...ئینجا ئێمە لە پێشا جارێ باسی ئینسانی پێش مێژوو ئەکەین لە دوایی ئەوە ئەچینە باسی مێژووەکەی خۆمانەوە لەم کتێبەدا، چونکو وەها ئەکەین کتێبەکەمان بەناتەواو دائەنێین؟! لەدوای ئەم چەند وتەیە ئینجا سەرەتایەکیش ئەنووسین لەبارەی مێژووی نەتەوەکەمانەوە. پێشنەوەی بچینە ناوەڕۆکی باسەکەمان، ئەگەر بێتو لەسەرەتای ئەم کتێبەمانا دەربارەی هەواڵ‌و نیشتمانی ئێستای (کوردان)و سنووری وڵاتەکەمان زانیارییەك بدەین، ئینجا دەسبکەین بە گێڕانەوەی مێژووی ڕابوردوومان، بەوە لە مێژووی نەتەوەکەمان چاکتر تێئەگەین. هەرکاتێك ڕوانیمانە هەواڵی تەئریخی میللەتانی‌تر ئەبینین هەموو نەتەوەیەك بۆ ساغکردنەوەی ڕەگەزی قەومایەتی خۆی تەقەلای داوەو شتێکی پێکەوە نووساندووە. کەواتە ئێمەش بۆ نووسینی مێژووی خۆمان پێویستە وەك ئەوان بکەین. مادام ئیمڕۆ نەتەوەیەك هەیە بەزمان‌و کردەوەیەکی تایبەتی میللی خۆیەوە ئەژی‌و ناوی (کورد)ە لە وڵاتی ئەژادیا لەپێش

میژووەوە جێگیر بوودو کردویە بە نیشتمان بۆ خۆیو تا ئێستا ئەو وڵاتەی پاراستوودو بەڕەوشتوخوو بەزمان جیایە لە میللەتانیتر، گومان نامێنی کە ئەمیش وەك میللەتەکانی تر ڕابوردوویەکی هەیەو لە ژیانا وەك ئەوان لەگەڵ ژێرەو ژوورو ناڵۆزی ژیانا چنگی لێکداودو خەباتیکردووە.

**دەوری بەرد:**

وێنەی ئالەتی دەستکردی ئینسانی پێش مێژوو، کە لە ئێسك کردوویەتی، ئەم تاقمە بەردە ڕێکخراوو تیژکراوانە ئادەمیزادە زۆر کۆنەکان دروستیانکردووەو لە باتی شەڕیان پێکردوودو هەندێکیان بۆ شتی تریش بەکارهێناوە.

**ئادەمیزادی کۆن:**

ئەمە سێ وێنەی ئادەمیزادی زۆر کۆنە کە لەسەر زەمین بەیەنێك ژیاوە، ئینجا نەماوە:

١. وێنەی یەکەم ئادەمیزادی

هەرە کۆنە لە (جاوە) دۆزراوەتەوەو ناونراوە (کنثرۆبۆس) یەعنی جۆرێك لە مەیمون.

٢- لە شوێنی (نیاندەرتاڵ) ناوا لە ئەڵمانیا ئەم وێنەیە دۆزراوەتە کە لەعێراق و جێگای تریشا بینراوە.

٣- ئادەمیزادێك کە بە (کرۆمانیۆن) ناونراوە، دۆزراوەتەوە کە لە چاو ئەوانەی لای سەروو ئادەمیزادی هەرە تازەیەو دانراوە بە (نەژاد)ی ئادەمیزادی ئێستا.

***دەوری ئەشکەوت:***

لە نیوەی دەوری بەردی کۆنا (نیاندەرتاڵەکان) لەناو بەفرو سەرما خزاونەتە ئەشکەوتەکان. بەوە ماڵیی بوون و ترسی دڕندەشیان لە کۆڵ کەوتووە، ئاگریان ئەسوتان، لەم دەوردا ئادەمیزاد گەلێك شت فێر بووە، ڕێکوپێك قسەی کردووە، وێنەی حەیواناتی ڕەسمکردووە لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان کە ڕاویانکردوون و گۆشتیشیان خواردوون، ئەشکەوتەکانی ئەوروپا پڕن لەو ڕەسمانە.

## ئادەمیزادی پێش مێژوو:

ئادەمیزاد زۆر درەنگو بەرێکەوت تووشی (ئاگر) بووە، جاریٚ لێی ترساوە، توخنی نەکەوتووە. ئینجا کەزانی لێی جیا نەبوەتەوە.ئادەمیزادی دەوری بەردی کۆن بەراو خۆی ژیاندووە، چونکو هێشتا فێری کشتوکاڵ نەبومو ئاژاڵ بەخێوکردنیشی نەزانیوە. بەڵام وردە وردە کاسەو کەوچك دروستکردن فێربووە، ئەویش لەدوای هەزاران ساڵ سەری گرتووە.

## ئینسانی پێش مێژوو چۆن ژیاوە؟! کاتی پێش مێژوو

لەپێش هەموو شوێنێکی سەرزەمینا (مێژوو) لە (عێراق)و لە (میسر)دا گوشادبووە، ئەویش لەسەرەتای سێهەم هەزار ساڵی پێش میلادبووە، واتە ئەو کاتە دەسکراوە بە خوێندن و نووسین. ئینسانی پێش ئەو کاتە شتی بەردەستی خۆی لە (بەرد) دروستکردوومو بەجێیهێشووە. لەو بەردانەوە ئەزانین کە ئینسان لەوێدا ژیاوە. ئەمانە بەردیان تیژکردووەو کردوویانە بە چەك کە خۆیانی پێ بپارێزن. بۆیە زاناکان ئەم دەورەیان ناو ناوە (دەوری بەرد). جارێ لەمە زیاتر ئینسان هیچی تری نەزانیوە، تەنانەت وەکو حەیوانات ژیاوە هەتا نوسین فێربوومو هەواڵی خۆی نووسیوە، بۆیە مێژوو نووسەکان پەیدابوونی نوسینیان داناوە بە (دەوری پێش مێژوو)، یەعنی داهاتنی نوسین. ئینجا دەوری پێش مێژوو زۆر گران کەوتوودتە سەر ئادەمیزادو زۆر بەناخۆشی ژیاون. بەڕاوی حەیواناتو کۆکردنەوەی بەری دارو درەخت و بەرە گیا ژیاون. ئەم دەوری پێش مێژووە زۆر درێژە، لەسەدا، ئەوەدو پێنج (٩٥٪)ی هەموو کاتی ژیانی ئینسان ئەگرێتەوە هەتا ئیمڕۆ. ئەم دەورە بەردینەش کراوە بە دوو بەش، هەر دەورە بەشتومەکی تایبەتی خۆی جیابووەتەوە، بەپێی شتو مەکێك کە ئینسانەکان توانیویانە دروستی بکەن بۆ خۆیان، وە ناونراون بە (دەوری بەردی کۆن)و (دەوری بەردی تازە).

---

[1] ئەم باسە لە کتێبی مێژوویی (طه باقر) چاپی پێنجەم وەرگیراوە، چاپی ١٩٥٦ی م.

## دەوری بەردی کۆن:

لەم دەوردەدا مرۆڤ زۆر کێویی بووە، بۆ ژیان تەقەلایداوە، خواردەمەنی کۆکردنەوە لەبەرە گیاو دارودرەخت، وە بە شوێن حەیوانا عەمودالبووە بۆ ڕاوکردنی. خۆی هیچ خواردەمەنییەکی پێک نەهێناوەو دانەنیشتووە لە جێگایەکا. نە کشتوکاڵی زانیوە، نەحەیوان ماڵیکردن. لەبەر ئەوە ئەگونجێت بەم دەوری بەردی کۆنە بڵێین: (دەوری کۆکردنەوەی خواردەمەنی). وە چونکو

هێشتا بە ئاگری نەزانیوە، خواردەمەنییەکانی بەکاڵیی خواردووە. بەڵام لەدەوری بەردی تازەدا ژیانی ئابووری ئینسان لە بنەڕەت گۆڕاوە، چونکە فێری کشتوکاڵ بووە، ئاژەڵی ماڵیی کردووە. خانوو بەردی پێکەوە ناوە، کاشیو کاسەی

لەقوڕ دروستكردووە. جاران كە خواردەمەنی لە كێوان كۆ ئەكردەوە، ئیستا خۆی خواردەمەنی پێك ئەهێنا.

## ئینسان لەدەوری بەردی كۆنا :

سروشت شتی بەكەڵكی بەخشیوە بە ئینسان. مرۆڤ بەزیرەكیو زرەنگی خوڵقاوە، لەبەر ئەوە چارەی سەختی ژیانەكەیكردووە. هەر بەو هۆیەوە (ئیشتەجێ)شی پێكهێناو توانی بەسەرسروشتا زاڵببێ شتی هەرە كۆنی لەبەرد دروستكردووە، پاچی بەردینی گرتووە بەدەستەوە. لەپاشا گەلێك جۆر ئالەتی چاكتری لەو بەردانە پێكهێناوە. لە خۆیەوە پێویستیی تری لێ زیادكردووە، ئەمجا توانی بە كێردی بەردین حەیوان سەر ببڕێت، گۆشت پارە پارە بكات. لە تووكو خوری حەیوان (جلی) عادی دروستبكاو بیكاتە بەر خۆی، بەئالەتی بەردین داری بڕیوەو ڕەگی دەرهێناوەو لە (ئێسك) سووژنی دروستكردووە.

## دۆزینەوەی ئاگرو بەكار هێنانی :

بەدەگمەن لەسەر زەمین ئاگر بەر ئەبێتەوە. زۆر ئەگونجێت لە ڕێكەوتێكی وەهادا ئینسانی كۆن زانیبێتی كە ئاگر هەیە. ئەمجا ئینسان تێگەیشتووە كە شتێكی باشە، تێكۆشاوە هەتا فێر بووە ئاگری كردووەتەوە، وە لەوە زۆر قازانجی دیووە. ئێستا عەشایرە پاشكەوتووەكان دار لە یەك ئەخشێنن ئاگر ئەكەنەوە.. لەدوای فێربوون ئینجا خۆی بە ئاگر گەرم كردووەتەوە، چێشتی پێلێناوە، لەدەوری دانیشتوون، لەم كۆمەڵایەتییانەوە گەلێك شت فێربوون، پێكەوە دانیشتنو قسەكردن ڕێگای بۆ كرایەوە، زمان و قسەكردن پێشكەوت.

### سەرو شوێنی ئادەمیزادی کۆن ( بینە ):

ئینسان لە دەوری بەردی کۆنا زۆر بەسەختی ژیاوە، بەمەینەتەوە تێکۆشاوە تا لەناونەچێت. جگە لەسەرو شوێنە بێفەڕەکەی، درندەی زۆر بەهێزیش دوژمنی بووە، کەرکەدەن، فیلی ماموث، ئەسپی ڕوبار، پۆلە گاکێوی درندە، ورچو شێر، لەدەوری ئەشکەوتەکانا پەلاماری ئینسانیان ئەدا. وا دەرئەکەوت کە ئینسان دەرەقەتی ئەم جانەوەرانە نایەت، کەچی لەسەر ئەوەشا ئادەمیزاد بەهۆی تواناکانیەوە توانی لەناو ئەم کێوییانەدا خۆی بژێنێ بەڵکو بەسەریشیانا زاڵ بێت.

### دەوری بەستەڵەک:

لەم کاتی پرمەینەتی ئینسانەدا سەرزەمینیش تووشی (سەهۆڵ بەندان)بووە، لەدوای سەرمایەکی بێ ئەندازەدا بەفرێکی زۆر باریوە، بووەتە سەهۆڵبەندان. باکووری (ئۆراسیا)ی گرتووەتەوە هەتا (٤٠°) دەرەجە عەرضی شیمالی، وە لە ئەوروپادا هەتا شاخەکانی (ئالپ) هاتووەو ئەمەریکای شیمالیشی داپۆشیوە. ئینسانەکان لەتاوانا بەرەو جونووب ڕایانکردووە، خزاونەتە ناو ئەشکەوتەکانو ئەو جێگایانە کە خواردەمەنییان تیادەسکەوێت. ئەم سەهۆڵبەندانە بۆتە جاروبار، ساڵەهای ساڵ بەفر باریوە، ئەمجا خۆشیکردووەو بەفر کشاوەتەوە. ئەم جۆرە دەورە گەلێک جار تەنانەت دووبارە بووەتەوە، بەهەزاران ساڵ (مەناخ) بەمجۆرە ڕۆیشتووە. لەخۆشییەکانا ئینسانەکان لە ئەشکەوت دەرپەڕیون خۆیان خستووەتە بەر هەوا. کە سەهۆڵبەندان ئەهاتەوە لە ئەفەریقاو خۆر هەلاتی نزیکدا بارانبارین زۆر ئەبوو، تەنانەت لە عەرەبستانو چۆلەکانی ئەفەریقاشا باران زۆر باریوە. لەکاتی سەهۆڵبەندانی ئەروپادا کە خۆشانی دەستی پێئەکرد، لە خۆر هەلاتا دەوری وشکانی پەیدا ئەبوو. ئێمە ئێستا لەدوای دەوری وشکانی خۆرهەلاتی نزیکدا ئەژین.

## هەواڵی کۆمەڵایەتی ئینسان:

لای سەرەوە وتمان ئینسان لەدەوری بەردا زۆر بە شپرزەیی ژیاوە. لە ئەوەڵەوە زۆر کێوی بووە، لەدواییدا بەرە بەرە لە حاڵەتی کۆمەڵایەتیدا روویکردووەتە چاکی، چونکو سروشت توانایداوە بە ئینسان. ئەم دەورەش زۆر درێژ بووە، بە دەهەزاران ساڵی پێچووە هەتا ئێستا. جا ئەو شتو مەکانەی بەجێماوە بەراورد کراوەو بەپێی توانایان جیاکردووەتەوە بەدووبەش:-

١- دەستە شتی هەرە کۆن کە ناقۆڵاو نارێکە، دانراوە بەهی ئینسانی دەوری بەردی هەرەکۆن. ئەو جۆرە ئادەمیزادانە لەناو چووە، بەڵام ئێسکی ناو لەش و کەللەسەریان دۆزیونەتەوە. ئەمە وەها نیشان ئەدات کە لە رەسەنی ئینسانی ئێستانین، بەڵکو بەپێی تەرتیبی لەشیان لە (مەیموون) ئەچن. لەبەر ئەوە بەم بەشی دەوری بەردی کۆنی ئینسانە ئەڵێن: عەصری ئینسانی کۆن..

٢- (نیاندەرتاڵ): لەو جۆرە ئینسانەی کە لەناوچووە بەشێك هەیە (نیاندەرتاڵ)یان پێ ئەڵێن بەناوی جێگا دۆزراوەکەیەوە. هەوەڵ کەرەت لە (ئەڵمانیا) ناونراوەو لەپاشان (فەلەستین)و لەئەشکەوتەکانی (زەرزی)و لە (هەزار مێرد)یش لە (سولەیمانی) نیشانەیان دۆزراوەتەوە. هی ئەم نیاندەرتاڵانە دەرکەوتووە کە لەم جێگایانەشا ژیاون. بەڵام بەشی دووەم لە دەوری بەردی کۆن، لەوێدا ئینسان خۆی پێشخستووە، ئالاتو شتە بەردینەکانی جوان رێکوپێك کردووەو لە جاران زۆر چاکتر دروستیکردوون و شتی تریشی خستووەتە سەر لە ئێسك و لە دار، وەکو: دەرزیو سووژن و دارەسمە (مثقب)و دەسك وپاچ و بێڵ و نەخش و نیگارو وێنەکردن فێر بوون. لە ئەشکەوتەکانا کە پەناگای ئینسانی ئەوکاتە بووە، رەسمو نەخشی رەنگاورەنگیانکردووە، لەمانە زۆر دۆزراوەتەوە کە هونەری ئینسانی ئەو کاتە نیشانئەدا زۆرتر رەسمی ئەو حەیواناتە کراوە کە راویانکردوون و گۆشتەکەیان خواردوون. لەم چەرخەدا ئینسان هەندێك (بیرو باوەڕ)ی پەیداکردووە، لەرەسمەکانا ئەم تەرحە ئەبینرێت، وەها دیارە سەرەتای (ئایین) لێرەوە دەسپێ ئەکات. وە هەروەها لەم دەورەدا (متو مورووو)و (شانە) پەیدابووە، لەگەڵ شتەکانی لای سەرەوەدا ئەمانەش دۆزراونەتەوە. لە چەرخی بەردی کۆندا گەلێك جۆر ئینسان پەیدابووە کە لەگەڵ ئینسانەکانی پێشوتر جیاواز بووە، چونکو زۆرتر دێتە

سەر ئینسانەکانی ئێستا. هەندێ زانا ئەڵێن ئەمانە لە خۆمانن. لەبەر ئەوە ئەم چەرخە لە دەوری بەردی کۆن ناونراوە (دەوری ئینسانی تازە) وە یا ئینسانی فامیدە. بەوە جیاکراوەتەوە لە ئینسانی عەصری یەکەم.

## دەوری بەردی تازە:

لەوەو پێش وتمان ئەوی (دەوری بەردی کۆن) جیانەکاتەوە ئەوەیە کە ئینسانی ئەو حەلە بەسەر زەمیندا گەڕاوە خواردەمەنی پەیداکردووە، چونکو هێشتا هیچی نەبووەو نەزانیوە، واتە ڕاوکەر بووە. بەڵام لە ئاخریو ئۆخری دەورەکەدا بەسایەی دروستکردنی هەندێك شتو مەکەوە حاڵی ئینسان لە بناغەوە گۆڕراوە، چونکو ئیتر شتی بەدەستی خۆی ئەکرد، بۆیە ناونراوە (دەوری بەردی تازە)، لەمەولا زەوی بەئالەتی بەردین کێڵاوە، کشتوکاڵ فێربووە، بەکۆمەڵ بەرهەمی زەویەکەی هەڵگرتووە، ئاژاڵو باڵندەی ماڵیکردووە، خانوو بەرەی پێکەوە ناوە، بەدیار دەغڵەکەیەوە دائەنیشت. لەمانەوە دێهات پەیدابووە. دوابەدوای ئەمە ئینجا ئینسانەکان خوێندنو نوسینیان دۆزییەوەو چوونە ناو سنووری (دەوری مێژوو)ەوە.

## کوردستان کوێیە؟

هەموومان ئەیزانین لەناو میللەتانا واباوە کە ئەو جێگاو شوێنەی قەومێکی تیا دانیشتبێ بە (نیشتمان – وطن)دائەنرێ بۆ ئەو نەتەوەیەو بەناوی ئەوەوە ناو ئەنرێ وەکو ئێمە بەزمانی خۆمان بەوڵاتی (عەرەب) ئەڵێن (عەرەبستان) و بەهی (تورك) ئەڵێن (تورکستان). ئەمە وایەو چ سڵەمینەوەیەکی تیا نییە، چونکە شتێکە بۆ هەموان ڕەنگی وا ڕێژراوەو براوەتەوە.

## وتاری تەئریخی:

لە تەئریخی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیکا مێژوو نووسەکانو گەلێك زانای ئاسەوار لەگەڵ ڕۆژهەڵاتیوانەکان لە بابەت کوردو کوردستانەوە زۆرجار دواونو لە مەیانی مێژوودا لە نووسینەکانیانا لەگەڵێك جێگادا نزیك بەناوەکانی

نیستای ناوی کوردیانبردووه وەکو: لە دەورو پشتی سەدەی حەوتەمو شەشەمی (پ.م)دا بە هەندێ نەتەوەی کوردستانیان وتووه (کوردۆ) وە یا بە (کاردا)، (کوردۆنەن) وە یا هەندێك ناوی تر کە لەمانە بچێ ناویان ناون و لەدوو لەوحەی کۆنی دوو هەزار ساڵی پێش میلاددا لە شوێنێکی کوردستانا نووسراو هەیە باسیولاتێك ئەکا کە پێی وتراوە (کارداکا) وە لە دوای ئاسووریدا هەر لەسەمتی ئەو ولاتانەدا کە والای سەرەوە ناوی برا لەشکری ئاسوور لەگەڵ قەومی (کورتی - گۆتی) ناوا جەنگیوە. بەمانەدا وا دیارە ئەم جۆرە ناوانە لە دەمێکەوە لە کوردستانا بووە. هەر کەسێك بەچاوی زانیاری لەم ناوانە ورد بێتەوە بێ خۆگرتن ئەڵێت ئەمانە یەك ناونو هەمووشیان لەگەڵ وشەی (کورد)دا لەسەر چاوەیەکەوە هەڵقوڵاون[٢]. جا ولاتەکانی لای سەروو کە میللەتەکانیان ناونووسکراون، ئەمانە کە لای خوارەوە ناوەکانیان بە کورتی ئەنوسین: (دیاربەکر، بتلیس، مووش، وان، بۆتان، حەکاری، شەمدینان، سەرد، مەلازگرد، مەلاتیە، خەرپوت، دێرسیم، ئەرزنجان، کەماخ، قارس، نووسیبین)و گەلێ ناوی تری ئێستایە کەوا ئیمڕۆش نەتەوەی کوردی تیا دانیشتووە. زانایانی ئاثارو مێژووزانو موستەشریقینی ڕۆژئاوا هەموو لەو بیرەدان کە ئەو نەتەوە کۆنانە ڕەگەزو نەژادی کوردەکانی ئیمڕۆن کەوا ئێستا لەو ولاتانەدا دانیشتوون. لەبەر ئەوە ئەم ولاتانە بەبێگومان بە (کوردستان) ئەژمێردرێن[٣].
بەڕاستی ئەگەر ئیمڕۆ ئێمە بچینە شوێنەکانی لای سەروو کەوا قەڵەمڕەوی

---

[٢] مێژووی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ جەڵدی یەکەم.

[٣] ئەتڵەسی تەئریخی عموومیو عوسمانی کە لە چاپخانەی مەکتەبی حەربیەی ئەستانبووڵ لەچاپدراوە لە (١٩١١م ١٣٢٩هـ). لە زەمەنی حکومەتی عوسمانیدا لە خەریتەکانا (کوردستان) زۆر نووسراوە، حاشای لێ ناکرێت.

جمهووریەتی (تورکیا)یەو پێیا بگەڕێین، کەژوکێو، دۆڵو دەشت، ئەشکەوتو قەراغ زێو چەمو شیوەکانی بپشکنین، ئەبینین لە دێهاتیا زوربەی دانیشتووی ئەو وڵاتانە، سەدی حەفتا (٧٠٪) کورد زمانەو خۆیان ئەڵێن ئێمە کوردینو، باوكو باپیرەشمان کورد بووە. خەڵکی شارەکانیش بەکوردی قسە ئەکەن و تورکیش ئەزانن. لەگەڵێ جێو شوێندا خەڵك هێشتا لەسەر ڕەوشتوخووی عەشرەتی جاران ئەژی، ئەریتی خێڵایەتییان هێشتا ماوە وەك لە (ئەخشە) قەومییە مێژوویەکەی ئەمین زەکی بەگدا ئەبینین، واتە خەریتە تەئریخییە گشتییەکەی ئەمین زەکی بەگ. ئەمانە لە وڵاتەکانی ڕۆژ هەڵاتی (ئەنادۆڵ)دا هەتا پاڵ ئەدا بە (ئەسکەندەروونە)و (ئەدەنە) (مەلاتیە)و (ئەگین)و (سیواس)ەوە سەرتاپا خوار لەو زەویو زارانەدا دانیشتوون.

ئەم وڵاتانە لەڕۆژهەڵاتەوە خۆی ئەدا لەسەر چاوەی چەمی (بەشیل ئێرماق)و بانی (ئەرزڕۆم)و شاری (قارس)و لەسەمتی لای جەنووبا تاسەر سنووری (تورکیا)و (سوریە) دێن کە لەوێدا (کورد)و (تورك)و (عەرەب) ناوێتەی یەکبوونو لەناوچەی (جزیرە)دا ئەهالی هەمووی ئەبێت بەکورد. بەدرێژایی سنوری عێراق تورکیا خێڵاتو عەشایرو ئەهالی دێهاتو شارستانی گشتی کوردە، وە لە ڕۆژهەڵاتا لە سنووری ئێراندا بەپتەوی لە هەردوو دیوی سنوورەکەدا (عێلو خێڵاتی کورد) دانیشتووی دێهات و شارو شارۆچکەکانە. ئەم هەموو (زەویو زاری کوردستانی تورکیا)یە ئیمڕۆ ئیدارەتەن تورکەکان کردوویانە بە ١٩ بەشەوە بەهەریەکە ئەیەژن (ویلایەت)و هەریەکە (والی)یەکی خراوەتە سەر، ئەمانە ئیشوکاری وڵاتەکە ئەگێڕن، بە ئیدارە لە لیواکانی عێراق ئەچنو ناوەکانیان ئەمانەیە: (جولە مێرگ. وان. بایەزید. قارس. ئەرزڕوم. بتلیس. سعرد. ماردێن. دیاربەکر. (ئامەد). ئۆرفە. عەین تاب. مەلاتیە. عەزیز. ئەزرنجان. گمووش خانە. قەرە حەساری شەرق. سیواس. مەرعەش. عوسمانییە). لە مانەدا: لە سیواسو قەرە حەسارو گمووش خانەدا

کوردو تورك تێکەڵاوە. لەوانی ترا زوربەی دانیشتوان کوردەکانە. جا ئەم شوێنانە گشتی بەسەر یەکەوەیە، هەمووی (کوردستانی تورکیا)یە. بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا بەلای جەنووبا هەر لە دەوامدایە، بەڵام ئەم پارچەیە ئیدارەتەن بەشی (عێراق)و نیشتمانی کوردە. ئینجا ئەم بەشەش (کوردستانی عێراق) وەختە بڵێم دانیشتوانی ئەم کوردستانە گشتی (کورد)ە. لێرەدا کوردەکان بە (پەیمانی برایەتی) لەگەڵ (عەرەب)ی عێراقدا کە لە کوردەکان گەلێك زۆرترن پێکەوە ئەژین. ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیاش و عێراقیش شاخەکانی (زاغرۆس) بەربەستیکردوون. ڕۆژهەڵاتی ئەم زاغرۆسانە بانی (ئێران)ەو ئێران داگیریکردووە، حوکمی ئەکا، بۆتە (کوردستانی سێهەم)، هەرچەندە ئەم سەرزەمینانە بەهەردوو دیوا ئەرزو ئینسانی چونیەکە بۆ ئەوە ناشێت بەشبکرێت. بەڵام ئێرانەکان کردوویانە! لە (سوریە) شا بەدەم کوردستانی عێراق و کوردستانی تورکیاوە هەندێك (کورد) دانیشتووەو لەناو وڵاتەکەشا هەندێك پەرِاگەندە بووە، بەڵام ناگونجێ بیکەین بە (کوردستانی چوارەم)، واتە ئەقەلیاتە[1].

## باسی جوغرافی کوردستان و نەتەوەکانی

ئەوی تەماشای نەخشەی ئەم کتێبە ئەکاو بۆ تاقیکردنەوە ئەچێت و بەوڵاتەکانا ئەگەڕێ، ئەبینێت پاڵ بە پاڵی جمهوریەتی تورك، لەوڵاتەکانی عێراق و ئێرانیشا میللەتی (کورد) دانیشتووە، بە شێوەو زمان و ئاینوخوێنو پیشە گشتی وەك یەك وەهایە. با لەهجەو زمانەکەیان چونیەکیش نەبێت، کە ڕوانیتە بناغەی زمانەکەیان، ئەبینین کە جیاوازییان وەك جیاوازیی زمانی عەرەبی (یەمەن)و عەرەبی (عێراق) وە یا تورکی (ئەستەمبوڵ)و تورکی

---

[1] تەماشای نەخشە (خریطه) تەئریخەکان بکەن کە بۆ ئەم کتێبە دروست کراوە.

(ئەنادۆڵ ) وایە. ئەم ڕەونــدە (سیاح)یـە کـە تەماشـای ئەخشەکان ئـەکاتو لـە شوێنی لەیەك دانی سنووری تورکو ئەرمەنی ئێرانـەوە کـە چیـای (ئـارارات)ە دەس ئەکا بە ڕۆیشتن ئـەبینیت ناوچەی ڕۆژاوای کیشوەرە گەورەکـەی ئـێران هەتاسـەر (خـەلیجی فارس) گشتی کورد زمـان تیـا دانیشـتووە، هـەر لـە ڕۆژ هەلاتی (عەمارە)و (بەسرە) لەسنوورەکانا عەرەبو کورد تێکەلاوە. بـە کورتـی ئیستیعمار ڕاینەگرت و ڕۆژاوای ئێران گشتی بەکوردستان ئەژمێررا...

## ئینجا ولاتی ناوداری کوردستانی ئێرانیش ئەمانەن:

لە شیمالی ئێرانەوە: (ماکۆ. خـووی. سـەلماس. دیلمـان. میان دواو. مـەهاباد. شـنۆ. لاهیجـان. موکریـان. سـەقز. ئـەردەلان. کرماشـان. ئـەهاوەند. سووسـتەر. لوڕستانەکان هەمووی بە بەختیارییەوەو لە تـوررەی خـەلیجی فـارس و کـارۆدا ولاتی لەکو زەندو فەیلی) هـەمووی کوردە. بێجگە لەمانـە بەشـێکی (ورمێـە) هەتا زەنگانو لای ئازەربایجانی ئێرانو لەناوچەی (خوراسان)و (مازیندەران)و (هەمەدان)یشا ئەفقەلیاتی کورد هەیـە. وە لـە شیمالی گـەرووی (هورمـوز)یشدا ناوچەیەك هەیـە بەزوربەی کوردی تیایـەو لـەناو ئەمانـەدا عێلێکی گــەورەو ناودار هەیە (شوانکارە)ی نـاوە. لـە (سسـتان) و (کرمـان)یشدا کورد هەیـە. لـە ئێرانا کورد (تەهجیر) کراوە وەك لە تورکیاشا دیسان وەهایان لـێکردوون، بۆیــە ئەمودندە بلاو بوونەوە. بێنەوە سەر کوردی (عـێراق). ڕەوەنـد (سیاح)ەکـەمان کە بەناوچەکانی عیراقا گەڕا ئەبینێت شمالو شیمالی شەرەقی عـیراق هـەمووی کورد زمانی تیا دانیشتووە لە ڕۆژاوای (موسڵ )دا توررەی (سنجار)و لە شیمالدا قـەضاکانی لیـوای (موسـڵ ) گشـتیو زوربـەی خــەڵکی لیواکـانی (هــەولێر)و (کـەرکووك)و هـەموو دانیشـتوانی لیـوای (سـولەیمانی)و ناوچـەی (خانـەقین) و (مـەندەلی) ئـەتـەوەی کـوردن. ڕۆژهـەلاتی لیواکـانی (کـوت)و (عـەمارە) کۆمــەڵ کۆمـەڵ کوردی تیایـە. بـە کورتـی، لـە بـەینی کـوردو عـەرەبدا ڕیـزە شـاخی حەمرین سنوور دروست ئەکا. ئەمە بەپێی شـیمال و جـەنووب. وە بـەپێی ڕۆژ

هەڵاتو ڕۆژاواش لە لیوای کەرکووكو هەولێرا (ڕووباری دیجلـە) بۆتـە سنوور، واتە لەم دوو لیوایەدا کوردو عـەرەب لەسەر دیجلە بە تێکەڵاوی دانیشتووە، ئینجا شاروشارۆچکە ناودارەکانی کوردی عیراقیش ئەمانەن: (زاخۆ. عەمادیە. دهۆك. ئاکرێ. زێبار. سنجار. هەولێر. ڕەواندز. کۆیە. مەخمور. کەرکووك. چەمچەماڵ. گل. شیروانە. سولەیمانی. قەڵادزە. هەڵەبجە. خانەقین. قەرەغان. مەندەلی). بێجگە لەو وڵاتانەی لای سەروو کە باسکران کەم تا پێش (ئەقەلیات)ی کوردی کەش هەیە لە جێگاکانی ترا دانیشتووە وەکو لە جمهوریەتەکانی سوڤیاتی قافقاز واتە لە جمهوریەتی (ئەریوان)ی ئەرمەنیو جمهوریەتی ئازربایجان لە دەوری (جوان شیر، ئاراس، ئاراش) گەلێك تیرەو کۆماری کورد هەیە بە ئازادیو سەربەستی ئەژینو بەزمانی کوردی بە نووسینی لاتینی لە قوتابخانەی میللی خۆیانا ئەخوێنن. لە گورجستانیشا دیسان هەندێك کورد دانیشتووە. لەدوای (شۆڕشی دیرسم) لە تورکیا، تورکەکان ڕەنگە ملیۆنێك زیاتر کوردیان (تەهجیر) پێکردبێ. لە وڵاتەکانی ڕۆژاوای تورکیادا ئەمانەیان بڵاوکردوونەتەوە، تەنانەت نایەڵن بەزمانی کوردی قسە بکەن! لە بلووجستانا هەندێك تیرە کورد هەن (برا خوویی) یان پێ ئەڵێن لە ناوچەی (کیلات)دا شوێنێکی گەورەیانکردووە بە نیشتمانی خۆیانو تیا دانیشتوون. ئەمانە لە شیمالا چوونەتە (ئەفغان)ەوە، وە لە ڕۆژهەڵاتیشەوە چوونەتە هیندوستانەوە. زمانیان وێنەیەکە (کوردی) و (بلووجی) تێکەڵاوە. بێجگە لەمە لە ڕۆژاوای (هێرات) لە شیمالی ئەفغانیشا کۆمەڵێك کورد زمان هەیە. بێینەوە سەر کوردی (سوریە): لەکاتی ڕابوردوودا تیرەو تایەفەی کورد ڕوویان کردووەتە سوریەو لە کوردستانی تورکیاشەوە بۆی کشاونو ئێستا پۆل پۆل لە هەندێك شوێنی سوریەدا ئارام گربوونو بوون بە نیشتەنی ئەوێ. لەناوچەی (ئەسکەندروون)و (ئەنتاکیە)دا گەلێك کورد هەیە کە ئەمجارە فەرانسەکان وڵاتەکەیان بەخشین بە تورکیا. لە (ئەلجەزیرە)و لە دەوری (حەڵەب)و لە شیمالو ڕۆژاوای (حەما)و. بەینی (حومص) و (تەرابلووسی شام)

و لەناوچەی (حارم)دا نەقەلیاتی کورد دانیشتووەو، لە شاری (دیمەشق)دا گەڕەکی (صالحیە) هەمووی کوردە. ئەگەر تەماشای مێژووەکەی (ئەمین زەکی بەگ) بکەین لە جەلدی یەکەم و جزمی یەکەمیا ئەبینین لە بابەت حالەتی جوغرافیایی ئێستای نەتەوەی کوردو لە بارەی ژمارەی نفوس و بەیانی جێگاو شوێنیانەوە ئەم پیاوە بیر بەرزە زۆر وردبوومتەوەو بیرو هونەری زانیارانەی بەکارهێناوەو تا ئێستا لە کوردا کەس بە جۆری ئەو هەوڵی نەداوە.

لەبەر ئەو تالأوەی کە تورکیا دەرخواردی کوردەکانی ئەداو لەبەر ئەو دارو فەلاقەیەی تورکیا بۆکوردەکانی داناوەو بە ئاگرو ئاسن لەگەڵیانا ئەجووڵێتەوە، ژمارەی کوردی تورکیا ڕوو لە زۆر بوون و پەرەسەندن نییە. لەوێدا تورکەکان بە بیروباوەڕێکی سیاسی دروستو نیشانکراوی خۆیانەوە ئەیانەوێ نەتەوەی کورد بە زۆری لەناوبەرنو بیانتوێننەوەو بیانکەن بە ((تورك)). هەروەها لە ئێرانیشا بیرێکی وەها هەیە ئەیانەوێ کوردەکانی ئێران بە زۆر یا بەخواهیشت بکەن بە ((فورس)). ئینجا سەرگرتنی ئەمجۆرە کردەوەو بیرو خەیاڵە لەم سەدەی بیستەمینی پڕ سیاسەت و وریاییەدا ئەگونجێ یان نا، ئەوە دیارو نومایان نییە، بەڵکو لە مابەینی هەراو هوریای جیهانا لەمەولا ئەمەش ساغ ئەبێتەوە. ئینجا لەدوای ئەو موتالأ تەنریخییانە ئەچینەوە سەر باسەکەی ئەمین زەکی بەگ کە بەم بۆنەیەوە لە بابەت نفووسی تەخمینی کوردستانەکانەوە وتوویەتی، بۆ ئەوەی باسی جوغرافیەکەی بەدەستمانەوەیە تەواو بکەین. بەسەر دەرچوونی مێژووی ئەمین زەکی بەگدا سی - چل سالێك ڕابووردووە، زانستی ئەو کاتەو ئێستا زۆر فەرقی هەیە، نفووسی زۆر زیادیکردوە. ئێمەش قایمەی نفووسی وڵاتەکانمان بەپێی تەخمینی ئێستاکردووە کە ئەوەتە لای خواردوە نوسیومانە:

| وڵات | ژمارەی نفووسی |
| --- | --- |
| کوردی ئێران | ۲۷۵۰۰۰۰ |
| کوردی تورکیا | ۳۰۰۰۰۰۰ |
| کوردی عێراق | ۱۷۵۰۰۰۰ |
| کوردی سوریە | ۲۵۰۰۰۰ |
| کوردی ڕووسیە | ۱۳۰۰۰۰ |
| ئەفغان، بلووچ، هیند، پاکستان | ۳۰۰۰۰۰ |
| **کۆی گشتی:** | **۸۱۸۰۰۰۰** |

**هەڵکەوتنی سروشتیی مەڵبەندی کوردستانو، تەئثیرکردنی لە گیانی کوردا:**

پێویست نییە لێرەدا لەسەر باسی چۆنیەتی زەویو زاری کوردستان دوورو درێژ قسە بکرێ، چونکو لەوە زیاتر بێت ئەبێ لە جوغرافیادا بنوسرێت. ئەوانەی شارەزای عیلمی نهۆم (طبقات)ی ئەرزن ئەزانن کە ئەم سەرزەمینە کوتووپڕ دیمەن (شکل)ی ئێستای وەرنەگرتووە، بەڵکو لەدوای ملیۆنەها ساڵو جۆرەها گۆڕێنو بەسەرهات ئینجا لەسەر حاڵەتی ئێستای بۆتەوە، گەلێ ئەمارەی هەیە زۆرجار ژێر دەریای دیوە کە ئێستا وا ئەزانرێ ئەوەتەی خوا دنیای داناوە هەر بەدەرەوە بووە. ئەگەر بڕوانینە ئەخشەی ڕۆژاوای (ئاسیای نزیک) ئەبینین لەوێدا کیشوەری (ئێران)و شوبهی جەزیرەی عەرەبستان و وڵاتی (تورکیا) لە هەیئەی سێیانی بەرزی پڕ کە زو کێوا یەکانگیرن. کە باش لە ئەخشە ورد بووینەوە ئەبینین وڵاتی کوردستان ئەو شوێنانەیە کە لە مابەینی ئەم سێ کیشیوەرەدا پێکەوەنوساوەو شوێنی هەرە بەرزو سەختی ئەم سێ بانەیە. وا زانراوە کەلە سەرەتای پێکهاتنو گۆڕانی دەوری چواردەمی دروستبوون و پێکهاتنی زەمیندا ئەم سێ بانە تێکومەکان چووە لەگەڵ

دەریاکانی دەوروپشتیا. ئەم ئەرازییانە بە کەژو هەردو دۆڵ و بانەکانی ئێستایانەوە ئەو حەلە پەیدا بووەو روخساری ئێستای وەرگرتووە ڕەنگە (تۆفان)یش هەر ئەوسا پەیدا بووبێت. ڕۆژاوای بانی ئێران بەڕیزە شاخی بڵند بەربەستبووە. لە مێژوودا ئەم کێوانە (زاگرۆس)ی ناوە کە ئێستا پێی ئەڵێن ڕیزە شاخی کوردستان. حاڵی حازر (خەت)ی بالآی ئەم کێوانە لە مابەینی (ئێران – تورکیا- عیراق)دا بووەتە سنور بەبێ گیروگرفت لە مابەینی سێ لا لەناو پایەو دۆڵی ئەم کەژو کێوە بەرزانەدا ئێستا نەتەوەی (کورد) دانیشتووەو، لە پێش تەئریخەوە لەوێدا گیریانخواردووەو کردوویانە بە نیشتمان (وطن). بەدرێژایی سنووری ئێران‌و تورك بە دیوی ڕۆژاوادا کە موڵکی تورکیایە ئەرازی دیسان (بان)ە، بەڵام بانێکی بەرزو بە کێوی بڵندو دۆڵی قووڵی پەلپەلبووی ئەوتۆیە کەمێجگار نارەحەتەو مەڵبەندێکی سەختەو هەتا پاڵ ئەدا بە بانی (ئەنادۆڵ )ەوە، ئەم بانە بەم سەختییە ئەکشێت. ڕووباری (دیجلە)و (فورات)و قۆڵەکانیان لەگەڵ زابی گەورە کە بە (بادینان) ناوبانگدارە لە ناوڕێژی ئەم بانانە پەیدا بوون. دێهات و شار و ناوایی (کوردەکان) لە گوێ ئەم ئاوانەو لەناو کەژو دۆڵەکانا دروستبوون. تێکڕا بە گشتی ئەڵێن بانی (کوردستانی تورکیا). لەمێژوودا هەرچەندە ئەم بانە بەپێی جێگا گەلێك ناوی جیاجیابووە، بەڵام مێژونوسەکان دیسان لەسەر (زاگرۆسەکان) حیسابیان کردوون و لە هەندێك شوێنیشا بەشی لای ڕۆژاوایان بە (ئانتی تەورووس) ناو ناوە، ئینجا ئەم بانە بەرزە بەڕیزە کێوی (تەورووس) تەواو ئەبێ و لەوێدا ئەنووسێت بە بانی (ئەنادۆڵ )ەوە. لە بەشی عێراقدا سەرزەمینی کوردستانی عێراق کەوتووەتە ژورووی وڵاتی عێراقەوە. جا سنووری تورك وعێراق لەوێدا دروستکراودو خاکی کوردستانی عێراق لەڕووی جۆری پێکهاتنەوە هەر پاشماوەی خاکی کوردستانەکەی تورکیایەو کوتومت لەو ئەچێ. بەڵام هەر ئەوەندە هەیە ئەوەندەی ئەو سەخت نییەو لەلای ڕۆژاوایشەوە (پێدەشت)ی زۆرە. ئەم دوو

پارچە کوردستانە لە ڕۆژهەلاتیشەوە نووساوە بە سنووری ئێرانەوە. بەمە پارچەی سێهەمی کوردستان یەتە کایەوە. ئا بەمجۆرە (ئیمپریالیزم) لە پێناوی قازانج‌و سوودی خۆیا خاکی نازداری میللەتێك کوت کوت ئەکات‌و ئەیکات بە سێ بەشەوە، چونکە کە هاتە سەر سوودی خۆی گوێ ناداتە هیچ شتێکی تر.

### بێینەوە سەر دیمەنی بەشی لای ئێران:

ئەمیش بە سروشت (تەبیعەت) بەرزو شاخستانە. ئەوەندە هەیە ئەم بەشە وەك کوردستانەکەی تورکیا سەخت‌و کوورو کەم رزق نییە، بەڵکو ڕیزە شاخی (زاغرۆس) کە سنووری ڕۆژاوای ئێرانەو موورگەی پشتی کوردستانە. بەرزایی بەدیوی ئێرانا زۆر دا ئەکەوێتەوە بگرە لەدوای هەندێك پەل‌و تیرە شاخ‌و دۆڵ‌و نزار لەگەلێك شوێنا ئەبێتە پێ دەشت. ئاوی چیا بەرزەکان کە لە دۆڵەکان دەرچوون لەم دەشت‌و بانە بەرزە نەرمانەدا بۆ ئەهالی ئەبێتە پیت و بەرەکەت. بۆیە سەر زەمینەکانی کوردستانی ئێران، ئەگەر شۆڕش‌و هەڵای ناوخۆ بیەڵێت، بەباخ‌و بێستان‌و گوڵ‌و لالەزاری کوێستانان و فەلاحەت‌و کشتوکاڵ ئەبێتە بەهەشتی دنیا. لەسەر ئەوەشا شوێنی سەخت‌و نالەباریشی زۆر هەیە وەك لە ولاتی (هەورامان)و توورەی (کرماشان)و لوڕستان و پشت کێودا ئەبینرێت. زابی بچووك‌و ڕووباری سیروان (دیالە)و (ئەلوەند) و (کەرخا)و گەلێك چەمی تر، لەم بانانەدا ئەبن‌و ئەڕۆنو ئەرژێنە (دیجلە)وە. بەکورتی ماوەی کوردستان لەلایەکەوە لە شاخی (ئارارات)ەوە دەست پێ ئەکا تا ئەگاتە ڕیزە شاخی (حەمرین) – قەشقە. لە عێراقا، کە ئەمە شوێنی هەرە پانی کوردستانە نزیکەی ٢٠٠ میل پانە. شوێنی هەرە درێژیشی لە تورکیا لە ولاتی (مەلاتیە)و (کەماخ)ەوە دەست پێ ئەکا بەسەر ڕۆژهەلاتی کوردستانی عێراقدا ئەڕواتو ئەچێتە کوردستانی ئێرانەوە، لەوێ هەموو لوڕستان‌و کێوو کەژی بەختیاری ئەگرێتە ناو خۆی‌و بەسەر ڕووباری (کارۆن)دا ئەچێتە سەر

(خەلیجی فارس)و لەوێ ئەبڕێتەوە کە پێوانەی ئەم درێژییەش نزیکی ٨١٠ میل ئەگرێتەوە. جا هەڵکەوتی خاکی کوردستان خواکرد بەمجۆرە وڵاتێکی سەختو نالەبارە، ئەرك ئەخاتە گیانی دانیشتووەکانیەوە، سەختیو بێ ڕێگاو بانیی ئەیهێشتووە ئەم دانیشتووانە بنووسێت پێکەوە، بەڵکو کردوونی بە دوژمنی یەكو بەتەبیعەت بوون بەشەڕانیخواز. وڵاتی سەخت ڕزقی کەم و کووڕە، ئەهالییەکەی هەژارو بێ تاوانە. ئەم حاڵەتانە بەئەنجام دوو تەئثیری گیانداری لەژیان و چارەنووسی کورداخولقاندووە. یەکێکیان ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی وڵاتەکەیان سەختبووە کوردەکان لەناو دۆڵو مێرگو نزاریا بە ناچاری کۆمەڵیوردو دێهاتی بچووكو گەورەیان پێکەوە ناوەو تیا ژیاون، وردە تیرەی نازاو بەجەرگو بەتاقەت لەناویانا پەیدابووە، هۆگری سەربەخۆیی ناوچەیی بوون، پەکی ئەوەیان کەوتووە کە بتوانن کۆمەڵی زلو دەوڵەتێ پێکەوە بنێن کە بچنە ژێر حوکمی ماقووڵانی یەکترییەوە، بەڵکو بە پێچەوانەی یەکگرتن بە درێژایی مێژوو دەستیان بۆسەریەکتر درێژکردووەو چون بەگژ یەکترا. بیری سوودی گشتی یەکتریان نەماوەو لە وڵاتەکەیانا بەنەفامو نەزان ماونەتەوە.. ئەیانتوانیوە خزمەتی خۆیان و نیشتمانەکەیان بکەن، لەبەر ئەوە گەلێك جار تووشی هێرشی جیهانگیرانەی نەتەوە گەورەکان بوون و تیا چوون. لەدوای ئەم جۆرە مەینەتییە گەورانە ئینجا دەستیانکردووە بەخەبات بۆ ڕزگاربوون.

دووەم تەئثیریش ئەوەیە کە بێڕێگاوبانییو سەختیی وڵاتەکە ئەیهێشتووە ئەقوامی گەورەی هێزدار لەوێدا بحەوێتەوە، بەڵکو ئەوانەی کە بەتەمای داگیرکردنیبوون ئەیانتوانیوە ئارامی تیا بگرن، چونکو لەلایەکەوە لە بەرە فەقیریو کەم ڕزقی وڵاتەکە لەشکرەکەیان بۆ بەخێو ئەکراوەو، لەلایەکی تردوە ئەهالییەکەش لێیان کەوتوونەتە کەژەکان، شەوو ڕۆژ پەلاماریانداونو شپرزەیانکردوون. جا لەبەر ئەمانە جیهانگیرەکان هەر ئەوەندەیان توانیوە کە بەوڵاتەکەدا بڕۆنو بۆیان نەگونجاوە تێیدا بمێننەوە. کەواتە سەختییو کووڕی

ولآت لێرەدا بۆ کوردەکان بەخێر گەڕاوە، ئازادیو سەربەخۆییە ئاتەواودکەیان بە درێژایی زەمان بەپارێزراوی بۆ ماوەتــەوە. ئینجا بەهۆی ئـەم هەلکەوتنو سروشتی نیشتمانە میللەتی (کورد) بەدرێژایی مێژوو، لەژێر باری ئەو دوو ماددەیەی سەرەوەدا ئەیانتوانیوە تەکانێك بدەنو خۆیان بترازێنن. زۆر داخێکی گرانە لەجگەردا ئەم قەومە ساڵەهای ساڵ ئـەیانتوانیوە لـە چوارچێوەی ئـەو دەستوورە خۆیان قوتار بکەنو ئەو قاوغە بشکێننو لێی بچنەدەرەوە.

## ئاوو هەوای کوردستان

ولآتی کوردستان بەدیمەن لە شیمالی ڕۆژاواوە بۆ جەنووبی ڕۆژهەلآت درێژاو درێژو هەلکەوتووە. لەلایەکەوە سەری بردوە بۆلای دەریای سپی ناوەڕاستو لەو سەریشەوە ڕوویکردووەتە (خەلیجی فارس). وەکو سروشت (طبیعت) ویستبێتی واجب بەجێبێنێت، ولآتەکە بگەیەنێتە گوێ بەحر، کەچی داخی گرانم بە پێچەوانەی ئەم سەودای سروشتییەی دانیشتووانی ولآت چونکە بێکارە بوون بەشە واجبی خۆیان نەهێنا، وە پێویستییەکە بە ئاتەواوی مایەوە. وەکو لەسەرەوە وترا کوردستان درێژکۆلە هەلکەوتوودو بەشی زۆری کەوتووەتە تورکیاوە. لە ڕۆژاوای (کەماخ)ەوە بەسەر (بیتلیس - عیمادیە- سولەیمانی- کرماشان- دیزفوول)دا تاسەر (بەحری فارس)و نزیك (بەندەر بووشەر) کە ئەو پەڕی کوردستانە خەتێك تەسەور بکرێ هەشت صەدوو دە (٨١٠) میل واتە (١٤٥٠ کیلۆمەتر) درێژایی ئەگرێتەوە بەلآم پانتایی کوردستان بەمجۆرە فراوانە نییە، بەلکو لە شوێنی هەرمپانیا کە مابەینی (موسلّ – فارس و بایەزید)ە نزیکەی ٢٠٠ سێسەد میل واتە (٥٠٠) کیلۆمەترمیە کە، تێکڕای پانایی لە (١٧٠ وە تا ٤٠٠) کیلۆمەتر پانی ئەگرێتەوە. ولآتی کورد کەوتووەتە بەینی ٣٠ - ٤٠ دەرەجە عەرەضی شیمالییەوە واتە لە خوارەوە بۆ ژووروو، وە لە ڕۆژ هەلاتەوە تا ڕۆژاوا کەوتووەتە ناوەندی (٣٧° تا ٥٠°)

دەرەجەی طوولەوەجا بەمجۆرە کوردستان ولاتێکی زۆر گەوردو ڕاکشاوە، بۆیە ئاوو هەوای ڕگشت لایەکی چون یەك نییە. لای جەنووبی لەلای شیمالی گەرمترە، لەسەر ئەوەشا بۆ ئەوەی تەعریفێکی زۆر نزیك بەڕاست بۆ ئاوو هەوای کوردستان بکەین، ئەبێت هەڵکەوتنی تەبیعەتی (سروشتی)ی سەرزەمینەکە بخەینە بەرچاو. مادام کوردستان کەم و زۆر هەمووی کەژو کێوو شاخە، بەپێی قانوونی طەبیعی کە خوا بۆ کەژو کێوی داناوە، ولاتەکە لە زستانا (سارد)و لە هاوینا فێنكو خۆشە. تێکڕا لەسەر نیظامی ئاوو هەوای بەحری سپی ئاوەڕاست ئەڕوات.زستانانو نیوەی پایزو بەهار بارانی لێئەبارێت. هاوینان وشکەڕۆکە، بارانەکەی بۆ هەموو بابەتە کشتوکاڵێکی مەنطیقەی موعتەدیلە بەش ئەکا، کشتوکاڵی زستانە بە ئاو بارانەو، هی هاوینە لەسەر ئاوداشتە. لەدەوری (زێ)و چەمو شیوەکانی کوردستانا دەشتو (ڕەن)و کێڵگەی بە بەرەکەت نێجگار زۆرە. ئەهلەکەی هەرچەندە پەرە بستێنێت دیسان ئەتوانێ بەکشتوکاڵی ولاتەکەی خۆی تیا بژێنێت. هەر خوا ئەزانێت لەژێر ئەهۆم (طبقات)ی خاکی کوردستانا و لەناو دۆڵ و لاپاڵەکانیا چ جۆرە (کان)و (مەعدەن)و خێرو بەرەکەتیداپۆشراو هەیەو هەمووشی سەرمۆرە چاوەڕوانی کەوتنەکاری بازووی زانیاری ڕۆڵەکانی ئاو سینەی خۆیەتی کە پێیان ئەخاتەکار. سەرچاوەی مێژوویی ئەقوام ڕووناك نییە ساغ کردنەوەی کانگاو ڕەگەزی ئەتەوەیەك شتێکی ئاسان نییە. لەسەر زەمینا ئیمڕۆ هیچ ئەتەوەیەك نییە بتوانێ داوا بکا کەوا ڕەگەزو بنچینەی خۆی بردووەتە سەر سەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزادو بڵێت ئەتەوەی ئێمە لە (فلان) هۆزو تایەفەیەو لە فلان شوێنا پەیدابووەو ئەوی بەسەریانا هاتووە بزانێتو بتوانێ بیگێڕێتەوە. لەبەر ئەوە ئەبێ بزانرێت کە سەرچاوەی مێژوویی هیچ قەومێك بەتەواوی (ڕووناك) نییە. کام ئەتەوە ئیمڕۆ بەهێزە لەسەر ئەم سەرزەمینەو لەشارستانێتیدا گەیشتووەتە پۆپەی پێشکەوتن و بەرزیو لافی کۆنیەتی ئەژادی خۆی لێ ئەدا دیسان ناتوانێت پێچەوانەی

قسەکانی لای سەروو لاف لێبداو بەلگەی عیلمیی هەبێ بتوانێ بیسەلمێنێ.
ئینگلیز، ئەلمان، فەرانسا، چین، عەرەب، تورك و ئێرانییەکان هەر کامێکیان بگریت هەموویان تارادەیەك ئەتوانن لە بنچینەی نەژادی خۆیان قسە بکەن و کە گەیشتە دوو سێ هەزار ساڵ پێش میلاد نەبینی ئەکەونە تاریکییەوە ئەوسا دەس ئەکەن بەڕاو و ڕێویکردن‌و بۆ شتێکی پەنهان و نەزانراو بەبیرو بەقەڵەم ئەکەونە تەقەلادان‌و ئاخرییەکەی تێنەفکری گشتی ئەبەستن بە (ڕەنگە)و (دوورنییە)و شتی وەهاوە. بەمەراقی ئەم باسەوە ئەوی مێژووی ئەقوام بپشکنێت لەهەموو جێیەکا تەنگوچەڵەمەو تێکەوتنی مێژوو نووسەکان ئەبینێت. کە ئەمەمان بۆ دەرکەوت زۆر داخ بەوەوە ئەخۆین کە بەرەبەیانی مێژوو ئەوەندە ڕووناك نییە تا ئینسان بتوانێت لە بابەت ئادەمیزادی کۆنەوە بیرێکی ڕاست‌و تەواو پەیدا بکات، چونکە زاناکان ئەڵێن دووسەد هەزار ساڵ زیاترە لەم سەر زەمینەدا ئینسان پەیدا بووە، بگرە هەندێکیان ئەڵێن پەیدا بوونی ئینسان لەسەر ئەرز پێنج سەد هەزار ساڵە. کە چی خوێندن‌و نووسین هەمووی شەش هەزار ساڵە داهاتووەو زۆر دەرەنگ بڵاوبوەتەوە بەناو ئینسانا، بگرە هەندێك قەوم هێشتا ئیوە کێوییەو خوێندن و نووسین فێرنەبوە، وە یا بەزمانی خۆیان کتێب‌و شت نەنووسراوەتەوە. کۆچ و ڕەوی ئەقوام مێژووی هێناوەتە کایەوە کەواتە لەم چەند سەد هەزار ساڵی ڕابوردوودا ئەبێ ئینسان چۆنی ڕابواردبێت؟ لەوەڵامی ئەمەدا زاناکان ئەڵێن: هەر کە ئینسان پەیدا بووەو پەرەی سەندووە، لەژێر تەئثیری غەریزەی خۆ ژیاندنا بۆ سك تێر کردن پۆل پۆل بەسەر زەمینا سووڕاوەتەوەو، بەیەکا چووەو بەپێی قانوونی تەقەلای ژیان یەکتریان هێناوەو بردووە یا فەوتاندووە، وە یا کردوویانن بە (کۆیلە)و دەست بەسەرو دەست و پێوەندی خۆیان. کە ئەم جۆرە ئینسانانەش لە دواییدا بەکاو خۆ تێکڕای ئاوێتەی یەکبوودو لەمانە تیرەو تایەفەی تازە تازە پەیدابوودو وتەو زمانی تازە بەرهەمهاتووە. لەدوای

ئەم هەموو ڕووداوانە ڕێکەوتی وەهابووە لەم کاتەدا شەپۆلە کۆچەری تازە هەڵمەتی هێناوە ئەمیش نەماوە وە یاشتە دروستبووەکانی پێشووی تێکومەکانداوەو هیچی نەهێشتووە. جا مادام بۆ ئەم هەموو تێکەو لێکەیە نووسراو نەبێت کە بەڕاستی ڕووداوەکانمان بۆ بگێڕێتەوە، چۆن ئەتوانرێ شتی زۆر کۆن و ڕەگەزی ئەقوامی هەرە پێشوو بەناوو بەنیشان و جێوڕێ بدۆزرێتەوە؟ بێگومان هەموومان ئەیسەلمێنین کە ئەمە نابێ! لەدوای ئەم

تێبینییە بابزانین ئەو میللەتانەی شارستانیەت (مدنیت) تاڕادەیەکی زۆر لەناویانا بلاوبووەتەوە، چۆن ئەژادی خۆیان ئەکەنو ڕەگەزیان چۆن ئەدۆزنەوە؟ ئینگلیزەکان ئەڵێن یەك دوو هەزار ساڵ پێش میلاد لە دورگەکانی بەریتانیادا هەندێك تیرەو قەوم دانیشتوون لە جینسو ڕەگەزی (سەلت)بوون ناویان (بریتوون)بووەو هێشتا لەدەوری بەردا بوون. لەدواییا گەلێ تایەفەیتر لە ئەوروپاوە بە (دەریا)دا پەڕیونەتەوە بەری دورگەکانو تێکەڵ ئەم کۆنانە بوون، ئەمجا لە فەرەنساوە لێشاوێکیتر هێرشی بردووەتە دورگەکانو داگیریکردووە. ئینجا ئەمانە بەرەودوا تێکەڵبوونو ئەتەوەی ئینگلیز دروستبووە!. هەموو قەومەکانی ئێستای ئەوروپا بۆ دۆزینەوەی ڕەگەزی خۆیان لە تەعریفێکی وەها وەیا نزیك بەم حیکایەتی ڕەگەزو بنچینەی ئینگلیزەکان زیاتر شتێکی کە ناتوانن بلێن. زانستیبنو بنچینەی ئەقوام لە بەری (ئاسیا) شدا لەمە زیاتر نییە وەکو عەرەبەکانیش لە بابەت ڕەگەزو بنچینەی نەتەوەکەی خۆیانەوە ئەڵێن: قەومی (عەرەب) لە دورگەی (عەرەبستان)دا پەیدابووە، وە بۆ ئەم پەیدابوونەش لەهەندێك سەرگوزەشتەو ڕیوایەتی (سام)و (نووح) بەولاوە هیچیتر نازانن و ناتوان بزانن، وەکو ئەڵێن: لە زۆر کۆنەوە لە عەرەبستانا ئەقوام دانیشتووە. ئەمانە لە (سامی کوری نووح پێغەمبەر) کەوتوونەوەو بەناوی (یعرب) ناوی سەرۆکیانەوە ناویان بووەتە (عەرەب). کەچی زاناکان ئەم سەرگوزشتەیە بەشتێکی هیچو پووچ دا ئەنێنو

نەڵێن عەرەبەکان لە عەرەبستانا پەیدابوون، بەڵام کەس نایزانێت چلۆن پەیدابوون وە یا چلۆن و کەی هاتوونە ئەوێ ناویان ناون نەتەوەی (سامی). ئەمانە جاروبار لە عەرەبستانەوە پۆل پۆل هاتوونە دەرەوە وڵاتانی چواردەوری خۆیان داگیرکردووەو حکومەتی دەوری (کۆن) یان هێناوەتە مەیدان‌و لە دوای هەموویان ئینجا عەشایری تازەتر کە ناویان (عەرەب)ە کۆچ کۆچ کشاونەتە دەرەوەی عەرەبستان جێگای تایەفەکانی پێشوویان داگیرکردووەو گەلێك سەرزەمینیتر کە سامییەکانی پێشوو بۆی نەچوو بوون ئەوانەشیان تێکەوە پێچاوە، هێندێك نەتەوەی غەیری سامییشیان تێکەڵاوبووە، ئەنجامی کارهەمووی بوون بە (عەرەب). ئینجا بەکورتی حیکایەتی رەگەزو بنچینەی ئەقوام هەمووی بەمجۆرەیە. کەوا بوو (کورد)ەکانیش بەپێی ئەم ڕووداوانە ڕەگەزو بنچینەی نەتەوە خۆیان ئەتوانن لە (کوردستانا) بدۆزنەوە[5].

## کورد لە کوردستانا پەیدا بووە

دیارە لە کوردستانا ئیمرۆ گەلێ تیرەو نەتەوە دانیشتووە، وەکو وڵاتانی دراوسێ. ئەمانە (لق)یان لێبوتەوەو پەرەیان سەندووەو، زمانی تایبەتییان هەیە قسەی پێئەکەن. بەڵام زمانەکان هەموولەیەك ئەچن‌و ئەچنەوە سەریەکو نەتەوەکان هەمووشیان بەخوێنو سەرو سەکوتو ڕوخسارو کردەوە نایین وەك یەك وەهان و بەهەمووشیان ئەڵێن (کورد). بەمەدا هیچ گومان نامێنێ کە ئەمانیش لە نەتەوەی کۆن بەرهەم هاتوونو بەدرێژیی وەخت وەکو نەتەوەکانی تر ناوێتەی یەکبوونو لقیان لێبووەتەوە... بەم حیسابە ئەگەر مێژوزانەکانی کوردیش مێژووی کۆنی نەتەوەکانی ئاسیای ڕۆژاوا بپشکنن‌و

---

[5] مێژووی عوصووری قەدیمەی (هنری براستید). (شعوب هند و ئەوروپا) ص١٢١ - ١٢٢.

لەناو هاتو بڕۆی ئەو خێڵو کۆمارانەی کە لەسەر زەمینەکانی کوردستانا پێکهاتوون‌و تێکەڵبوون شارەزایی هەڵهێنجن یا لە نووسراوەکان شتی بەکەڵك بدۆزنەوەو لێکیان بدەن، ئەو حەلە مێژووی نەتەوەی (کورد)یش وەك هی نەتەوەکانی‌تر دێتە مەیدان. ئەگونجێ هەبێ بڵێت نەتەوەی کورد کوا شوێن‌و کردەوەی دیارە. لە مێژوودا ناوی نییە وەیا ڕابوردووی وەهای نییە کە هاوتای نەتەوەکانی تر بکا. ئەوسا ئێمەش ئەڵێین:

خۆ تەئریخی ئەقوام گشتی وەك یەك ڕێکوپێك نییە. نەتەوەی (بەختیار) هەیە مێژووی قەومییان زۆر بڵندە، لە پێگەیاندنی مەدەنیەتە بەرزەکەی ئیمرۆدا بەشدارە، بێگومان لاپەڕەی مێژوویان پڕە لە کردەوەی بەرزو خزمەتی گشتی بۆ خۆیان‌و ئادەمیزاد، بەڵام زۆر نەتەوەش هەیە (میرات)ی وەهایان بۆ بەجێنەماوەو لەم ڕووەوە مایەی تەئریخی میللی یان فەقیرانەیە. لەسەر ئەوەشا ئێستا بەنەوەیەکی تایبەتی دانراون‌و لەناو (دەوڵەتان)دا ناونیشاندارن، چونکە (کەیان)یان هەیەو هەر لەبەر ئەوەشە مێژووی قەومییان قبوڵکراوە، بەڵام نەتەوەی (کورد) ئیستیعمار نەیهێشتووە کەیانی ببێت، بۆیە خۆیو مێژووی قەومییەکەی دەرنەخستووە، ئەگینا نەتەوەی کوردیش مێژووی خۆی هەیەو مێژووەکەشی مایەدارەو ڕووداوی بەنرخی تیایە. بگرە لەگەڵ دراوسێ (کەیان)دارەکانیا پێکەوە خزمەتی مەدەنیەت‌و ئینسانیەتی کردووە. بێگومان گەلێك هاووڵات‌و هاودین لە ئەقوامی ئیسلام بەسایەی بازووی کوردەوە ڕۆژی تەنگانە سەرکەوتنی تەئریخی دەسکەوتووە. کەچی ئەو ڕەفیقانە ئەو سەرکەوتنەیان بە بەری ڕەنج و تەقەللای خۆیان داناوەو ناوی (کورد)یشیان هەر لە کوولەکەی تەڕیشا نەبردووەو خۆیان نەخستووەتە ئەو دارەتە کە جگە لە خۆیان کەسێ تر بوو بێ ئەو شەڕەی بۆ بردبنەوە، وە یا دەستێکی بووبێ لەو بردنەوەیەدا. هەرچی کورددکەیە (کەیان)ی نەبوودو بەشەخوێنی ڕژاوی بۆ نەنوسراوەو ناوونیشانیشی دەرنەکەوتووە. لەمێژوودا ئاشکرایە کە (کورد)

بوومته پەرژینی پایەدارێتی ئایینی ئیسلام. دەوری (سەلاحەدین)ی ئەیوبی شاهیدی ئەم پایەدارییەیە. لەشکرو سوپای سەلاحەدین و دەهای حەربی ئەم سەرداری کوردە نەیهێشت ئیسلامیەتی لەناو بچێت. پێویستە هەموو بزانین ئەگەر کورد نەبوایە ڕژیمی کۆمەلایەتیو سیاسی نەتەوەکانی ڕۆژاوای نزیك ئێستا جۆرێکیتر نەبوو، وە ئەنجامی شەڕی صەلیب بۆ نەتەوە موسوڵمانەکانی کەنار (دەریای سپی ناوەڕاست زۆر کوشندە نەبوو[٦]، وە لەگەلێك ژێرەو ژوورو بەسەرهاتی مێژوویی تردا، (کورد) بووەتە هۆی پاراستنو نەڕووخانی (کەیان)ی نەتەوە دراوسێکانی ، وە ڕژێمو قانونی بۆ ڕاگرتوون وەکو لە (شەڕی سەربەخۆیی تورکیا)دا ئەبینرێ کە لەگەلْ (یۆنان)دا کرا، ئەوە بوو کە کوردەکان گەیشتنە فریای تورکەکانو سەرکەوتنیان بۆ (مسۆگەر)کردن، چونکە ئەگەر وانەبوایە تورکیای (مستەفا کەمال ) لەناو ئەچوو.

## نەتەوە هەرە کۆنەکانی ڕۆژاوای ئێران و ڕۆژهەلاتی عێراق

ئەم ئینسانانەی ئێستای سەرزەمین کە بە هەموو شوێنێکا بلاوبوونەتەوەو، هەر شوێنێکی تەرخانکردووە بۆ خۆیو تیادانیشتووە، وە نەبێت دەمو دەست لە خۆیەوە پەیدابوو بێت وەیا وەك دارو درەخت لە جێیەك دەرهاتبێو لەوێدا پەرەی سەندبێت، بەلکو ئەم نەتەوە قامیدەو بەنیمتیازە وەك لە باسەکانی سەرەوەدا بێژرا زۆر بە ئەرك و بەناڕەحەت پەیدابووەو، هەتا گەیشتووەتە ئەمَ حالَی ئێستایە جۆرەها ئالوگۆڕی دیوەو لەکاتی کۆنا بە کۆچوڕەو بۆ نیشتمانێك گەڕاوە کە تیا دامەزرێتو ئیتر نەجوولێت. لەم تەقەلایەدا هەندێك

---

[٦] مێژووی عوصووری قەدیمەی (هنری براستید). (شعوب هندو ئەوروپا) ل١٣١-١٣٢.

سەرکەوتووەو تاقمێکیش تیاچووەو نەماوە.. جا سەر گوروشتەی کۆنی ئینسان زۆری عیبارەتە لەم کۆچو ڕەوانە. نەژادی هەمووی نەتەوەکانی پێشوو، وە لەناویاندا نەژادی کوردیش ئەمەی دیوە. لەدوای گەلێك سەرئەنجام ئەم ئەوەیەی لێپەیدابووە وەکو لای خوارەوە باسیان ئەکرێت؛ چلۆن عەرەبستان جێی پەیابوونی نەتەوەی (سامی)یەکان بووە، سەرزەمینەکانی چواردەوری بەحری (قەزوێن)یش شوێن جەولانگای عەشایری (قافقاس) و (هیندۆ ئەرووپایی) واتە (ئاری)و (تورك)و (مەغوول) بووە. عەشایری سامی لە پێش مێژووەوە هەر کە لێی قەوماوە پۆل پۆل عەرەبستانی بەجێهێشتووەو کۆچی کردووە بۆ دەوری عەرەبستان و لەوێ دانیشتووە. هەر لەبەر پێویستییەکی وەهاش جۆرە عەشایری (قافقاس و ئاری) لە مێژوودا بەین بەین نیشتمانی کۆنی خۆیان کە سەرزەمینەکانی گوێ بەحری (خەزەر)بووە، بەجێیانهێشتووەو ڕوویانکردووەتە وڵاتەکانی دەوری خۆیان و گرتوویانەو ئەمجا ئەوێیانکردووە بە نیشتمانی تازەیان. بەو تەرحە لەدوای چەند پشتێك لە بیریشیان چووەتەوە کەباوکوباپیریان لەجێی دوورەوە بە کۆچوڕەو هاتوون، بەڵکو وایان زانیوە کە نەژادیشیان هەر لەو ناوەدا خوڵقاوە. بەپێی وتەی زانیارەکانی جوغرافیا[7] وادیارە لە زۆر کۆنا ئیقلیمی دەریای (قەزوێن) وەك ئێستا کەم بارانو چۆڵ تەبیات نەبووە، بەڵکو وەك عەرەبستان لە زۆر کۆنا وڵاتێکی بەباران بووە، چوار دەوری بەحری (خەزەر)[8]یش وەهابووە. ئەو حەلە ئەم بەحرە لە ئیستا گەورەتربووەو بەدۆڵی (مانیچ)دا کەوا لە ژوور کێوی قافقەوەیە لەگەڵ بەحری (ئازۆف)و بەحری (ڕەش) پەیوەستبووە. ئەو حەلە ئەوناوە

---

[7] جوغرافیای تەبیعی تورکی (فایق صبری).

[8] تەئریخی عوصووری قەدیمە (برایسستد) ل٦-٧.

بـەپیتو بەرەکـەت بـووە. بۆیـە ئینسـانەکانی ئـەوێ لـەو سـەردەمەدا بـە ناسوودەگی ژیـاونو (ڕەوە) ماڵاتیـان بـەخێوکردووەو پـەرەیان سـەندووە.بـەڵام لەدواییدا تەبیعەتی وڵاتەکە گۆڕاوە، بـارانی کەمبووەتـەوە، دەریـای (خـەزەر)و دەریـای (ئـارۆف) چوونەتـە شـکڵی ئێسـتایانەوە. جـا ئـەم حاڵەتـە بەشـوێن دۆڵەکەی (مایـنج)ی ئێستاشا دیارەو نیسباتە، بۆیـە لـەدوای مسـەوەرەیە بـەرە بەرە ئیقلیمی ئەوناوە تێکچووەو گۆڕراوەو بووەتە وڵاتێکی (دێمەرۆك)ی ئەوتۆ ئیتر نەتەوەکانی ئەوێ نەیانتوانیوە وەك جاران بە فەرەحی لەوێدا بحەوێنەوە، بۆیـە یـەکتریان ناڕەحـەتکردووەو هەڵمەتیان بـردووە بـۆ سـەر یـەکتر. ئـەوی دەرفەت نەهاتووە جووڵاوە بۆ پـەیداکردنی جێگایـەکی تـازە. سـەبارەت بەمـە دەسـکراوە بـە کـۆچو ڕەو، ئـەوی شکاوە شوێنی خـۆی بەجێهێشـتووە. لەوەشـا گومان نییە، ناڕەحەتیو تەعـەداکردنی خێڵاتـەکان لەسەر یەکتری ئـەگونجێت لـەڕووی هەڵمـەتی تایەفـەکانی (جینسی زەرد) لـە تورکستان و مەغۆلستانەوە ڕووی دابێت کە لە ڕۆژهەڵاتی ئەمانا بوون. ئینجا عولەمای (ئەتنۆغراف) ئـەم عەشایەرە کۆنانـەیان داناوە بـە ئـەژادو (ڕەگـەز)ی ئـەقوامی (ئـاری) وەیـا وەك ئەوروپاییـەکان ئـەڵێن (هینـدۆ ئـەروپایی) وەیـا (هیندۆجەرمـەن)ی ئێسـتا. زاناکـان ئـەڵێن تـاقمێك لەمانـە ڕووی کردووەتـە (ئـەرووپا)ی ئێسـتاو پـەیدا بووەتەوە کە لە ئەنجامی کارا نەتـەوەکانی ئێستای ئـەوێیان خستووەتەوە کـە (لاتـین، جەرمـەن، سلاو)ەکـان، وە ئـەڵێن هـەندێك تـیرەو کۆمـاریش بـەرەو جـەنووب بـۆ قـەفقاسو بـەرەو جـەنووبی ڕۆژهـەڵات ڕۆیشـتوون چوونەتـە (هیندوستان)و (ئـێران) لـەوێ خۆیـان گرتووەتـەوەو کردوویانـە بـە نیشتمانو پێیدا بڵاو بوونەتـەوە کـە ئەمانـەش ئـەژادی نەتـەوەکانی ئیسـتای (هینـد، ئەفغان، ئێران، وە کورد)ەکانە، واتە گشت نەتەوەکانی (ئـاری)ی ئاسیای ئیمـڕۆ لەوانـە کەوتوونەتـەوە. جارو بـاریش هـەندێك لـەم نەتـەوە ڕەوەکییانـە لـە (دەربەند)ەکانی کێـوی قافـەوە هاتوونـە خـوارەوە ڕوویانکردووەتـە وڵاتـەکانی

ڕۆژهـەڵاتی (ئـەنادۆڵ )و ڕۆژاوای (ئـێران)، بـەرە بـەرە تێکـەڵاوی نەتـەوە کۆنەکانی ئەوێ بوون کە لای خـوارەوە بەتایبـەتی باسـی ئـەو کۆنانـە ئەکـەین. بێجگە لە مانـە لـە ڕۆژهەڵاتی ئـەنادۆڵدا تیرەیـەکی کـۆن دانیشـتووە(هتیـت- حت)یان پـێ ئـەڵێن کەرەگەزەی ئەمانـە هێشتا بنـچ بەسـت نـەبوە، بـەڵام لەنەتەوە بەناو بانگە کۆنەکانن، لە پێش هاتنی ئارییەکانا لەناو چوون. جا زاناکان هەموویان ئەم مسەوەرەی کۆچ و ڕەویان سەلماندووەو عەشایرەکانیشیان بەنـەژادی قەومـە ئارییـەکان (ئاسـیا)و (ئـەروپا)ی ئێستا دانـاوە. تەنانـەت هەندێك لەو زانایانە ئەڵێن کۆنەکانی پێشوو کە (عەیلام، گۆتـی، کاسی، لۆللۆ، سۆباری و، مینانی)یەکانن.دەستە کۆچ و ڕەوی یەکەمین لە پێش دوو هەزار ساڵ پێش میلادا هاتوون، خـوارو ژوور لـە (زاگـرۆس)ە کانـا گیرساونەتەوەو لەگـەڵ (سـۆمەر)و (ئـەکاد)ەکانـا هاوچـاغ بـوون و بەشـەڕو بـە ئاشـتی ڕایـانبواردووە. مەوجەی دووەم کە (ماد، مانای، پارت، فـارس، کاردۆخ، ئـەفغانو، هینـد)ەکـانن دەستەی دووەم جـاران هـەردوولایان (ئـاری)ن. ئـەمانیش لەناوچـەی بـەحری (خەزەر)ەوە پێش سـەدەی دەیـەمی پێش میلاد هاتوون. بـەس مـاد، فورس و کاردۆخـەکان بـۆلای زاگرۆسـەکان هاتوونو لای نەتەوەکۆنـەکان گیرسـاونەتەوە. ئەم تازە هاتووانە بە ئەنجام حاکمبوون بەسەر کۆنـەکاناو لـە دواییـدا تێکـەڵ و ئاوێتـەی یـەکتربوون. جا (کـورد)و (فـورس)و (هینـد)و (ئـەفغان)ی ئێستا لـەم ئاوێتە بوونە دروستبووە. ئەم تەعریفە وەها ئەگەیەنێ کە قەومایەتی ئێستای (کورد)و (فـورس) بـەم دوو مەوجـە کۆچـەرە بەرهـەم هـاتووە. بەڕاسـتی کـە شەپۆلی مەوجەی دوایی هاتووە، شەش تایەفە کۆنەکـە هێشتا ماوەو ئـەوە زۆر ئاشکرایە کە ئەم ئارییە تازانـە تێکـەڵ کۆنـەکان بـووە. زمـانی ئێستای (هینـد، ئەفغان، فورسو کورد) لەدوای تێکـەڵبوون پـەیدابووە. نەتـەوە کۆنـەکان دەوری مێژوویـی خۆیـان بەجێـهێنابوو کـە مەوجـەی دووهـەم هـات. هـەرچی (سۆمەر)ەکانە لە پێش تەئریخەوە چوونەتە (عێراق)و ڕەگـەزیان هێشتا سـاغ

نەبوومتەوە، وە کەمەوجەی دووەم هاتووە ئەمان نەماون. بەلاّم پێویستە ئــەوە بزانرێ بناغەی ئاوەدانی و خوێندەواری و نوسین ئەم سۆمەرانە دایانهێناوە لە عێراقا[٩] . بـەلاّم هێشتا هـەموو زاناکـان بڕوایـان بـەم (نەظەریـە)یـە نـەکردووە، بـەلاّم ئــەو زانایانــەی کــە دانــەری (نەظەریــە)کـەن زۆر وردبوونەتــەوە لــە نەظەریەکە، چونکو ڕاستە ئـەبێ نەتــەوەکانی مەوجـەی یەکـەمیش (ئــاری) بووبن، بۆیە بەسووکو ئاسانی گونجاوە ئاوێتە بن، واتە مەینـەتی تێکـەڵ بـوون سووك ڕۆیشتووە. ئەو کاتە تورکمان هێشتا پەیدا نـەبووە تـا بڵێـین ئـەگونجێت تورکمان بووبن. جا لەبەر ئەوەی هـەردوو مەوجەکە( شکی تیا نییـە) بـووەو ئاوێتـە بونەکەشیان ڕاستە، پێویستە ئـەبێت ئـەحواڵی تــەئریخی نەتــەوەکان هەردوو (مەوجە)کە بنوسرێت لە مێژووەکەمانا، چونکـو کـوردو ئێرانییـەکانی ئەوسا تێکەلاّوی ئەو کۆنانە بون ئینجا بون بە (کورد)و (فورس)ی ئیستا. بۆیە ئەبێت بنچینەو ڕەگەزی ئێمە لەوانەوە دەستپێبکا. زۆر ئـەگونجێت کـە شـەش نەتەوەکەی لای سەروو لە جینسی سپی بن، چونکـە کـەس ئـاڵێت و ئـەیوتووە ئەمان (سامی)ن. سەرو سەکوت و قیافەت و زمانیان سامی نەبووەو لەناو زەوی و زارە شـاخاوییەکەی (زاگــرۆس)ا ژیــاون دەشــتییان نــەکردووەو لەســەرەتای مێژووەوە هاتوونە ئەوێ. هیـچ زانایەك ئەیوتووە کە لە پێش مێژوودا تایەفەی مەغوول وەیـا تـورك هـاتووە بـەو ناوچەیـەدا کـەوابوو ڕێگـای تـر نییـە، شـەش تایەفەکەی پێشوو ئەگەر( ئاری) ئەبن ئەبێت (قافقاسـی) بـن. ئـەگونجێت ئـەم دەستە (ئەتەوانە) لەدەوری (غلاسیە - بەستەڵەك) کە لە شیمالی (ئۆراسیـە)دا ڕووی داوە لە دە هەزار ساڵی پێش میلادا، لەسەرمانا هەلاّتوون بۆلای گەرمیانو

[٩] مێژووی (دوکتۆر شاکیری خەصباك) ل٩، وە مێژووی (کوردەکان)ی باسیل نیکتین و، مێژووی مینۆرسکی.

بەنەنجام گەیشتنە زاگرۆسەکان[10]، لە پێشەوە (سۆمەر) ئەمجا (عیلام)و لەپاشان ئەوانی تریش گەیشتنە (زاگرۆس)ەکان لەوێدا وەستاونو دامەزراون، ئەمجا پێویستە چاوەڕوان بین کەئەمە لەمەولا، لای زاناکان ساغبێتەوە.

**ەوجەی یەکەم: دەستە نەتەوەی پێشینان و پەیدا بوونی (عیلام، کاسی، گۆتی، لۆللۆ، سۆباری، مێتانی)**، ئەگەر بڕوانیتە مێژووی (نەتەوە کۆنەکان)ی ڕۆژهەلاتی نزیك ئەبینین لە زۆر کۆنا لە عێراق و دەوری عێراقا هەندێك قەوم هەبوون ناویان زانراوە، بەلام کەس نازانێت ئەمانە کەی هاتوونە ئەوێو لەو ناوەدا چۆن جێگیربوون. بەلکو لەگەلْ هەندێك ڕیوایەتا هەر ئەوەندە نوسراوە کە لەسەردەمی هەرە کۆنا لە جەنووبی عیراقا نەتەوەیەکی (سۆمەر) ناو هەبووەو عێلاتی(عیلام)و (لۆللۆ)و (کاسی) ناویش لە ڕۆژهەلاتی (عیراق)دا لەناو چیاو دۆلەکانی سنووری ئێستای (ئێران)و (عیراق) دانیشتوون. دیسان لەناو کەژو کێوەکانی ژووروتردا لە عێراق دوتیرە قەوم (گۆتی) و (سۆباری) ناو بلاوبووەتەوەو نارامگیربووە کە بە بڕوای هەندێك زانا ئەمانە (زمان)یان لەیەکچووەو بەڕەسەنیش لە هۆزی (قافقاس)ەکان بوون. ئەمانە کە نەتەوەی تریان لە پێشەوە نەبینراوە ئایا چلۆن پەیدابوون وە یا چلۆن هاتوونە عێراق لەڕۆژهەلاتیا دانیشتوون؟ لەم باسەماندا خەریکی حەلکردنی سەرگوزەشتەی هاتنی ئەمانەو کردگاریان نەبین، چونکە ئەم عەشرەتانە لەگەلْ ڕەگەزو بنچینەی قەومی کوردا پەیوەندییان هەیە، بگرە ئەتوانین بلێین کە نەتەوەکانی (کورد)و (ئێران) بەڕەسەن خوێنی ئەمانەیان تیایەو ئیمڕۆ لەم سەرزەمینەدا هیچ نەتەوەیەك نییە کە تێکەلاو نەبوبێتو، تێکەلاوبوونی ئەو نەقوامە ئەوەندە گرفتی تیا نەماوەو، گەلێك نەقوام لە یەکا تواونەتەوە،

---

[10] تەئریخی عوصووری قەدیمە (بریستید)، خەریەی عەصری جەلید،ل٦.

گۆڕیان گوم بووەو ناویان نەماوە. لە مێژوودا نەمانە دیارن. لەبەر نەمانە باس لە مێژووی هەر نەتەوەیەك بکرێ چ قەومێکی تر تێکەڵیان بوو بێت پێویستە باسی نەحواڵی ئەوانیش بکرێت، چونکە پیشەو خوڵق و کردگارو شێوەی زمان لەیەکتر وەرنەگرن و، نابێت هیچی پەنهان بمێنێت. لەبەر ئەوە باسی تەئریخی گشت ئەو نەتەوانە ئەکەین کە تێکەڵ کوردان بوون لەکاتی کۆنا.

## ڕەگەزی نەتەوە کۆنەکانی عێراق و پەیابوونی مەدەنیەت

زاناکانی جوغرافیا ئەڵێن پێش بیرەوەری ئادەمیزاد (خەلیجی بەسرە) هەتا (ژورووی بەغدا) هاتووە، یەعنی کێڵگەکانی جەنووبی عێراق کەئێستا دەشت و نەرمانە وەختی خۆی (دەریا) دایپۆشیوە. بەڵام لەدواییدا زەمانی قوڕاوی (ڕووبارەکان) ڕژاوەتە گوێی ئەم دەریایەو بیریکردووەتەوە، تابەنەنجام شوێنەکەی بۆتە دەشت و بەجێماوە. ئەو شتانەی کە لە شوێنی نەتەوە کۆنەکانی خوارووی عێراق لە قووڵایی زەمینا لەلایەن زانایانی (ئاثار)ەوە دەرهێنراوە ئەمە ساغ ئەکاتەوەو گومانی تیا ناهێڵێ[1]. لە زۆر کۆنا لە دورگە (جزیرە)ی عەرەبستانەوە عێلاتی ڕەوەکی ڕوویکردووەتە عێراق هەتا گەیشتووەتە سەر ڕووباری (فورات) وەیا قەراغ (دەریا) لەوێ گیرساونەتەوەو دانیشتوون، ئەوسا بەرە بەرە دەستیانکردووە بە ئاوا کردنەوەی ئەو ناوە. جا عێلاتی (ئەکەد) یەکێکە لەوانەو یەکەمینیانە. ئەوسا (دەریا) لای (سەماوە)ی ئێستا بوو. ئەمانە کە هاتن وڵاتەکەیان (ئاوەدان) دی، شاری ڕازاوەو نەتەوەی خوێندەواریان تیادی، ئەم شوێنە ئاوەدانانە وڵاتی (سۆمەر)ەکان بوو. (ئەکەد)ەکان هاتنە شیماڵی ئاوەدانییەکەی لای (حلە)ی ئێستا لەسەر فورات

---

[1] تەئریخی حەضارەی (طاما) پاشا هاشمیو، مێژووی بریستید (ل١٣٥) شوعووبی ئاری.

وستان لەژێر دەوارا لەگەڵ سۆمەرەکان لای (حلە)ی ئێستاو لەوانەوە فێری نیشتەجێیبوون، شاری (ئەکەد) یان دروستکردو بەگژ سۆمەرەکانا چوون لە ٢٩٠٠ ساڵ لە پێش میلاددا. (سۆمەرەکان) یەکەم کۆماری ئادەمیزادی مەدەنین لەسەر ئەم سەرزەمینە. لەپێش میلادا بە ٣٥٠٠ ساڵ و بەڵکو زیاتر ئەم (سۆمەرانە) لەناو چیاکانی ئێرانەوە بەهۆی هەر بۆنەیەکەوە بوو بێت کشاون بۆ (عیراق) بۆ پێ دەشتی هاتوون، لای (دیجلە) یان پەسەند نەکردووە چونکە ناو نەیگرتووەتەوە. ئەمجا پەڕیونەتەوە، بۆسەر (فورات)، لەوێ ئارامیانگرتووە، خۆیان لەپێش تەنریخەوە هاتوونو لە عێراقا داخڵی تەنریخ بوون، قەومێکی ناوداری بەرزن لە مێژوو لە (مەدەنیەت)دا، لە گوێ (فورات) دەستیان کردووە بە کشتوکاڵ، ناوەدانییان پێکەوە ناوە، یەك لەدوای یەك گەلێك شاریان دروستکردووە، هەر شارە حکومەتی جیاوازی بووەو سەربەخۆ ژیاوە، دەستوری سیاسەتی (سۆمەر)ەکان ئەو کاتە وا بووە هەر شارە حکومەتێکی جیاوازی بووە، لە مێژوودا ناونراون (حکومەتی شاران) ئەمانە ناکۆك بون لەگەڵ یەك. بەئەنجام ئەم جۆرە سیاسەتە بووە بە هۆی لەناوچوونی سەربەخۆیی سۆمەرەکان. لە مێژوودا پێش هەموو ئەقوامی سەرزەمین (سۆمەر)ەکان نووسینیان داهێنا، وە لە ٢,٥٠٠ ساڵ پێش میلادا لە (وێنە- صوورەت)ی شت نووسراویان داهێنا، لەدواییدا چووە سەر شکڵی (مێخی). ڕەگەزو ڕەسەنی ئەمانە بەتەواوی ساغ نەبوەتەوە. ئەڵێن ڕەسەنی سپین، (سامی)و (توورانی) نین. بەشێك لە زاناکان ئەڵێن ئەمانە کە هاتوونەتە عێراق هێشتا لەدەوری (بەرد)دا بوون، تازە فێری کشتوکاڵ ببوون. لە نووسراوەکانیانا کە دۆزراوەتەوە جینس و ڕەسەنیان نەنوسراوە. خۆشیان نەیان وتووە لەکام ڕەگەزن وەیا لەسەرەتادا لەکوێ وە هاتوون. ئەم شوێنانە هیچی دیار نییە. لەبەر ئەوەی لە پێشهاتنی (ئاری)یەکانا ئەمانە لەناو چوون لەگەڵ (ئێرانی) و (کوردەکان)دا هیچ تێکەڵاوییان نییە. لەبەر ئەوە دەربارەی

(سۆمەردکان) لەمە زیاتر پێویست نییە هیچ بنووسین. ئینجا (شارستانیەت)ی کۆنی عێراق کە لە مێژوودا بەناوبانگەو زاناکان دایاننـاوە بـە بنچینـەی شارستانیەتی ( مەدەنیـەت)، سەرزەمین ئـەم سۆمەرانە بناغـەیان دانـاوە، وە ئەکادە سامییەکان و بەڵکو هەموو ئەو ئەتەوانەی تر کە لە سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراقا دانیشتوون گشتیان شارستانیەتییان لـەم بناغەیـە وەرگرتـووە. وەکوو مێژوو ئەڵێت ئینسانی سەر ئەم ئەرزە لە پێشا شارستانی نـەبوە. ئـادەمیزادی هەرە پێشوو ڕاوچیبـووە. خـۆی و مالْ و منداڵـی بـەڕاو ژیـاندووە، لـەدواییدا (ئاژاڵ)ی ماڵی و بەخێو کردووە، بە گەلەو ڕەوە حـەیواناتی بـەخێوکردووە کـە ئـەوەش بـەناچاری ئـادەمیزادی تووشـی (کۆچەریـتی)کـردووە. بـۆ (حـەیوان) لـەوەڕاندن گـەڕاوە بەدەشـتو دۆڵو کـەژو کێـوا. لـەدوای ئەمـە فـێری کشتوکاڵکردن بـووە. بەناچاری بـەدیار کشتوکاڵەکەیەوە پاسەوانیکردووە کـە لەناو نەچێت. وە قۆخی دروستکردوە بەدیار زەرعەکەوە تیا دانیشتووە، ئینجـا چەند قۆخێکی وەها بۆتـە (دێ)یـەك، بـەوە کۆمـەڵو دێکـانی پـەیا بـووەو لەوەشـەوە گەل، کۆمـارو ئەتـەوەو (ئـاوایی)و شـاری گـەورە هـاتووە کایـەوە. وەنـەبێ ئـادەمیزادی ئـەو حەلـە هـەموو بەیـەکجاریەوەیا لـە هـەموو شـوێنێکا لەیەك وەختا وەیا وەکو یەك بەو پلانی ژیانـەوە ڕۆیشـتبن بـەڵکو لـە شـوێنێکا کە (دانیشتوو) بووە هەر لەو شوێنەدا یان زۆر لە نزیك ئەوانەوە (ڕەوەکی)یش بووە. جا لەبەر ئەوە تەقالیدو خوو ڕەوشتو جۆری ژیانو ئـەریت و هـەڵس و کـەوتیان لەیـەك جوێ بووە، ئاحـەزی لەبـەینیانا پـەیدا بووە. لەبـەر ئەمانـە لەبەینی ئینسانی کۆنـا شـەڕو دووبـەرەکیو ڕقەبـەری هیـچ ئەپساودتەوە. دوو بەشە ئینقیلاباتی سەر ئەم زەمینە لـەو ڕوودوە بـووە. لـەمێژوودا بـە هـەزاران ئـەم جـۆرە ڕووداوانـە ئـەبینرێتو، ئـەو ئەتەوانـەی هاتوونەتـە عـێراق دەرەجاتـەکانی لای سـەردودیان هـەموو بڕیـوە. هـەموو مێژونـووس و زاناکـان ئەڵێن لەپێش هەموو جێگایەکی سـەرئەرز لـە (عـێراق)و (میسر)دا ئـادەمیزاد

تۆوی (ئاوەدانیـی) ڕشتووە، وە لەوێوە بەسەر زەمینا بڵاو بووەتەوە. هێشـتا لـە هیچ جێیەك (ئاثار)ی ئینسانی مەدەنی دەر نەکەوتووە کە بوتری ئەمە پێش بەجێماوە کۆنەکانی (عێراق)و (میسر) دروستکراوە. عێراق پێش میسریش کەوتووە. تەنانەت حیکایەتی (تۆفان) لە عیراقا دروستبووەو لە (ئاثار)ەکانیانا نووسراویەوەها هەیە. لەبەر ئەمانە پێویستە بڕوانینە مێژووی کۆنـی عێراق تابزانین لە نەتەوە کۆنەکان کامیان لەگەڵ نـەژادو ڕەگەزی (کورد)دا تێکەڵی هەیە بیدۆزینەوەو لە مێژووی کوردا ناونووسی بکەین.

## پەیدا بوونی حکوماتی هەرە کۆنی زاگرۆس

هەتا ئێرە لە حاڵەتی نەتەوە کۆنەکانی پێشوو ڕۆژاوای ئاسیای نزیك و کۆچ کردنەکانیان دواین. لەمەولاش باسی جێگیربوون‌و ئارامگرتن‌و ڕابواردنەکانیان ئەکەین. وەك لـەلای سـەرەوە وتـرا هـەرچی نەتـەوەی کـۆن هەیـە گشـتی لـە عەشـــایەرییەوە پێگەیشـــتووەو، بـــەدەم حـــەیوان بەخێوکردنـــەوە کۆچەرێتیکردووە، یـا فـێری کشـتوکاڵ بـووە ئەوسا بـۆی دانیشـتووە، وازی لـەم هات و چۆیە هێناوە. هەمووومان ئەوە باش ئەزانین کە ئەگەر یاساو دەستوورو ئـەمینداری نـەبێت (کۆمـەڵ) پێکـەوە ناتووسـێ، وە بۆیـە پیـاو مـاقووڵ و هەڵکەوتووی عێلانی کۆنیش بۆ ڕاگرتنی (ئەمنیەت)و ئاسـایش و (یاسـا)ی نـاو کۆمـەڵ و پاراسـتنی بـاری سیاسـی‌و قازانج‌و کـردو کۆشـی نـاو خۆیـان زەمانـە فێریکردوون و ناچـاریکردوون کـە (حکومـەتی عەشـیرەتی) پێکـەوە بنێـن‌و بیکەن بەدەستووری ژیان بۆ خۆیان. بۆیە ئەبینین ئـەقوام دەسـەڵاتیانداوە بـە ماقووڵ‌و سەرۆکەکانیان تاکو نیظامیـان بـۆ ڕاگـرن و نەیـەڵن دەسـت بۆیـەکتری بەرن‌و لەکاتی تـرس و تەنگانـەو مۆڵەکەشا بـۆ پاراسـتنی کۆگاکـەیان چەکیان هەڵگرتووەو چوونـە ژێـر ئـەمرو فەرموودەی ئـەو ئاغـاو ماقووڵانـەوە، ئەوسـا

بەگژ ئەوانەدا چوون کە تەماعیان تێ کردوون دەستیان بۆ هێناون وەیا هاتوونە سەر نیشتمانەکەیان. جا ئینسانەکانی پێشوو بەمجۆرە توانیویانە (کۆگا) ڕێکبخەن و موجتەمەع پێکەوە بنێن، کە ئەمانە دروستبووە (نیشتمان)و هەست (حس)ی پاراستنیشی هاتووەتە پێشەوە. لەدوای ئەوە بەپێی ئەم دەستوورانە لە خۆیەوە حکوماتی (سەرەتایی) داهاتووەو گەرای حکوماتی ئێستا دانراوە. کەواتە بەپێی ئەم دەستوورە با بزانین لە عەشایری کۆچەری کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک کام حکومەت پەیدابووەو چییان بەسەر هاتووە، یەکە یەکە لایخوارەوە بیاننووسین.

**سۆمەرەکان**

لە باسەکەی پێشوودا وتمان لەبەر ئەوەی سۆمەرەکان لەپێش هاتنی ئارییەکانا لەناوچوون، لەم مێژووەدا هیچ پێویستیەکمان بەوە نامێنێت کە باسیان بکەین، چونکو کوردو ئێرانییەکان ئەمانەیان نەدیوە.

<u>١-عیلامەکان:</u> جەنابی ئەمین زەکی بەگ لە مێژووە نازدارەکەیاندا تیرە قەومەکانی (گۆتی، لۆللۆ، کاسی، سۆباری) داناوە بە (پۆلی یەکەمینی مەنظوومەی زاگرۆس). بێگومان ئەم زاتە لەدوای وردبوونەوەیەکی زانایانەی ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە. کەواتە لەو ناوانەدا هەرچی نەتەوەیەك بووبێت پێویستە بخرێتە ئەم ڕێزەوە وەکو (عیلام) و (سۆمەر)ەکان بێت، جینسی ئەمانە هێشتا ساغ نەبووەتەوە. بەڵام بڕیاری زاناکان لەسەر ئەوەیە کە ئەم دوو نەتەوەیە لەڕەسەنی سپین، چونکو بەشێوەی قیافەت لەوان ئەچنو تێکڕا ئەمانە پێکەوە ژیاون، تەنانەت وڵاتی عیلام لەگەڵ دیاری (کاسای، گۆتی و، لۆللۆ)کانا بەجێگاو ڕێگا لەپاڵ یەکابوون، بەم پێیە ئەبێ گشتیان یەك (مەنظوومە)بن. بە کورتی وا دیارە ئەم عیلامانە لە بتەقەی هەوەڵ عەشایری زاگرۆسن و ئەوەتەی بینراوە ئەمانە پێکەوە بوون. هاتوونەتە جەنووبی بانی (ئێران). سۆمەرەکان یا تیردیەك بوون لەمانو جیابوونەتەوەو چوون بۆ

جـــەنووبی عـــێراق وەیـــا عیلامـــەکان لـــەدوایيا هـــاتوون ســـۆمەرەکانیان دەرپەڕاندووەو خۆیان لەجێی ئەوان لەسەر (کارۆن) دامـەزران، هـەر کامێکیـان ڕاست بێـت مـادده نـاگۆڕێ واتـە لـە ڕەسـەنی سـپییە کۆنـەکانن، چونکـە لـە ٣،٤ هـەزار سـالْ پێش میلادا لەوێبوون کـە (ئـاری)یـەکان هێشـتا نـەهاتوون، زۆر نـەگونجێت عیلامـەکان لەمەوجـەی (ئـاری)یـەکانی یەکـەم بـن. ئـەم عیلامانـــە لەتورەی ڕووباری (کارۆن) و (کەرخا)دا بوون کەوا بریتییە لەسەر زەمینەکانی (لوڕستان) فارسو پشت کێوو بەختیاری ئێستا.

لە مێژووی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیکی کۆنا ئەم عیلامانـە ناوبـانگدارن، لەگـەلْ (سـۆمەر)ەکـان هـاودەور بـــوون. ئـــەوەندە هەیـــە وەك ســـۆمەرەکان پێشکەوتوو نـەبوون. لەگـەلْ (ئـاژەلْ)دا زۆر خـەریکبوون، لـەناو شـاخ و دۆڵـــی وڵاتەکـەیانا بـــەرەوە حـــەیواناتیان ڕا نـــەگرت و بـــەدەم ئەوەشـــەوە لەگـــەلْ کشتوکاڵکردنیا خەریك ئەبوون. نەتەوەیەکی درو بەهێزو جەنگیبوون، لەگـەلْ (سۆمەر)ەکانـا زۆر بەشـەڕ هاتوون. گەلـێ جار (سـۆمەر)و (ئەکـەد) لـەناکاو داویانە بەسەریانا، شاری (بابل)و گەلێك شـاری تریشیان داگیرکردوون و هـەتا بەینێکیش لە ژێـر حوکمیانـا ماوەتـەوە، بەڵام شـەڕ هـەر دەوامیکـردووە هـەتا عیلامەکان شکاون و دەرکراونەتەوە ناو کەژەکانی وڵاتـی خۆیـان. هـەتا نـاکۆکی نەکەوتووەتە ناوخۆیان حاڵیان زۆرچاکبووە، مەملەکـەتیان نـاوەدان و ئەهلەکـە بـە ناسـوودەگی ژیـاوە، شـارەکانیان ڕازاوەو ڕێکوپێکبـووە. پایتـەخت شـاری بـەناوبانگی (سـووز) وە یـا (شەوشـەن) بـوو. ئـەم شـارە لـە پێدەشـتیدا لەسـەر ڕووباری (کارون) نزیـك تێکـەڵبوونی بـە (دەریـا) دروستبووبوو. بەتالآنی وڵاتـی (سۆمەر)و (بابل)ئەم پایتەختەیان ڕازاندووەتەوە. کۆشـك و سـەرای بـەرزی تیـا کرابوو. (پادەشتی - پادشاد) کانیان لەوێدا ڕایان ئـەبوارد. بەکورتی عیلام لـە (٢/٣٠٠) سـالْ زیـاتر سـەربەخۆ ژیـاوەو تـا دوایـی سـالْ ٦٥٠ پ.م لـە ڕەنگـی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا ماوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەمیشە دەستدرێژی ئـەکرد

بۆ سەر عێراق‌و لەو کاتەشا ئاشورییەکان لە عیراقا حوکمیان ڕەوای هەبووەو براوە بوون (ئاشۆر باناپال)ی پادشای ئاشور بەلەشکری قورسەوە داویە بەسەر عیلامـا. سوپای عیلام شکاوە، شاری (سووز)ی جوان لەدوای تالآنکردن وێرانیشکراوە. ئەمجا کیشوەری عیلام هەمووی زەوتبووەو ئەهالی بەیەخسیرگیراوە. لەو کاتەوە عیلام لەناوچووە. ئەگەرچی (سووز - سەوسەن) لەزەمانی فارسەکانا دووبارە ئاوا کراوەتەوە، بەلآم ئەمجارە (شای ئێران) حوکمی تیاکردووە.

## شارستانیەت ( مدنیت )ی عیلام

عیلامەکان لە سۆمەرەکانەوە شارستانیەتی نوسین فێربوون. نوسین بە زمانی خۆیان بووە، هەندێك نوسراویان بەجێماوە. خەتەکەیان لە (بزماریی) ئەچێت، بەلآم هێشتا (حەل) ئەکراوەو نەخوێندراوەتەوە. ئەمانە (بت) پەرستبوون، وایان زانیوە (ڕۆژ)و (مانگ) خوان‌و دەستەدارن، خوایەتی ئەکەن. وا دیارە ئەم عیلامانە کەداموەزگای سیاسییان تێکچوو، ئەیانتوانی جارێکی تر لەولآتەکەیانا ببنەوە بەحاکم، تێکەڵ بە عێل‌و خێلآتی بەهێزی (فورس)و (ماد)بوون کەوا دەمێکبوو بە کۆچ‌و ڕەو هاتبوونە خوارووی ڕۆژاوای (ئێران). ئەمان چاوەڕوانی هەلبوون کە ولآتەکەی عیلام بخەنە ژێرچنگی خۆیانەوەو ببن بەحاکم لەو ناوەدا. کاتێك کە عیلامەکان لێیان قەوماو تووشی هەڵمەتی کوشندەی (ئاشوورییەکان) بوون، سەرداری عێلانی (فورس) ئەمەی بەهەل دانا چنگی خستە نیشوکاری عیلامەوە، خۆشیانبوو بێت یاترش دەستیان گرت بەسەر کاروباریا تا هەتا بۆیان ساغبووەوە، وە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە هەلگێڕانەوەیەکی مێژوویی قەومایەتی نوێکەوتە ئێرانەوە وەك لەمەولا باسی ئەکرێت. لەسەر زەمینی عیلامدا ئەمرۆ تیردو تایەفەی (لوڕ)و (لەك)

دانیشتووه کە هەردووکیان دوو نەتەوەی (کورد)ی پەتین. جا لە باسەکانی دوایی ئەم کتێبەمانا تێ ئەگەین کە ئەم دوو عەشرەتە لەو شوێنەدا چلۆن پەیدابوون.

## ٢-گۆتییەکان:

گەلێك لە رۆژهەلات زان (مستشرق)ەکان بە ئاشکرا ئەڵێن نەتەوەی (گۆتی-کورتی) بنچینەو رەگەزی هەرە کۆنی نەتەوەی کوردە، وە ئەڵێن ئەمانە گەلێك شوێنی زاغرۆسەکانیان بەدەستەوە بووەو حکومەتی وردەڵەی سەربەخۆیان تیا بنیاتناوە. بەپێی وردبوونەوەو موتالای (ئەمین زەکی بەگ) خاوەنی مێژووی (کوردو کوردستان) لە نووسراوی موستەشریقەکان وا دەرئەکەوێ ئەبێ (گۆتییەکان) قەومیکی ئێجگار گەورەی فرە تیرە بووبن وەك: هەندێك لە خوارو ژووری (زێی بچووك)و (ئارارفە - ئارارنجا- کەرکووك)دا بوون. بەشێکیشیان لە جەنووبی ئەوانا بوون، چونکە تێکەلاییەتی نەتەوەی گۆتی لەگەڵ (سۆمەر)و (ئەکەد)و دروستکردنی حکومەت لەناو ئەوانا وایدەرئەخا کە (گۆتییەکان) دوو تاقم بوون: تاقمێکیان لای (سۆمەر)ەکانەوە بووە وەیا لەم کاتەدا لە شیمالی عیلامەکانا لای سنووری ئێستای (عیراق) بوون. کە (ئەکەد)ە سامییەکان هاتوونە شیمالی (سۆمەر)ەکان و لە زەمانی (سارغۆن) و (نارام سین)دا بون بە زۆردارو دەستیان درێژکرد بۆ دەوری خۆیان، گۆتییەکان بزوتوون و کردوویانەتە دوژمنایەتی لەگەڵ (ئەکەد)ەکان. ئەگینا ناگونجێت ئەم (گۆتی) یانە هەر ئەو تاقمە بووبن کە لە ولاتی رووباری (زێی بچووك)و (کەرکووك)ی ئێستادا بوون و ئەوانەلەشکریان کردبێ‌و هاتبن بۆ سەر (سۆمەر)و (ئەکەد)و عیلام، چونکە: ئەگەر دووری ئەم ولاتانە لە یەکتری‌و کەم دەسەلاتی عەشایر بۆ شەڕی دوورو ئەشارەزایی ئەقوامی ئەو کاتە بخەینە بەرچاو، بە ئاسانی دەر ئەکەوێ کە ئەمانە لەبەر دووری رەنگە ئاگاداری

رووداودکەشیان نەبووین. ئینجا هەر ئەوە ڕاستە کە لە کاتی پێشوترا تاقمێکی بەهێز لە گۆتییەکانا هاتوونە لای شیمالی ڕۆژهەلاتی سۆمەرەکان لای چیاکانا (پشتکێو)و دۆلی (کەرخا)و (ئەلۆەند) دامەزراوندوودو لەدوایدا تاویان داوەتە سەرولاتی سۆمەروهەندێکیشیان داگیرکردووە. بەکورتی لەسەدەی ۳۱پ.م دا ئەم عەشرەتە گەلێك زۆرداربووە. سەردارەکەیان کەناوی (ئانتاتۆم) بووە چووە بەگژ عیلاماو لەبەر دەولەمەندییو ئاوەدانی چاوی بڕیوەتە شاری (لاقاش - لەجش) کەوا وێرانەی ئەم شارە ئیستا لای (شەترە)یە لە عێراقاو داگیریکردوومو خۆی ناوناوە (پادشای لاقاش). ئەم سەرکەوتنە ناوبانگی (گۆتی)یەکانی خستوتە مێژووەوە. وەها دیارە ئەمانە لەگەلْ تیرەکانی تری گۆتیدا کەوا لای سەرەوە باسکران لەمەولا پەیوەندییان پەیدا کردوومو هەمیشە لەوانەوە (کۆمەك) یان بۆ هاتووەو بەم تەرحە کە هێزیان سەند، ئەمجا دەسەلاتیان خستووەتە سەر هەموو ولاتی (سۆمەر)، بەلکو یەکیەتی ڕەسەن و ڕەگەزو چۆنیەتی زەمانو خزمایەتی قەومی، ئەم تێکەلییەی ئاسان کردوومو لەبەر ئەوەی سۆمەرەکان لەناو خۆیانا یەك نەبوون یا لە شارەستانیەتیدا لەوان لە پێشتریش بووبن، دیسان ئەم گۆتییانە لەڕووی سیاسەتەوە بەسەر سۆمەرەکانا زالبوون، وە وادیارە گەلێك شەڕبووە لەبەینیانا، چونکە لەسەدەی (۳۱) ەوە تا( ۲۸)ی پ.م ئەم تەقەلاو هەرایە دوایی نەهاتووە. لەم ڕووەوە بەلگەی زانای ئاثارو موستەشریقەکان ئەوەیە ئەلێن لەم عەسرانەدا ناوی تایبەتی (سۆمەر)و (گۆتی) تێکەلاو زمانەکەیانبووە. یەکێك لە پادشاکانی(گۆتی) سەدەی ۲۸ پ.م کەناوی (ئاننۆ باینن) بوو، بۆ ئەوەی یەکیەتییەکی سیاسی گەورەی (گۆتی)و (لۆللۆ) پێکەوە بنێت بەلەشکرەوە چووە سەرو ولاتی (لۆللۆ) ناوچەی (هالمان)ی لێداگیرکردوون کە ئێستا ئەوێ (زەهاوی)ی پێئەلێن. بەم شکستە لۆللۆکان چاوبەرەوژێری گۆتییەکان بوون، (ئاننۆبانینی) بەناوی ئەم سەرکەوتنەوە لێردا واتە لە (زەهاو)دا ئەستوونێکی

(سەرکەوتن) و لەوحەیێکی نوسراوی بۆ یادگاری بەجێهێشتووە. زانای ئاثار ئەمانەی لەم دواییەدا دۆزیوەتەوە لەگەڵ دوو لەوحەی نوسراوەی تر ا کەهی پادشاهەکانی ساسانین. وا دیارە لەدوای ئەم پادشاهە گەورە لە مابەینی (سۆمەر)و (گۆتی)یەکانا ئاگری شەڕ ئەوەندە بڵێسەی سەندووە هەردوولای پێ کزبووە، بۆیە (ئەکەد)ەکان ئەمەیان بە هەل زانیوە پادشاکەیان کەناوی (سارغۆن) بووە بەلەشکرەوە هاتووەتە سەریان. یەکە یەکە هەموو شارەکانی سۆمەری داگیرکردووەو ڕوویکردووەتە بەشە وڵاتەکەی (گۆتی) کە لە (سۆمەر)دا هەیان بوو. (سارغۆن) لەشکری ئەوانیشی شکاندووە لەو ناوەدا دەسەڵاتی گۆتییەکانی نەهێشتووە. بەڵام گۆتییەکانی شیمالی ڕۆژهەڵاتی عێراق لەم (بارەمرچەرخان)ە سڵەمیونەتەوەو کەوتوونەتەخۆکۆکردنەوەی (تۆڵە) سەندنی خزمەکانی جەنووبیان، کەچی لۆللۆکان ئەمەیان بەهەلزانیوەو لە گۆتییەکان جیابوونەتە کە ئەمە بۆهەردوولایان خراپ بوو چونکە (سارغۆن)ی مەلیکی (ئەکەد)و (سۆمەر) بۆ ساغکردنەوەی پاشەڕۆژی حکومەتە تازەکەی بەلەشکری زۆرەوە ڕوویکردووەتە وڵاتی (گۆتی)و (لۆللۆ) چووەتە ناو وڵاتە سەختەکەیانو یەك یەك شەڕی لەگەڵاکردوونو شکاندوونی، وە لە دوای ئەم مەلیکە (نارام سین)ی جێنشینی دیسان بەلەشکری زۆریەوە هاتووەتە سەریان، گشت وڵاتی گۆتیو لۆللۆی داگیرکردووە. ئەم هەرایانە لەدوای سەدەی( ٢٧)ی پ.م ڕوویانداوە. ئەم (نارام سین)ە لەدوای سەرکەوتنی لە (دەربەند)ی گەورەی قەرەداغ، نیشانەی سەرکەوتنی لە ستوونێکی ڕەسم لەسەرکراوی بەجێهێشتووە باسی ئەم شەڕانەی تیا نوسیوە. ئەوەندە هەیە ئەم سەرکەوتنو دەستدرێژی پادشایەتی (ئەکەد)ە لەمە زیاتر درێژەی نەکردووە، چونکە لە ئاخریو ئۆخری پادشاهێتی (نارام سین)دا گۆتییەکان بەلەشکری قورسەوە هەڵیان کوتاوە سەر (ئەکاد)و دووبارە ئەو ناوەیان داگیرکردووەتەوە. بەمە سەرلەنوێ دەورێکی حوکمڕانی تازەی گۆتی لە سۆمەرو ئەکەدا پەیدا بووەتەوە.

بەقسەی موستەشریقەکان ئەم دەورە تازەیە هەتا دوایی سەدەی( ٢٦پ.م) درێژەی کردووەو (گۆدی پادەشی) ناو حوکمدارێکی زۆر بەدەسەلاتیان لێهەڵکەوتووە. وەها دیارە ئەمانە لەبەر بێئیدارەیی هەتا هاتووە هێزیان کەم بووەتەوە ، تاکو لە دەمە دەمی سەدەی( ٢٥ پ.م )دا پادشای شاری (ئۆر)ی سۆمەر کەناوی (ئۆتۆ- هیگال)بوو چووە بەگژیاناو دەوڵەتەکەی لەناوبردوون، . لەسەر ئەمە گۆتییەکان کشاونەتەوە ناو وڵاتە شاخاوییەکەی خۆیانو ئیتر لەدەستو قووەت کەوتوون، لەجێی ئەوان وڵاتی سەربەخۆی وردەڵە پەیدا بووە کە جۆرێ ئیدارەی سیاسی سۆمەرەکان وەهابووە (حکوماتی مودون). وا دیارە (عێلاتی کاسای) کەتا ئەمکاتە بێ ناوونیشان لەناوچەی (لورستان)ی ئێستادا ژیاوە بێدەسەلات بوونی (گۆتی)یەکانیان بەهەلزانیوە لەمەولا پۆلپۆل هاتوونو خزاونەتە ناو ئەرازییەکانی ئەمانەوەو بەرە بەرە تێکەڵ یەکتریبوونو ئیتر لەو ناوەدا ناوی (گۆتی) نەماوە، بەڵکو ناوی (کاسای – کاسی- کێشی) جێگیربووە. ئەوەندە هەیە گۆتییەکانی ناوەندی هەردوو ڕووبارەکەی (سیروان) و (زێی بچووك) کە مەرکەزیان (ئارراپخا - کەرکووك)بووە تووشی ئەم کۆستکەوتنە نەبووەو ناوی گۆتێ لەوێ هەرماوە. لەناوەندی قەڕنی هەژدەمینی پێش میلادا کە عێلاتی (کاسی) هەڵیکوتایە سەر (بابلستان) گۆتییەکانیان لەگەڵبووە. داخی گرانە !! لەدوای ٢٥٠٠ پ.م کە تەئریخی لەناوچوونی حکومەتی (گۆتی)و وڵاتی (سۆمەر)ە، تا ساڵی ١٣٥٠ پ.م لەناو ڕووداوی مێژووی کۆنا ناوی (گۆتی) نییە. بەمەدا وا دیارە ئەم نەتەوە زۆردارە لە جەنگو هەراکانی دواییانا زۆر شپرزە بوونو ئیتر دەسەلاتی سیاسییان هیچ نەماوە. بەپێی ئاثاری دۆزراوە کە ڕەوشتی ڕووداو نیشان ئەدا وەها دیارە کە (گۆتی)یەکانی لە شیمالو لۆللۆکان لەم بەینەدا پێکەوە ژیاون. دەسەلاتیان بەسەرخۆراوای وڵاتی خۆیانا هەبووە کە ئەم ناوچەیە لە پاشدا ئیمپراتۆریەتی ئاشۆری لێپەیدابووە، چونکە ئاشۆرییەکان لەو کاتەدا دەسەلاتیان هێشتا دیاری

نەداودو لەبەر پیتوبەرەکەتی ولاتەکە (گۆتی)و (لۆللۆ)کان حاڵەتی نابووریيان زۆر بەفەڕ بووە، بەڕدوە ناژاڵیان هەبووە، لەبەر ئەوە لە پێشا ئەمان بەسەر ئاشۆرییەکانا زاڵببوون. بۆیە ئەبینین گەلێك ناوی ئەمیرو حاکمانی ئاشۆری کۆن لەناوی (گۆتی)و (لۆللۆ) ئەچێت. لەلایەکی ترەوە کە کاسییەکان زەبرو زەنگیان پەیداکردو حکومەتی کاسی (بابل)یان هێنایە مەیدان، گۆتیو لۆللۆکان بوون بە پشتیوانیان. خوێن یەکییو هاوڕەگەزی یارمەتی ئەم تێکەڵییەی داوە. ئەوەندە هەیە لەسەدەی چواردەهەمی پ.م بەدواوە کە ئاشوورییەکان دەسەلاتو توانایەکی تەواویان پەیداکرد، هەوەڵ نیشیان ئەوە بوو لەگەڵ خەلکی شاخیدا کەوتنە هەراو بگیر، بۆ دەسەلات پەیداکردن بەسەریەکا.

حوکمدارانی (ئاشۆر) لەمکاتەوە، هەڵمەتیان بۆ سەرزەمینی (گۆتی)و (لۆللۆ)بردووە وە دەستیانکردووە بە جیهانگیریی. ئەو کاتەی دراوسێی نزیك ئەم گۆتیو لۆللۆیانە بووە بۆیە بەر هەڵمەتی ئەوەڵ کەوتوون.

لە نوسراوێکی دۆزراوەدا کەهی ساڵی (١٣١٠-١٢٨١ پ.م)ە. مەلیکی ئاشۆر (ئاداد نیراری) ئەڵێت: لەشکرەکانی (کاسی، گۆتی، لۆللۆ، وە سۆباری)م شکاند.

(سەلمانسر)ی یەکەمیش کە لە مێژووی (١٢٨٠ - ١٢٦٠ پ.م)دا حوکمدار بووە، بۆ گۆتییەکان ئەڵێت: ئەم نەتەوە دڕە کە لە گشت قەومان ئازاترە کەلێك شەڕیکردووە لەگەڵما. جا قسەی ئەم کابرایە ئەوەمان پێئەسەلێنێ کە (کورد) لە نەژادیانەوە ناویان بە ئازاییو چالاکی ڕۆیشتووەو ئەم ئازاییە یەکێکە لە مەزایای نەتەوایەتی ئێستاشیانو ئەمە پشتاوپشت لە باوکوباپیریانەوە بە میرات بۆیان بەجێماوە. بەلام ئاشۆرییەکان زۆر زاڵمبوون. لە مێژووی کۆنا جێگا نییە لەشکری ئاشوری پیا ڕۆیشتبێتو وێران نەبووبێ. بەم پێیە ئاشۆرییەکان بەشەڕی دوورو درێژ گۆتییەکانیان پەرێشانکردووە، وەکو یەکێك لە پادشاکانی ئاشۆر وتوویە: (خوینی گۆتی وەك ئاو ڕێژراوە). جا بەم شەڕانە ولاتی گۆتی لەناوچووەو بووەتە پارچەیەك لە کیشوەری ئاشۆر، وە لە دوایدا

دەوڵەتی ئاشۆر بەر هەڵمەتی (ماد) و (کلدان) کەوت. حکومەتە کە بەیەك تەکان لەناوچوو وڵاتی گۆتیو لۆللۆ دەور بوونەوە بۆ میدیەو لەوانیشەوە بۆ دەوڵەتی فارس بۆ (کەیخوسرەو)ی گەورە ساغبوومتەوە.

لە مێژووی کۆنا لە زۆر جێگادا باسی نەتەوەی گۆتیو نیشتمانی گۆتیکراوە، تەنانەت بابلییەکان ئەڵێن (کەشتی)یەکەی حەزرەتی نووح لە دوای (تۆفان) لەسەر شاخی (جوودی) وەستاوە. جا ئەم ناوە هیچ گومانی نییە بەزمانی ساسانییەکان لە باتی (گۆتی) بەکار هێنراوە، واتە: کەشتییەکەی (نوح) لەدوای (تۆفان) لەسەر شاخێك کەناوی (جوودی)یە ڕاوەستاوە کە ئەویش لەوڵاتی (گۆتی)دایە. بەپێی ئەم سەرگوزەشتە مێژووییە ئەبێت ئادەمیزاد جاری دووەم لە وڵاتی (جوودی - گۆتی- کوردی)یەوە بەسەر زەمینا بڵاوبووبێتەوە. گۆتییەکان کە وڵاتی (ئاکاد) یان داگیرکردووە زەررو زیانێکی زۆریان لێداوە، پەرێشانیانکردوون، لەبەر ئەوە خەڵکی (ئەکاد) ئەمانە یان بە کێوی (باربار) داناوەو لە مێژووی خۆیانا ناویان بەچاکی نەهێناون، هەرچەندە لە دوای ئەوە کە حاکم بوون بەسەریانا گۆتییەکان لەوانەوە فێری مەدەنیەت واتا شارستانیەتی بوونو لەگەڵ (خوای گۆتی)دا (خوای ئەکەد)یش یان پەرستووەو چوونە سەر بڕوای ئەکەدەکان، بەڵام ئەم تێکەڵبوونو شارستانییە نرخو قەدری زیادی بە گۆتییەکان نەداوە، بگرە هەروەك جاران بەچاوی (بێگانە) و ئینسانی زاڵم تەماشایانکراوە، چونکو گۆتییەکان خەڵقی شاخو ئەکەدەکان دەشتەکانیبوون، زمانیشیان جیاواز بووە بۆیە پێکەوە نەلکاون. حاڵەتی کۆمەڵایەتیو مەدەنیەتی (گۆتی زوورو - شیمال لەگەڵ لۆللۆکانا) چوون یەکە، لەبەر ئەوە لە باسی لۆللۆدا پێکەوە باسکراوە[١٢].

---

[١٢] ئەم باسە لە مێژووەکانی ئەمین زەکی بەگ بەرهەم هاتوون.

٣-لۆللۆکان: گۆتییەکان‌و لۆللۆکان دوو نەتەوەن کە خوێنیان تێکەڵ خوێنی (کورد) بووە، بەڵام داخەکەم بە تەواوی نەزانراوە کە ئەمانە کەی‌و چۆن‌و لەکوێوە هاتوونەتە کوردستان؟. ئەم دوو تیرە (قەوم) مەنظومەی زاگرۆسە مێژوویان تێکەڵاوە، وە لەبەر ئەوەی لە دەستوەقامی خۆیانەوە نوسراو بەجێنەماوە، حاڵەتی مێژوویيان زۆر ناتەواوەو بە بۆنەی ڕوداوو تێکەڵییان لەگەڵ دراوسێ نەتەوەی ترا کە لەمێژووی خۆیانا ناویانبردوون گونجاوە دەرحەق ئەمانە زانستییەك پەیدا بکرێت وەکو:

ئەمانە هاودەوری (سۆمەر)و (ئەکاد) بوون‌و دراوسێشیانبوون. لەگەڵ ئەوەدا هەمیشە بەگژ یەکاچوون. جا بەو بۆنەیەوە لە مێژووی خۆیانا باسیانکردوون‌و لە مانەوە ئەوەش زانراوە کە (گۆتی)و (لۆللۆ)کان لە پێش (کاسی)یەکانا بە خۆیانا هاتوون‌و شارستانی بوون‌و دەسەڵاتیان پەیداکردووە. لۆللۆکان لەشیمالی کاسییەکانا بوون، لە (سلێمانی، شارەزوور، زەهاو)ی ئێستا، واتە لە مابەینی ڕووبارەکانی (زێی بچوك، سیروان، ئەڵوەند) دا ژیاون کە ئەم شوێنانە ئێستا سەدی سەد (کوردستان)ە. مەڵبەندی (زەهاو) ئەو حەلە ناوی (هەڵمان - نارمان) بووە، لەکاتی ئیسلامیەتیشا (حەلوان) یان پێوتووە، ڕەنگە ناوی (هەورامان) لەم ناوانە پەیدا بووبێت. وڵاتی (سولەیمانی)یش ئەوحەلە (زاموا)ی ناوبووە وە یا ئاشۆرییەکان وەهایان پێوتووە. لەو شتانەوە کە بۆمان بەجێماوەو لە موتاڵای موستەشریقەکانیشەوە دەربارەی سەرگوزشتەی تەئریخی لۆللۆکان هێشتا شتێکی تەواو ساغ نەکراوەتەوە. لەوتەی ئەمانە وەها دەرئەکەوێ ئەوحەلە (سۆمەر)ەکان جەنووبی عێراقیان ناوا کردووەتەوە (لۆللۆ)و (گۆتی)یەکانیش حوکمڕانی وڵاتی خۆیانبوون. لەدەوری سێ هەزار ساڵ پێش میلادا ئەمان لە هەرەتی گوڕو هێزیانا بوون. ئەمەش بەوە دیارە کە لە مێژووی سیاسی (سۆمەر)و (ئەکەد)ی ئەو دەورەدا ناوی ئەمان زۆرهێنراوە، وە لەگەڵیانا خەریکی زەرمە زلێی دوورودرێژبوون. ئەڵێی (سۆمەر)و (گۆتی)و

(لۆللۆ)کان خزمایەتی نەتەوەی یەکتریان خوێندۆتەوە، بۆیە کە (ئەکەد)ی سامی زاڵبووە بەسەر (سۆمەر)ەکانا، گۆتیو لۆللۆکان کەوتوونەتە لاشەوەو لەگەڵ (سارۆن)و (نارام سین) ناو پادشا بەناوبانگەکانی (ئەکەد) دا گەلێك جەنگاون...زاناکان ئەڵێن مەرکەزی حکومەتی لۆللۆ شاری (زیمری)و پرۆفسۆر (سوپای زەر)یش ئەڵێت (ئەراکدی)بووە. ئەم شارانە لەولاتی (سولەیمانی)ی ئێستادا بوون، بەلام شوێنەکانیان نەزانراوە. بەوەدا کە (ئاننۆبانینی) ناو پادشای ئازای گۆتی بە لەشکرەوە هاتووەتە سەر لۆللۆو (زەهاو) بەشەڕ لێی سەندوون لەسەدەی( ٢٨ پ.م) دا. ئەبێ لەم دەورەدا لۆللۆ کەوتبنە ژێر چەپۆکی گۆتییەکانەوە دووبارە ئازادو سەربەخۆ بوونەتەوە، ئەوەندە هەیە جیابوونەوەی ئەم دوو قەومە لەیەکتری بۆ هەردوولا بووەتەخراپە. چونکە لەم بەینەدا (ئەکەد)ە سامییەکان ولاتی (سۆمەر)یان کەداگیرکردووە بایان داوەتەوە سەر گۆتییەکانو ئەوانیشیان شکاندووە. پادشای (ئەکەد) سارگۆنی گەورە لای زەهاوەوە لەسەر شکستەی ئەمانە ڕۆیوەو، چووەتە ولاتی (لۆللۆ)شەوە تاکو (هەڵەبجە)ی ئێستای مالیوەو لەوێ شاری (هار هار)ی زەوتکردووە، وە ئەبێت لۆللۆکان هەر بەمتۆزە زیانە لە مەینەتی شەڕ ڕزگار بووبن، بەڵکو (نارم سین)ی مەلیکی ئازای ئەکەدیش لە ئاخریو ئۆخری سەدەی (٢٧ پ.م)دا بەلەشکری زۆریەوە هاتووەتە سەریانو شکاندوونیو خستوونیەتە ژێرحوکمی خۆیەوە. (نارام سین )ئەم شەڕو سەرکەوتنی خۆیەی لەسەر لەوحەیەکی بەردین بەخەتی سۆمەریی نوسیوە وەك لای سەرەوە نوسراوە لە باسی گۆتیدا. خەلکی قەرەداغ بەم ڕەسمە ئەڵێن (نیشانەی گاور کرد). ئیتر لەدوای ئەم زانستییانە باسی ولاتی (لۆللۆ) لە مێژوودا ونە. وا دیارە قەومەکە بەم شەڕە کزبووە، هەرچەندە گۆتییەکان لەمەودوا تاویان داوەتەوە ... ئەکەدو داگیریانکردووەو بەمە لۆللۆکانیش لە یەخسیری ڕزگاربوون، بەلام هەراکانی پێشوو لۆللۆی ئەوەندە بێ هێزکردبوو بەمجۆرە یارمەتییانە

نەهاتوونـە سـەر خۆیـان، بـەڵکو کەوتوونـە ژێردەسـەڵاتی گۆتییـەکانی خزمیانەوەو جارێکی تر توانای سیاسییان نەژیاوەتـەوە هـەتا سـەدەی ١٩ یـەمی پ.م ئەو کاتە خوێنێکی تازەی گیاندار، هاتوومەتە لەشیان بۆ (ئازادی) کەوتنەوە تەقـەلادان، ئـەمجارە گۆتییـەکانی لای (زێـی بچـووك - ئارانجـا- کـەرکووك) کەوتوونەتـە ژێردەسـتی ئـەمان، وە تابـەینێك هـەردولا حوکمیـان بەسـەر ئاشۆرییەکانیشاکردووە. تەنانەت هەندێك لەزاناکان وەها ئەزانن کە ئەمانە لەگەڵ ئاشۆرییە سامییەکان لێرەدا تێکەڵاوی یەکتری بوون، بـەڵام بـەناوی (ئاشۆری)یەوە. ئـەو کاتە هێشتا نەهاتوونەتـە مـەیدانی سیاسـەتەوە. لـە (١٣١٠ پ.م) بەدواوە حوکمدارانـی ئاشـور باسـی ئـەو جەنگانە ئەگێڕنـەوە کە لەگەڵ (لۆللۆ)کاندا کردویانە. لەمانە سێ شەڕیان کە (ئاشۆر ناسرپاڵ) کردویـەتی زۆر گرنگە. یەکەم شەڕ لە (٨٨٤ەوە تا ٨٦٠ پ.م)ی پێچووە. پادشـای ئاشـور ئـەڵێت: لەبەر یاخیگەریی لۆلۆکان لە شکری ئاشۆر چووەتە سەریانووڵاتی (زاموا)، واتە (وڵاتی سولەیمانی)ی ئێستا، گیراوە لە دوای سێ‌جەنگ، لە پێشا لە (دەربەند)ی بازیـاندا قورس بـووە تـا دیـوی (سـورداش) داگیرکراوە، لەشکری ئاشـور جـاری دووەم ناوچـەی (سـورداش)و (سـولەیمانی)و هـەموو شـارەزوور تـا سـیروانی داگیرکردووە. لێرەدا ئاشۆرییەکان ناوی ٢٥ شار ئەڵێن کەوا لەم وڵاتە ئاوەدانەدا داگیریـانکردووە، بـەڵام: پادشای لۆللۆ (ئامیخا) ئەبـەزیوە لەقـەڵای (تیسـیر)دا لەسەرشـەڕ ڕۆییـوە. لـە جـەنگی سـێهەما لەشـکری ئاشـور ڕویکردووەتـە (پێنجوێـن)ی ئێسـتا. لـە کـەژی (ئاڵپـارێز)دا لەشـکری زامواییـەکان لـەدوای جەنگێکی مەردانە شکاوەو ئاشۆرییەکان تا (مەریوان) لەسەر شکستە ڕۆییون. لەم شەڕانەدا لەشکری ئاشور بەهەڵمەتی زاڵمانە کوشتاری زۆری لەخەڵکی ئـەو ناوە کردووە، لەسەرئەوەشا لۆللۆکان لەسەرشەڕ هەر لەدەواما بوون تاشـارەکانی شاربازێڕو هەورامان گیراوە، ئەوسا شەڕ کۆتـایی هـاتووە، پێش ئـەم شـەڕانە وڵاتـی (لۆللـۆ) زۆر ئـاوەدانبووە. ئـەو شـارە زۆرانـەی ئاشـۆرییەکان داگیریـان

کردووەو ناویان نوسیون پێویست نییە ئێمە لێرەدا ناوەکانیان یاد بکەین، نیشانەیە بۆ ناوەدانی وڵاتەکە. پادشای ئاشور (ئەستوونی سەرکەوتن)ی ئەم جەنگانەی لەسەرای (نەینەوا)دا بەرەسمەوە نیشانداوە، بەڵام لۆللۆکان رامو بێدەنگ نەبوون، تا پەیدابوونی (ماد)ەکان جاروبار یاخی نەبوونو بەگژ لەشکری ئاشورا نەچوون بۆنەوەی ئازادیی جاران بگرنەوە باوەش!! وە کە (ماد)ەکان هاتوون، لەشکری ئاشۆر بەسەر ئەمانا تێپەڕیوەو چووە بۆ سەر مادەکان، جا وڵاتی لۆللۆ بەم بۆنەیەشەوە زۆر وێران بووە، تەنانەت لەدوای کزبوونی ئاشۆرییەکانیش (لۆللۆ) نەیتوانیوە جارێکیتر بجووڵێتەوە، بەڵکو لەشکری (ماد) کە چووە بۆسەر (نەینەوا)ی پایتەختی ئاشۆرییەکان. فۆڵێکی ئەم لەشکرە بەوڵاتی لۆللۆدا رۆیشتووە ، لە٦١٢ ی پ.م دا لەدوای لەناوچوونی دەوڵەتی ئاشۆر لەلایەن (ماد)ەکانەوە وڵاتی لۆللۆ دەور بووەتەوە بۆ دەوڵەتی تازەی ماد. لە مێژووی ٥٥٨ پ.م دا کە (کەیخوسرەو)ی گەورە دەستیکرد بە جیهانگیری، ئەم وڵاتەشی داگیرکردووە، ئەوسا لە ڕووباری (دیجلە)وە تا سنووری ئێستای ئێران گشت سەرزەمینەکانی مابەینی ڕووباری (سیروان)و (زێی بچووك) کە بۆ ئیدارەکردن دابەشبووە لە دەوڵەتە تازەکەی کەیخوسرەوا ناوی بووەتە وڵاتی (گۆتۆ - کوردۆ). ئیتر ناوی (لۆللۆ) نەماوە.

### مەدەنیەتی لۆللۆو گۆتی

هەرچەندە گۆتیو لۆللۆکان مێژوویەکی سەربەخۆیان بۆمان بەجێنەهێشتووە ناوو کردەوەی ئەم دوو نەتەوە کۆنە لە مێژووی (سۆمەر)و (ئەکەد)و (ئاشۆر)دا نوسراوەو لە مێژووەکانی ئەوانا حاڵەتی ئیدارەو کردگاری قەومییان لەگەڵێك جێگادا بە بۆنەی (مەبەست)ی خۆیان کە لەگەڵیانا ڕووداویان بووە بۆیان نووسیون، وەها دەرنەکەوێت کە گۆتیو لۆللۆکان لە ئەقوامی کێوی نەبوون، بەڵکو لەمەدەنیەتا بەپێی حاڵەتی ئەوحەلە

پێشکەوتوو بون. بەهەزاران ساڵ لە پێش میلادەوە حوکمو دەسەڵاتیان هەبووە لە وڵاتی خۆیانا، سەربەخۆیی خۆیان پاراستوومو بۆ ڕاگرتنی کەیانی خۆیان گیانیان بەختکردووە، کەمو زۆر ئیدارەی حکومەتی مەدەنیو عەشایەرییان هەبووە، چونکو وڵاتەکەیان ئاواو دەوڵەمەند بووە، پادشاکانی ئاشور شاهیدی مەدەنیەتی ئەمانن. ئاشور (ئاسرپاڵ)ی پادشای ئاشۆر بۆ خاتری شارەکانی ئاسۆریە نوێو ئاوا بکاتەوە، بە کۆمەڵ وەستاو سەنعەتکاری لۆللۆکانی بردووە بۆ ئاسۆریە، بێجگە لەمە بوونی ئەو هەموو قەڵاو شاری لۆللۆیە کە پادشاکانی ئاشۆر باسیانکردووە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەمانە دوو میللەتی مەدەنیو بەکەڵك بونو بەقابیلیەتی ئێستای وڵاتەکەشا گومان نییە کە ئەمە ڕاستە. چونکە سامانی ئەم وڵاتە ئەوەندە زۆرە گومان نامێنێت کەبوو بێتە هۆی پێشکەوتنی لۆللۆکانی ئەو کاتە. بەکردەوە کانیانا دیارە ئەم ئەتەوەیە (بێوەی) بووەو، وەزنی نەبووە. موستەشرقین ئەڵێن لۆللۆو گۆتییەکان لەیەکچوومو هەردوو زمانەکەش چووەتەوە سەر زمانی (عیلام)، بەڵام ئەمجۆرە موتالاو تاقیکردنەوەیە لەلایەن زاناکانەوە هێشتا (پەیوەندی) تیا نییە.

گەلێك لە موستەشریقەکان بەوڵاتی (سلێمانی)ی ئێستادا گەڕاون، هەموویان ئەڵێن وێرانەی کۆن لەم وڵاتەدا زۆرە، بەڵام پێویستە دەرخرێو (کەش) بگرێن. (پەی کوڵی) جێگا (بتخانە)ی کۆنە. لە (هۆرێنو شێخان) شتی بەجێماوی کۆن زۆر هەیە. هەندێك لە جولەکەکانی (بابل) کە (ئەبۆخذنەصر) بەدیل هێنابوونی بۆ عێراق لە (زەهاو) بوون تا (کەیخوسرەو) لەوێ ئازادیکردن. قەڵای (شەمێران)و (شیروانە)و ئاثارەکانی(سرۆچك)و گردۆڵکەکانی (شارەزوور)و خەزێنەی داپۆشراوی ئاثار (نیشانە)ی کۆنن. شاری (شارەزوور)و (نیم ڕاە) لەدەوری (ساسانی)دا شاری هەرە بەناوبانگی توورەی شارەزوور بوون. ڕێگای (ئاتەشکەدە)ی موقەددەسی (شیز) کە لەمەداین (ختی سیفوون)دوە ئەهات بەمشارانەدا تێپەڕئەبوو. ئەگونجێت ئەم شارانە لەکاتی

(لۆللۆ) کانیشا ئاوا بووبن و لەوانەوە بەجێمابن، ئەشێت ئاثار (نیشانە)ی ئەو دەورانە لە ژێرگڵدا هێشتا مابێت تاقیبکرێتەوە دەرئەکەوێ، جێگا قەڵاو وێرانە کۆنەکان کە لە (ئاراپخا)و (زاموا)دا هەن نیشانەی ئاوەدانی کۆنی ئەم وڵاتانەن. بەپێی ئەو دەسەڵاتو زیندەگییە کە مێژوو بۆی نوسیون ئەبێت لەناو ئەم نیشانانەدا (ئاثار) بەشی لۆللۆکان هەبێت. ئەو لۆللۆانە کەئەمتەوە بێ خێرەکەی نیستایان تەنانەت ناوی ناوئاساییەکەیان نازانن و یادیان ناکەن.

٤-(کاسی کێشی)یەکان: ئەمتەوەی (کاسی) تیرەیەکی زۆر بەهێز بووە لە میللەتە کۆنەکان. نیشتمانی میللییان کیشوەری (کرماشان)و (لوڕستان)ی ئێستا بووە.سامییەکان پێیان وتوون (کاشی – کێشی- کۆشۆ)و جوولەکەکانیش لە نوسراوی خۆیانا بە(کۆشی) ناویانبردوون. بەڵام زانایانی ئاثار بەوتەی (کاسی -- کاسای) ناویان خوێندونەتەوە. گومان نییە ئەمانەش خزمی عیلام و گۆتییەکانن کە باسمانکردن، وە لە تاقمە عێلی کۆچەری پێشوون کە هاتوونە ڕۆژاوای ئێران و نزیك عیلام و گۆتییەکان دانیشتوون. (لای ئێمە وەهایە کە دەستەتە عێلاتی ئاریی کۆنن). ئەو کاتانە کە (سۆمەر)و (عیلام)و (گۆتی)یەکان لە برەوا بوون ئەمانە هێشتا هیچ نەبوون. ئەوەندە هەیە ئەمانە (واتە کاسییەکان) ئەو حەلە لە ناواییەکانی خۆیانا خەریکی کشتوکاڵ بوون، لەگەڵ ئەوەشا چونکە وڵاتەکەیان پووش و پاوەندار بوو، کۆچەرێتییان پێخۆشبوو، بەگەلە ئاژاڵو ڕەشەوڵاخیشیان بەخێوکردووە. لای ڕۆژاوایانەوە لەگەڵ قەومەکانی لای سەرەوەدا تێکەڵی و ئاموشۆیان هەبووە. لەبەر ئەوەی دراوسێکانیان لەوان (مەدەنی) تربوون کاسییەکان لەوانەوە نوسینوخوێندن فێربوون و لە شارستانێتیشا پێشکەوتوون. کاتێك کە گۆتییەکانی جەنووب شکستیان هێناو گەڕانەوە ناو کەژەکانی (بێستوون)و (ئەلوەند) کاسییەکان ئەوەیان بەهەل زانی و دەسەڵاتیان نواندووە بەسەر گۆتییەکانا سوارەیان بوون، ئەمجا لەگەڵ (بابل)یشا کەوتوونەتە تەماسەوە تەنانەت لە مێژووی ١٩٧٧ پ.م بەدواوە واتە لەکاتی (عەمووری)یەکانی (بابل)دا ئەم کاسییانە کە هەستی دەسەڵاتداری خۆیانیانکرد، دەسیانکرد بە شێواندنی وڵاتی (بابل)ی حەموڕابی. وا ڕێکەوتووە لەو بەینەدا (هیتیت)ەکانی (ئەنادۆڵ) وەك لافاو هوروژمیانکردووەتە وڵاتی (جەزیرە)و (عیراق) هەتا بابلستان ڕایانماڵیوە. بەمە خانەدانی (حاموڕابی) لەناوچووە. لەدوای تالانکردنی ئەو ناوە

(هیتیت)ەکان گەڕاونەتەوە. جا لەمەولا لەبەر بێحکومەتی، عێراق تووشی پاشا گەردانیبووە، ئەمەش بە طەبیعەتی حالْ مەبەستی کاسییەکانی پێکهێناوەو دەسیانکردووە بە داگیرکردنی (بابلستان).

## دەوری بەرز بوونەوەی کاسی

لەساڵێ ١٧٩٠ پێ.م بەدواوە نەتەوەی (کاسی) ناوی بەرز بووەتەوە. لەم کاتەدا سەردارێکیان کەناوی (غاندیش)بووە بەلەشکرێکی زۆرەوە چووە بابلستانی داگیرکردووە. لەم شەڕانەدا سوپای (گۆتی)و (لۆللۆ)ی خزمیشیان لەگەڵبووە. ئەم سەرداره جارێ دەستی نەبردووە بۆ ولاتی سۆمەر کە لە جەنووبی (بابل)دا بوو، ئەگەرچی سۆمەرەکان ئەو زەبرو زەنگەی جارانیان نەمابوو بەلام لە سیاسەتا هێشتا وریاو زیندوو بوون.ئەوەندە هەیە کاسییەکان لەدوای ساغکردنەوەی داگیرکردنی بابل ئەمجا ڕویانکردووەتە جەنوبو چونەتە سەر سۆمەرەکان دەسیانکردووە بەداگیرکردنی ولاتو شارەکانی ئەوانیش. تەنانەت یەك قەلایان مابوو لەسەر (خەلیجی فارسی) ئەویشیان لە ساڵی( ١٧١٠ پ .م )دا زەوتکرد. بەمە مێژووی سۆمەر پێچراوەتەوە. ئیتر ئەم نەتەوە بەرزو بەمەعریفەتە ناوی لە مێژوودا نەماوە. بەدبەختی گەورە ئەوەیە کە (زمانەکەشیان) لەناوچووە، هەر قەشەکان زانیویانە تابەینێکی تریش کتێبی (ئایینی)ی سۆمەر بخوێننەوە. ئەوسا هەموو ولاتی بابلو کاسیو گۆتیو لۆللۆ لە ژێر سایەی تەختی پادشای کاسیدا بووەتە یەك (دەوڵەت)، وە لەم مێژووەوە پادشاکانی کاسی عینوانی (کاردۆنیاش)یان دراوەتێ، ئەمەش بەزمانی کاسی ناوبانگێکی موقەدەسو پیرۆز بووە[١٣]. لەم کاتەوە تا ساڵی ١١٨٠ پ.م واتا نزیکی شەش سەد ساڵ ئەم کاسییانە بە دەسەلاتداریو زەبرو زەنگەوە لە عێراقا فەرمانڕەواییانکردووە. پادشای هەرە بەناوبانگیان (ئاکووم کاکریم) ناو بووە. ئەم پادشایە هەتا لای سوریەی زەوتکردووەو (هیتیت)ەکانی شکاندووە. تەنانەت ئەو بتانەشی لێسەندوونەوە کەوا ئەمانە لەوە پێش لە تالانیی بابلدا بردوویانە. کە کاسییەکان بتەکانیان هێناوەتەوە بابل، میللەتەکە

---

[١٣] ڕەنگە ئەم ناوە عینوان وەیا ناوی خوایەکی زۆر کۆنیان بوو بێتو لەدواییدا کرابێت بە ناوی ئینسانێ.

زۆر پێخۆشحاڵبووه. داخی گرانم لەدوای ئەم ناوداریو دەسەڵات بەرزییە کە کاسییەکان بەهێزو دەسەلاتی میللی خۆیان پێکیانهێنابوو تا سەردەمێك لە مێژوودا ناویان نییەو ئاثاریان ونە. کەچی لە (١٤٥٠پ.م )دا دیسان ناویان پەیدا نەبێتەوە لەم کاتەدا پادشایەکیان کە (کارانێنداش)ی ناو بووە زۆر بەناوبانگە. مێژونووسەکان ئەڵێن کەلاوەی (عەقرقوف) جێگا شاری کاسییەکانە لای رۆژاوای (بەغدا)..وە لەسەدەی (١٤٠٠ پ.م) دا حوکمدارێکی کاسی بنیاتی ناوە تەنانەت زانایانی ئاثار لەم (عەقرقوف)ەدا گەلێك شتومەکی کاسییەکانیان دۆزیوەتەوە، بەلام هێشتا باسیان لەوە نەکردووە.

### دەوری نشوست

بە بۆنەی دەسەلات پەیداکردنی ئاشۆرییەکان لە شیمالی عیراقا، وادیارە هێزی کاسییەکان رووی کردووەتە کزی. یەکێك لە پادشاکانی کاسی لە دوای ساڵی ١٣٥٠ پ.م چووەتە سەر عیلام، ولاتەکەی داگیرکردووەو شاری (سوز)یشی گرتووە، بەلام بەرامبەر هەڵمەتی ئاشۆرییەکان سوپای کاسی لە تاوانا گەڕاوەتەوە. ئەم نشوستە بۆ کاسییەکان بووەتە (لێقەومان). لەمەولا حکومەتی کاسی بابل بەدەس نارەحەتیی ناوخۆیانو شەڕو هەرای سوپای ئاشۆرییەوە هەمیشە لە مەترسیدا بووە. لەم دەوری مەینەتییەدا لەخوارووی رۆژهەلاتەوە عیلامەکانیش هاتوونەتە سەریان، وەسامیەکانی ناوخۆشیان لێیان هەڵساونەتە سەرپێ، لە بەرئەوەی سامیەکان هەموو کاتێك کاسییەکانیان بە بێگانە داناوە. هەر کە هێزی حکومەتی مەرکەزی بەشەڕو هەرای لاوەکی هاتوونە کزبوون، ئەم سامییانە دەسیانکردووە بە یاخیگەری. ئەنجامی کار لە دەوری (١١٨٠پ.م) دا بەهەرایەکی ناوخۆ حکومەتی کاسی بەیەکجاری لەناو چووە. لە عێراقا کە حوکمی (کاسی) نەما، سامییەکان جێگایان بەکاسییە لێ قەوماوەکان تالکرد کە بە هۆی حاکمیەتییانەوە هاتبوونە (بابلستان). لەسەر ئەوە ئەوی توانیویە ولاتی بەجێهێشتووەو رۆیشتووەتەوە بۆ نیشتمانی کۆن بۆناو کەژو کێوەکەی رۆژهەلاتی عێراق لای خزمەکانیان.

بەلام یەکی ئەوەیان کەوتووە کە بتوانن جارێکیتر بچنەوە سەر بابلستان. وا دەرئەکەوێ لەمەولا ئینجا عیلامەکان بزوتنەوەو جنگیان بردووە بۆ سەر

کاسییەکان، بەلاّم هێزو هێرشی ئاشوّرییەکان مەیدانی نەداوە بە هیچ لایەکیان. سوپای ئاشوّرهاتووەتە سەر ئەو ناوەو گشتی داگیرکردووە، هیچ نەتەوەیەك نەما بتوانێ (کەیان)و سەربەخوّیی خوّی بپارێزێت. لەدوای ئەم ئینقیلاباتە ئەگەرچی کاسییەکان دەسەلاّتیان نەمابوو، بەلاّم ناویان مابوو. زوّری پێ نەچووە (ماد)و (فورس)و (کاردوّخوّ) کان هاتوون، لە دەوری ئەمانا تەنانەت هەتا دەوری(ئەسکەندەر)یگەورەش ناوی کاسییەکان هەرماوە.بەوتەی زاناکان وادیارە ناوی (کاسی) تا دوای میلادی (عیسا)یش هەرماوە لەوەولا ون بووەو ئەڵێن لە جێی ئەوان ئەمجا ناوی (لوڕ) پەیدا بووە، ئەگونجێت لوڕەکان تیرەیەکبووبن لە نەتەوەی (کاسی)، کە عیلامو کاسییەکان کزبوون ئەمجا ئەم (لوڕ)انە دەرکەوتوون، وە لە دواییشا ناویان (واتە ناوی لوڕ) بڕاوە بەسەر عەشرەتەکانی ئەوناوەدا. لەلایەکی ترەوە سەرەڕای ئەم رووداوو ئینقیلابانە کە ئەقوامی (ئاری) پەیدا بووەو هاتووە بوّلای ڕوّژاوای بانی (ئێران) و ئەو ناوەی هەموو داگیرکردووە. پاش ماوەی (عیلام)و (کاسی)یەکانی لای سەروو کە لەبەر ڕووداوی دوورو درێژی کوّن زوّرپەرێشانبوون، ئەمجا بەرەنگاری ئەم عەشایەرە تازە جیهانگیرانە بوون. لەبەر ئەوە نەیانتوانیوە خوّیان بگرن لە بەریانا، بوّیە تەسلیمیان بوون، ئەگەرچی پاشماوەکانی (عیلام)و (کاسی)ی لای سەروو ئەو کاتە لەڕووی سیاسەتەوە بە هیچ نەئەچوون، بەلاّم لە ڕووی کوّمەلاّیەتییەوە کوّن و تازە گشت ئەو نەتەوانە بەدرێژایی زەمان تێکەلاّو یەکبوون، تیرەوتایەفەی تازەو ناوونیشانی نوێ لەو ناوەدا پەیدابووە. (لوڕ، لەك، فەیلی، وە بەختیاری)یەکان لە دوای ئەم ناوێتە بوونە ناویان هاتوتە کایەوە.

## مەدەنیەتی کاسییەکان

گشت زاناکـان بڕوایـان وایـە کـە کاسـییەکان لەڕەگـەزی (سـپی) بـوون و زمانیشیان لە زمانی (عیلام) چووە کە ئەم زمانانە بۆنی (ئـاری)یان تیایـە، وە لە نـاوی (خـوا)و (پادشا) کانیانـا ئـەم بـەراوردە بەتـەواوی دیـارە، وە هـەندێك بڕواشیان وەك هـی (هینـدو ئەوروپاییـەکان) وەهایـە، ناییـنیـان (بتپەرسـتی ) بـووە. لای ئەمانـە خـوای هـەرە گـەورە (ڕۆژ) بـووە. کـە بـەیانیان لەسـەر شـاخەکانەوە (ڕۆژ) هەڵئەهات ئەیانپەرست. بـە زمـانی خۆیـان (سـەرپاش)ی ناوبوو، (شاخ) ناوی خوایەکی تریان بـووە، وە لـە دوایـیدا کـە زاڵبـوون بەسـەر بابلستانا بڕوای دینی ئەوانیشیان وەرگرتووە. بەپێی ڕەوشتی خەڵکی ئەو کاتە ئەبوایـە بابلییـەکانیش پادشـای کاسـییەکان بـەخوا بناسـن، چونکـە لـە ژێـر حوکمیانـابوون، کـەچی خـەڵکی (بـابل) ئـەم قـەدرو بزورگییـەیان نـەداوە بـە کاسییەکان بەڵکو بـەچاوی سووك تەماشایانکردوون. دەوری بـەرزی تـەئریخی (کاسی) عیبارەتـە لـەو ٦٠٠ ساڵە کـە لـە عێراقدا حوکمڕانبـوون، لـە ئاسـیای ڕۆژاوای نزیکدا ئـەوەڵجار (وڵاخـی بـەرزە) لای ئـەمان بیـنراوە، کـە چوونـە عێراق‌و بابلییەکان دیویانە سەریان سوڕماوە، وە لەو کاتەدا دەنگ وا بـووە کـە کاسـییەکانیش ئـەم وڵاغـە بەرزانـەیان لەمنەتـەوەکانی ڕۆژهـەڵاتی خۆیانـەوە دەستکەوتووە کە ئەونەتەوانەش (هیندۆ ئەوروپایی) وەیا (ئـاری)یـەکان بـوون کە تازە هاتبوون بە کۆچ‌و ڕەو لە ژوورووی ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە. کاسـییەکان لـە عێراقا هیچ هەوڵی ئەوەیان نەداوە کە نەژادو جنسیەتی ئـەو خەڵکانـە بگۆڕن کە بەسەریانا زاڵبوون‌و کەوتوونە ژێر دەستیانەوەو هـەوڵی ئەوەشیان نـەداوە کە قەومیەتی بابلی بکـەن بـە (کاسـی). کاربەدەستی میری (حکومـەت )ی نـاو خۆیان بەبێ جیاوازی لە بابلییـەکان‌و پیاو مـاقووڵی کاسـییەکان هـەڵبژاردووە چونکە بابلییەکان لە کاسییەکان مەدەنی‌تر بوون، لەوانەوە گەلێ شت‌و گەلـێ

خولق‌و رەوشت فێربوون‌و بە ژن‌و کچ خواستن تێکەڵاویشیان بوون. گەلێک نامەو پەیامی سیاسی‌و بازرگانی لە بەینی پادشاکانی کاسی‌و فیرعەونەکانی میسرا کە بە نووسینی (مسماری)ی بابل و (هیرۆغلفی)ی میسری نووسراون لەناو کەلو پەلو ئاثاری میسرییەکانا لە کەلاوەکانی (تل العمارنە) دا دۆزراوەتەوە لەم دواییەدا، وە ئەوەتە لە مۆزەخانەکانا لە میسر[٩].

٥-نەتەوەی (سۆباری): وەك لە مێژوودا نوسراوە لە کاتی پێش تەئریخەوە گەلێك تیرەخێلاتی (سۆباری) لە وڵاتی (کوردستان)ی ئێستادا ژیاوە. ئەگەرچی مێژووی کۆن ناوی ئەم نەتەوە بەهێزە لە زۆرجێگادا نەبات، بەڵام هیچ کاتێ بەناوی میللەتێکی زۆر گەورەی دەسەڵاتدارو وەیا بۆ ئیدارەیەکی سیاسی بەهێزو بەردەوام ناوی نابات، بەڵکو لەموتاڵای مێژووەکان وا دەرئەکەوێ کە لە کاتی (سۆمەر) و (ئەکەد) دا ناوی (سۆباری) بە وڵاتێك بێژراوە کە لە شیمالی (عیلام) ەوە تاچیای (ئامانۆس) درێژ بووەتەوە. ئەم چیایە کەوتووەتە بەینی (ئەدەنە)و (ئەسکەندەرۆنە)ی ئێستاوە. لەم سەرزەمینەدا لە زەمانی نەزانراوەوە گەلێك جۆرە تیرە (قەوم) دانیشتووە، وە ئەمانە هیچیان لەگەڵ دراوسێ کەیان یەك قسە وەیا (پەیوەندار) نەبووە. بەمەدا وەها دیارە ئەم ناوە زۆر کۆنەو عەشرەتێکی زۆر گەورەی فرە تیرەیە بەم ناوەوە لەم وڵاتە گەورەیەدا دامەزراوە. بەڵام چونکە پەرش‌و بڵاوبوون بۆیان نەلواوەو نەیانتوانیوە حکومەتێك و ئیدارەیەك پێکەوە بنێن. بگرە لە ژێر حوکمی (گۆتی)و (لۆللۆ) کانا بوون و بەینێك لەناو قەومەکانا ناویان هەر بووەو قسەیان لێکراوە، وە زۆریش دوور نییە کە لە بەشە (کوردستان)ی تورکیادا

---

[٩] بۆ زانیاریی زیاتر لەمە تەماشی مێژووی ئەمین زەکی بەگ و (طه) پاشا بکەن.

ئەم ناوە زیاتر مابێتەوە. چونکە لە زەمانی حکومەتی (ئاشوری)دا، هەندێك عەشایری ئەوناوە خۆیان هێشتا بە (سۆباری) داناوە، بۆیە ئاشوریيەکانیش بەو تەرحە ناویانبردوون لە مێژووی خۆیانا. بەمەدا دیارە کە مێژووی سیاسی هەرە کۆنی ئەتەوەی (سۆباری) ونە، تەنیا ئاشورییەکان بە تایبەتی هەر ئەوان ناویانبردوون، وە تەنانەت لەگەڵیانا تووشی شەریش بوون. پادشای ئاشور (تیغلات بایسەر)ی یەکەم لە مێژووی (١٢٠٠- ١١٠٠ پ.م)دا شەری لەگەڵ عەشرەتی سۆباریو پەیوەندی دارانی رەفیقی کە (موشکی) و (کارتی)یەکانبوون – کردووە، وە شاری (شەریش)ی سۆباریيان پێچاوە. مێژووی ئاشوریيەکان ئەڵێت ئەمانە زۆر بەنازایی شەریان ئەکرد لەگەڵمانا. کەچی لەدوای ئەم دەورە لە مێژووی ئاسوریشا ناوی سۆباری بەرە بەرە کوێر بووەتەوەو لە جێگای ئەوان ناوی (ئابری)و (خوری)و (میتانی) باوی سەندووە. زاناکان ئەم سێ تایەفەی بەتیرەی عەشایری ناوداری (سۆباری)دا ئەنێنو دەڵێن: لەمانە نەتەوەی (هوری – خوری) پەیدا بووە لەناوچەی (دواوان – بینالنهرین)دا، وە لە وێدا ژیاوە. لەسەدەی ١٧ هەمی پێش زاینی (میلاد)ەوە میتانییەکان لەناوچەی رووباری (خابوور)و (فورات)ەوە دەسەڵاتیان پەیداکردووەو (ئابری)یەکانیش لە (ئەلجەزیرە)ی ژووروو رۆژاوای گۆمی (وان) دا لەسەدەی ١٢ یەمی پێش زایین بەدواوە خۆیان نواندووە. ئینجا لەبەر ئەوەی بۆ ئەم دوتیرە نەتەوەی (سۆباری) بەشێك زانستی هەیە لە مێژووداو ئەمانەش لەگەڵ رەگەزی ئێستای تورکیادا تێکەڵایەتی یان هەیە، بە پێویست زانرا لەمیانی باسی سۆباریدا چەردەیەك لە مێژووی ئەمانیش بدۆیین.

٦-**ئەتەوەی (میتانی):** ئەگەرچی هەندێك زانا هەن (میتانی)یەکان بەلکێکی (کاسی) دائەنێن، بەڵام دانانیان بە تیرەیەك لە سۆبارییەکانی گونجاوترە، چونکە ئەمانە لە ولاتی سۆباریدا بوون نەك ولاتی (کاسی). لەسەدەی ١٦ هەمینی پێش زایینو ئەمانە لە بەینی موسڵو جرابولی ئێستادا حکومەتێکی بەهێزیان دامەزراندووە. لەو دەورە چوار دەوڵەتی گەورەی وەك (میسر،

هیتیت، کاسیو میتانی) هەبووە. ناوایی هەرە بەناوبانگی میتانییەکان شاری (واشۆغانی) بووە، نیدارمتی ولات لەوێوە کراوە، وە چونکە ناوی سۆباریشیان هەر پێوتووون هەندێك موستەشریق نەلێن ناوی ئەصلی قەومەکە (سۆباری)یەوە (میتانی) لەقەبی خانەدانی حوکمدارمکانیانەوە، وە بەولاتەکەشیان بێژراوە (هانی گالپات) کە لەوحە دۆزراوەکانی کەرکووکیش ئەمە ئەگرێتەوە. لەلایەکی ترەوە میسرییەکان بەم میتاتییانەیان وتووە (تاهاری)، وە لە (تەورات) یشا بە (نەهارام) ناوبراون. ئەگونجێت ناوی (نایری) لە نەهارییەوە هاتبێت. لە ناوەندی سەدەی ١٦ پەمی پێش میلادا حکومەتی (میتانی) زۆر بە دەسەلات بووە، هەتا (کەرکووك)ی نێستایان داگیرکردووە. بەمەدا دیارە لەگەڵ (گۆتی)یەکانیشا بەشەڕهاتوونو بەسەریشیانا زاڵبوون. لە مێژووی ١٨٥٠ پ.م دا فیرعەونی میسر (تەحوتمیش)ی یەکەمی کە هات ناسیا داگیر بکات لە شیمالی سوریەدا میتانییەکانی شکاندووە، بەلام ئەم میتانییانە لە دواییدا بوژاونەوەو ئەمجا ئەمان میسرییەکانیان شکاندووە. لەسەر ئەمە سەردەمێك لە شیمالی سوریەدا هەرخۆیان دەسەلاتداربوون. ئەومندە هەیە دەسرۆییوی تازەیان نەبووە. هەمەدیسان کزبوونەتەوە، چونکە لە مابەینی سێ دەوڵەتی لە خۆی قەوی تری وەك (میسرو هیتیتو ناشۆری)دا بوون. ئەم سێ حکومەتە زلەش ئەو کاتە لەگەڵ یەکا لە ڕقەبەریدا بوون. ناخری کار (هیتیت)ییەکان ناوچەی ڕۆژاوای (فورات)و میسرییەکانیش بەشی (سوریە)یان لێسەندن. مایەوە ولاتە ئەصلییەکەی خۆیان. ئەویش (ئاشۆری)یەکان دەمیان تێژەندو تا سەدەی ٨پ.م گشتیان داگیرکرد. بەمە دەوڵەتی (میتانی) بەتەواوی لەناوچووە.

### *مەدەنیەتی میتانییەکان*

میتانییەکان نەتەوەیەکی (مەدەنی-شارستانی) بوون، نۆسەد ساڵ زیاتر بەهێزو بەناوبانگ حوکمڕانی گەلێك ولاتبوون. لە وێرانەکانی ناوەندی فورات و لەکەرکووك کە سەردەمێك بەدەستیانەوە بووە زۆر شت (ئاثار)یان دەرکەوتووە، لە مێژووی (میسر، هیتیت، وە ئاسوری)یشا زۆر باسیانکراوە. بەپێی ئەم باسانە وادەرکەوتووە کەمیتانییەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەبووە بە خەطی (مسماری) بەو زمانە نوسیویانە. ئەمانە بەڕەسەنو بەڕەگەز لە نەتەوەی (قافقاس)ن و لەسەر ئایینی ئاری کۆن بوون و زمانەکەشیان لە زمانی ئەوان چووە.

٧-<u>نایرییەکان:</u> ئەم قەومە لەناو نەتەوە کۆنەکانا ناوی نییە، بەڵکو لەسەدەی ١٢پ.م بـــەدواوە لـــە مێـــژووی ئاشـــوریدا ناویـــان دەرکـــەوتووە، وە لەگـــەڵ ئاشورییەکانا گەلێك خوێنـی یـەکتریان ڕشتووە. لەسـەرتای مێژووی ئاشوردا باسی سۆبارییەکان هەیـە کـەچی نەتـەوەی دوایی ئـەم ئاشورییانە لـە شـوێن نیشتمانەکەی (سۆباری)دا ناوی نەتەوەی (نایری) ئەبەن و باسـی سۆبارییەکان ناکەن. بەمەدا دەرئەکەوێ کە نایرییـەکان تیرەیـەکی تـازەن. زۆر ئـەگونجێت ئەمانە تیرەیەکی بزێوی سۆبارییەکانی ژووروو بووبن و، بەرەبەرە دەسـەڵاتیان بەسەر گشت تیرەکانی ترا پەیداکردبێ‌و بەئەنجام بەسەر هـەموویانا زاڵبووبـن، ئەوسا ناوی سۆباری نەمابێتو ناوی (نایری) بـەوناوەدا بڵاوبووبێتـەوە. گـەلێك زانـا ئـەم بیرورایـە ئەسـەلمێننو ئەشـڵێن دێـهاتوخێلاتی (نـایری - نـەهری) و (یۆنان) و (شەمدینان) پاشماوەی ئەم نایرییە کۆنانەن.

له دوای پەیدا بوونیان ئەم نایرییانە نەتەوەیـەکی دڕو ئەبەزیان لـێهاتۆتە مەیدان، لەسەدەی( ١٠پ م)دا سـەرزەمینەکانی مابـەینی زێـی گـەورەو ڕووبـاری (دیجلە) لـە ژێرحوکمیانـا بووە. بەڕەوشـتو ڕووداوەکانیانـا وادەرکـەوتووە کـە نیظامی حوکم لەنایریدا ئیدارەی مەرکەزی نـەبووە، بـەڵکو تەرحـە حکومـاتی (وردەڵە)یان لە وڵاتەکەدا پێکەوەناوە لە وێنەی (فیدراڵی) پەیوەندیدا. ئەمانـە هەریەکـە سـەرۆکی خۆیـان هـەبووە. ئاشـورییەکان لەقـەبی (پادشـایی)یـان داوە بەم سەرۆکانە. (تغلات پلایزەر)ی یەکـەمی مـەلیکی ئاشـوری لـە دەشـتی (مـەز گـرد)دا لەگـەڵ لەشـکری ٢٣ پادشـــای نـــایری شـەڕێکی گـەورەی کـــردووەو سەرگوزەشتی ئەم شـەڕەی لەسـەرچاوەی دیجلە لەسـەر ئەسـتوونی سـەرکەوتن (ظەفەر)دا دووروودرێژ نوسیوە. لە وڵاتی نایریدا جێگا نییە لـە شکری ئاشوری پێـدا نەڕۆیشتبێـــتو لەگـەڵ سـوپای نـایریدا تێـك هەڵنـەچووبێت. لەشـکری (ئاشور) بەشـەڕی دوورو درێـژی نایرییـەکان تـەنك بـووە، وە بوومتـە هـۆی کزبوونـی حکومەتەکەشـیان هـەر لـە مێـژووی (١١٠٠)وە تـا (٦٨٠ پ.م) کـە

سەردەمی لەناوچوونی ئاشۆرییەکانە حوکمدارانی ئاشوز یەکە یەکە بەگژ هەموو ئاریییەکانا چوون. ئەم شەڕانە بۆ ئەوە نەکراون کە وڵاتی ئاریی داگیر بکرێت، بەڵکو بۆ ئەوەکراون کەخاکی ئاشۆرلە تاڵانوبڕۆی ئارییەکان ڕزگار بکرێت. کە ئاشۆرییەکان لە ناوچوونو کیشوەرەکەیان بۆ دەوڵەتی (ماد) بەجێما، لە وڵاتی ئاریدا ناوی (کوردۆ ئەن کوردوستان) پەیدابووە، کە ئەمە سەرەتای پەیدابوونی ناوی( کورد)ەو سەرەتای تەطەوراتی دواییەتی. بەمەدا وەها دەرئەکەوێ کە بەشەرە دوا براوەکانی ئاشۆر ئارییەکانیش بێهێز بوون، وە تەنکبوونی ئەمانە بووەتە هۆی پەیدا بوونی عێلوخێڵاتی تازە وەکو (کاردۆخۆ، کوردۆیی، مانای) ناو تیرە عەشرەتەکانی (ماد) ئەمانە ئەم سەردەمەیان بەهەلزانیو هاتنە پێشەوە، لەناوچەی شیمالی ڕۆژاوای ئێرانەوە لەبەر کزبوونی ئاشۆرییەکان بەو ناوەدا بڵاوبوونەتەوە، چونکە تا ئەو حەلە لەبەر هێزی ئاشۆرییەکان ئەم عەشرەتانە نەیانئەتوانی روو بکەنە ڕۆژاوای خۆیان لە ئێران هەروەها لەبەر ئەوەی ئارییەکانیش کزببوون، ئەمانیش توانایان نەمابوو کە تازەهاتووەکان بەرهەڵست بکەن، جا لە بابەت ئەحواڵی ئارییەکانەوە. داخەکەم لەمە زیاتر زانیاری دروست لە مێژوودا مست نەکەوتووە.

## ئەهالی کۆنی ڕۆژهەڵاتی (ئەنەدۆڵ)

لەبەر ئەوەی زۆربەی دانیشتوانی ئێستای ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆڵ) کوردن و ئەمانەش نەتەوەی ئەو قەومانەن کە بە زنجیرەیی لە کۆنەوە لەوێ ژیاون، پێویستە بزانین ئەم نەتەوە کۆنانە چ کارە بوونوچییان بەسەرهاتووە تاکو لە بابەت موتاڵای ئەژادی نەتەوەی کوردی ئەو ناوەوە هیچ باسو ئەحواڵێک پەنهان نەمێنێتەوە. وەکوو مێژوو ئەڵێت لە کۆنەوە لە ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆل)دا گەلێك نەتەوە ژیاوە کەچی لەوانە ئێستا دوو بەشیان نەماوە، چونکە ئەم

ولآتانه سەرەڕێ بوون هەمیشه له ژێر پێخوستی ئەقواما بوون. لەسەرێکەوه له قافقەسەکانەوه هەمەجۆر تیره عەشایری ڕەوەکی نیوه وەحشی وەك لافاو بۆ هاتوومو بووه بەسەرچاوەی خراپه بۆ عالەمی ئەوحەله لەلایەکی تریشەوه لە ئێرانەوه ئەقوام هاتوومو لێرمدا گیریخواردووه هەروەها لە ڕۆژاوای ئەنادۆڵیشەوه بابەته تیرەی جیاواز ڕوویکردوومته ئەوناوه کە یەکێك لەوانه (ئەرمەنی)یەکان بوون. جا چونکه ئەم نەتەوانه هەندێکیان کێوی بوون وەك درندە بەگژیەکا چوون. ئەوانە پایەدارنەبوون لەناوچوون. بێگومان ڕووداوەکانیان ونبووه. هەر ئەو نیشانانه هەیه کە وەك حیکایەت بیستوومانه. وەکو: ناوبانگی کێوی قافو ڕووداوی دروستکردنی سەدی ئەسکەندەری مەقدۆنی له قافقاسو خەبەراتی (ذو القرنین). ئینجا مێژو نووسەکانی ئەمڕۆ ئەڵێن: بۆ بەربەستکردنی هەڵمەتی ئەم عەشایره کێوییانه، سەردارو پادشاهە کۆنەکان زۆر هەوڵو تەقەلایانداوه، مێژونووسی مەزن، وەزیری مەعاریفی پێشووی هیند (ألو الكلام آزاد)له بابەت ئەم سەرگوزەشتانەوه نامیلکەیەکی هەیه لەوێدا دوورو درێژ لەم باسە دواوه[٥]. تومەز دێوو درنجەکانی کێوی قافی زەمانی کۆن که بەحیکایەت باسیان ئەکرد، ئەم عەشایره وەحشییانه بوون که ئەیانوت لە دەربەندەکانی کێوی قافەوه دەرپەڕیونەتەدەرەوەو ولآتە مەدەنییەکانیان ماڵیوه. ئەوه بوو کردەوه وەحشییەکانیان ئەگێڕانەوه. بەکورتی: ئێمە لێرەدا باسی ئەو نەتەوانە ئەکەین کە نیشتمانیان پێکەوه ناوەو ئاوەدانییان بەجێهێشتووه. تەنانەت ئەو نەتەوانە کە لەگەڵ (کورد)ا پێکەوه ژیاون و له مێژوودا جێگایان بوومتەوه، بەڵام بۆ ئەوەکانیتر ئەگەر هاتوو باسیانکرا، بەپێی مەبەسی خۆمان به کورتی باس لەوانیش ئەکەین.

[٥] نامیلکەی (شەخصیەتی ذو القرنین) هی (ابو الکلام ئازاد) وەزیری مەعاریفی پێشووی هیند.

## هیتیت – ئیشی

لەناو میللەتە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆڵ)دا ئەم نەتەوەیە زۆر گرنگ و ناودارە لە مێژوودا. ئەگەرچی لەگەڵ نەژادی هەرە پێشووی کوردی ئەنادۆڵدا هیتیتییەکان تێکەڵی و ماجەرایانبووە، بەلام ئەم هیتیتانە زوو لەناوچوون و بە تەطەوراتی ئاخری (کورد)ا ئەگەیشتوون. لەبەرئەوە هەر بۆ ئەوەندەی بیانناسین باسیان ئەکەین. ئەمانە لەو قەومە مەدەنیو دەسەلاتدارانەن کە لە (کوردستان)ی تورکیای ئێستادا ١٥٠٠ ساڵ پتر ژیاون. بەتەواوەتی نەزانراوە ئەمانە لە کوێوە کەی هاتوونە ناوەندی (ئەنادۆڵ). هەر ئەوەندە زانراوە یا لە شیمالی ئێرانەوە، وەیا لە قافقاسەوە لەکاتی پێش تەئریخەوە هاتوون. ئەگەرچی هیتیتییەکان لەگەڵ نەتەوە کۆنەکانی زاگرۆسدا پێکەوە ژیاون، بەلام لە پێش هاتنی ئارییەکانا واتە: لە پێش هاتنی مادو فورسدا لەناوچوون. لەبەر ئەوە (کورد) یان نەدیوە، بۆیە لێرەدا زیاتر ئێمەش باسیان ناکەین.

**٩-ئۆرارتۆو هاندی- خالدی:** ئەم دوو ناوە ناوی ولاتی ڕۆژهەلاتی (ئەنادۆڵ)و ناوی خەڵکی کۆنی ئەوێیە. وە لە ساڵی ١٢٥٠پ.م بەدواوە پەیدابووە. ئەهالییەکە بەبێگومان ئەو عەشرەتانەن کە بوون بەهۆی لەناوچوونی حکومەتی (هیتیت) کە لەسەرەوە باسمانکردو جێگای ئەوانیان گرتووەتەوە. ئەگونجێت ئەمانە بەڕەگەزیش لە جینسی ئەوان واتە (ئیشی)یەکان بووبن. ئۆرارتۆکانو ئایرییەکان هاوچاخی یەکن. یەکەمینیان لە ڕۆژهەلاتی ئەوەتر بووە بگرە مێژووشیان تێکەلاوە. ئەوەندە هەیە ئاشۆرییەکان جیا جیا ناویانبردوون. ئەم ئاشۆرییانە بەسەرزەمینی ڕۆژاوای گۆمی (ورمیە)و دەوروپشتی گۆمی (وان) یان وتووە. (ئۆرارتۆ) کە (تەورات) ئاراتی پێ ئەڵێو بە ئەهلەکەشیان وتووە (هالدی- خالدی) لەسەدەی ١١ هەمی پ.م دا عەشرەتێکی تازە کە ناوی (مووشکی) بووە هاتووەو داویە بەسەر ئەم ولاتانەداو لەوێ وەستاوەو لە دواییدا ئەمانە کۆنو تازە هەموویان ناوێتەی یەك

بووه. کۆنەکانیشو ئەم تازانەش تێکڕا حکوماتی وردەڵەی (ئازادیخواز)یان پێکەوە ناوە، وە بۆ ئەوەی ئەم سەربەخۆییە بپارێزن هەمیشە نامادەبوون لەگەڵ ئاشوورییەکانا ئازایانە شەڕ بکەن، وە بگرە لەگەڵ ئایرییەکانی دراوسێشیانا بۆخسێری هەردولا پەیوەندییان کردووە لە ترسی هەڵمەتی ئاشوورییەکان. تا بەوجۆرە کۆڵەکەیانداناوە لەگەڵیاناو هیچ کۆڵیاننەداوە. ئەم (هاڵدی)یانە گەلێك پاشای ناوداریان هەبووە، وە لە دەوروپشتی خۆیانا گەلێك شوێنیان زەوتکردووە. یەکێك لەو پادشاهە ئازایانە (ساردوریس) کوڕی (ئاری) ناو زۆر بەناوبانگ بووە. ئەم پادشایە شاری (تۆس پاس-وان)ی بینا کردووەو کردوویە بە پایتەختی خۆی. ئەمانەشی بەپێی دەستووری ئایرییەکان کە لای سەرەوە باسمانکرد، (فیدراڵی) ئیدارەی خۆیانکردووە. لە سەدەی( ٩ پ.م) دا کە ناوبانگی عەشایری ماد پەیدابوو، وە لەگەڵ ئاشوورییەکانا تێك ئالان (ئۆرارتۆ)کان تۆزێك حەسانەوە، بەڵام لەسەدەی ٨ پ.م بەدواوە کە خێڵانی (کیمەری)و (سکیت)ی کێوی لای قەفقاسەوە هەڵمەتیان هێنا، بوون بە ئافەت بۆ ئەوناوە، ئۆرارتۆکان لەتاوانا بوونە لایەنگیری ئاشوورییەکانو بەرامبەر ئەم کێوییە دڕانە لەسەر یەکیان ئەکردەوە. ئەو دەمەی (میدیە) ئاشوورییەکانی لەناو برد، وڵاتی (ئۆرارتۆ) بە میرات بۆ میدیە مایەوە. ئەمجا لە ژێر دەوڵەتی تازەدا هەردوولا پێکەوە لەسەر نیظامی ئەو کاتە لەگەڵ یەکا ژیاونو ناوێتەی یەکبوون. ئەمجا بەرە بەرە ناوی قەومی کۆنەکانی (ئۆرارتۆ) لە مێژوودا ونبووەو لە جێی ئەوان ناوی (ماد)و تیرەکانی ماد جێگیربووە.

## مەدەنیەت و شارستانیەتی:

بەمەزندەی شاری (تۆسپاس - تۆشیا) کە وێرانەکەی لای گۆمی وانە، ناوجەرگەی هاڵدییەکان بووە. هەندێ نووسراوو شتی بەجێ ماو (ئاثار)ی ئەمانە لەو ناوەدا دۆزراوەتەوە، بەڵام تەعریفی ئەوانە دەست ئێمە نەکەوتووە.

هاڵدییەکان (ڕۆژ) پەرست بوون. هەموو خەڵکی (ئۆرارتۆ) لە ئاشۆرییەکانەوە فێری (مەدەنیەت )بوون. لە پێشا بە ئاشۆریو لە دواییدا بە زمانی خۆیانو بە خەتی (مسماری) نوسیویانە[16].

٩-ئەرمەنییەکان: ناتوانێن لێرەدا دوورو درێژ قسە لە مێژووی (ئەرمەنی) بکەین، بەڵام چونکە ئەمانە تێکڕا لەگەڵ کوردەکانا پێکەوە ژیاون بە تێکەڵاوی دراوسێی هاتوونە خوارەوە، بە پێویستمانزانی نەختێکیش لە کردگارو مێژووی ئەمانە بدوێن. ئەرمەنییەکان خۆشیان بەتەواوی نایزانن کە لە کوێوەو چلۆن هاتوونەتە ئەنادۆڵ. هەندێك ئەڵێن ئەمانە لە (هاڵدی)وە یا لە بەشی دوایی (ئیشی)یەکان پەیدابوون، بەڵام ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت کە ئەڵێن تیەرمیەکن لە ئەتەوەی (هیندۆ ئەورووپایی). لەسەرەتای سەدەی شەشەمی پێش میلادا ئەمانە لای گەرووی (بوسفۆڕ)و (داردانیل) پەڕیونەتەوەو کشاون بۆ لای ڕۆژهەڵاتی ئانادۆڵ و، لەناوچەی (ئۆرارتۆ)دا لەناو (کورد)مکانا جێگیربوون. زاتەن گەلێك تایەفەی تریش لەو هەنگاوەدا هەر لەو گەرووانە پەڕیونەتەوەو لە ناوەندو ڕۆژاوای (ئەنادۆڵ)دا دامەزراون کە ناوو ڕەوشتو کردەوەیان لە مێژووی گشتیدا نوسراوە. هەرچەندە ئەرمەنییەکان یەکێکن لە هەندێك تایەفەی تازە هاتوو لە قافقاسەوە کە (کیمەری)یەکانن. بەهێنێك شێرزەکراون، بەڵام زۆری پێنەچووە دیسان خۆیان کۆکردووەتەوە... وە لە (ئۆرارتۆ- ئەرمەنستان)دا کەوتوونەتە تەقەلادان بۆ دروستکردنی دامودەزگایەکی ئازادی سەربەخۆیان، کەچی لە بێتالعیی خۆیان لەو دەمەدا ئیمپراتۆریەتی تازەی ئێران، واتە (کەیخوسرەو)ی گەورە پەیدابووەو گشت ئەو وڵاتانەی داگیرکردووە. ئەرمەنییەکانیش وەك قەومەکانیتر چارو ناچار (٢٠٠) ساڵێك بە مسکێنایەتی ئێران ماونەتەوە. هەر جارو بار لەگەڵ کوردەکانا ئەمانیش بەبێ ئەنجام یاخیگەریبیانکردووە لە خزمەت (شاهەنشای ئێران)ا. ئەوەندە هەیە ئەم ئەرمەنییانە لە کوردەکان چاکتر مشووری حاڵی خۆیان خواردووەو بۆ پێکەوە نووسانیش هێشتا ئەمانە باشتر بوون لە کوردەکان.

---

[16] باسەکانی ئەم ئاخرییە لە مێژووی (بریستید) وەرگیراوە.

لەبەر ئەوە لە عاستی حکوماتی ئێرانیشو ڕۆمیشا جاروبار توانیویانە یاخی ببن‌و ئازادی بسێنن بۆخۆیان لە ژێر ئیدارەی مەلیکی خۆیانا لەو ناوەدا بەناوی (ئەرمەنستان)ەوە (حکومەت )بکەن. تەنانەت کوردەکانی ئەو ناوەش لەسەدەی (١ و ٢ پ.ز.م)دا کەوتوونە ژێر حوکمی ئەرمەنییەکانەوە تاکو (ڕۆم)ەکان هاتوون و وڵاتەکەیان لە ئەرمەنییەکان سەندووەتەوە. لەسەدەی (٢ هەمی پ.م)دا پادشای ناوداریان (دیکرانی دووەم) بووە، بەڵام لە دوای میلادی حەزرەتی عیسا قەومایەتی ئەمانیش تەنگ بووەو هێزی جارانیان نەماوە، بۆیە حکومەتەکەشیان لەلایەن (ڕۆم)ەکانەوە لە ناوبراوە. لە هەموو کاتێکا کوردو ئەرمەنیەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ پێکەوە بوون. ئەمانە، یەعنی ئەرمەنییەکان، ببوونە شارستانی، کەچی زۆربەی کوردەکان بەخەڵکی شاخی مابوونەوەو لە دێهاتا ئەژیان. کوردەکان حەزیان بە بەکارهێنان‌و هەڵگرتنی (چەك ) ئەکرد. ئەرمەنییەکان حەزیان لە بازرگانی‌و فرمانی تیجاری ئەکرد. لەگەڵێك کاتا کوردی دێکانیش‌و کوردی شارستانییش بە کەڵکی حکومەتی ئەرمەنی هاتوون. ئەرمەنییەکانیش لە پێشا وەك کوردەکان لەسەر ئایینی سروشت (طەبیعەت) پەرستی بوون. ئەگونجێت بەینێکیش بووبن بە (زەردەشتیی)، بەڵام چونکو لە عەشرەتایەتیدا (کورد)و (ئەرمەنی) یەکتریان بە بێگانە داناوە، ئەگونجاوە پێکەوە بنوسێن‌و کە ئەرمەنییەکان لە دەوری ٣٠٠ی میلادیدا بە بیرێکی سیاسی بوونە (مەسیحی)و کوردیش لەسەر (بت پەرستی) مایەوەو لە دواییشابووە بە (موسوڵمان). نیتر هیچ هیوای یەکگرتن نەماوە لە بەینیانا. ئەرمەنییەکان هەموو دەمێك لێهاتوویی‌و زیرەکی قەومی خۆیان نواندووە، وە لە ناو ئەم هەموو هەراو هوریای مێژووییەدا خۆشەویستی‌و بیری قەومایەتی هەر بووە. ئەمانەی هەتا ئێستا هێشتووەتەوەو پاراستوونی[٣٧] . بە تەواوبوونی ئەم باسە حاڵ و ئەحواڵی نەتەوەکان کە ناسراون

---

[٣٧] بڕوانە کتێبی مێژوویی (کوردو مەسئەلەی کوردستان) نووسینی دوکتۆر شاکر خصباك، لە لاپەڕە ٢١ دا.

ناسراون بە خزمی (کورد) ئەبرێتەوە. ئەمجا سەر گوزشتەی کۆچ و ڕەوی (ئاری)یە تازەکان دێتە پێشەوە، وەکو لای خوارەوە باسیان ئەگێڕینەوە.

## کۆچ و ڕەوی دوایی هاتنی ئەقوامی ئاری تازە:

(ماد، مانای، پارت، پارس (فورس)، کاردۆخۆ) ئەگەر زۆر چاك سەرنج بدەینە ئەحواڵی مێژووی نەتەوەکۆنەکان، ئەبینین لە پێش و پاشی میلادی لەناو نەتەوەکانی سەر زەمینا ئارام و وەستان نەبووە، بگرە لافاوی قەومە ڕەوەکییەکان لە هەمەولایەکەوە بەسەر وڵاتی نەتەوە نیشتەنییەکانا شەپۆلیداوە. ئەمانە هەروەکو مەدەنیەت و ئاواییەکانیان تێکومەکانداوە، بناغەی عالەمێکی تازەو گەرای کۆمەڵایەتییەکی گەورە تریشیان داناوە، وەکو: ئەبینین ئەو کاتەی (کاسییەکان) لە ڕۆژهەڵاتەوە پەلاماری عیراقیان داوە، عەشایەری کۆچەری (ئارای)یش لە ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەردا لە جۆش و خرۆشی (کۆچ و ڕەوا) بوون بۆ لای بانی (ئێران) و (هیندوستان). ئەمانە دەستە (مەوجە)ی (هیندۆ ئەورووپا) وەیا (ئاری)یە تازەکان بوون کە ڕەویان کردووەو خەریکی کۆچبوون لەو بیابانانەدا. بەپێی وتەی زاناو مێژونوسەکان ئەم کۆچکردنی تازەیە لە دەوری سەدەی ١٦و ١٨ی پێش زایینی (میلاد)دا ڕویداوە. ئەڵێن ئەم (عەشرەتانە) هێشتا لە دەوری (بەرد)ی دواییدا بوون، توانای کشتوکاڵیان پەیداکردبوو. کەچی عێراق و میسرییەکان ئەو حەلە (مەعدەن)یان بەکارهێناوەو شتیان لێدروستکردووە. ئەم عەشایەرە ڕەوەکییانە بەرەوە ئاژاڵیان بەخێوکردووە. هێشتا هەستی مەدەنیەت (شارستانیەتی) تەواو پەیدا نەبوود لە ناویانا بەرەوە (ئەسپ)و (ماین) یان هەبووە کە لە عێراق و میسری شارستانیدا ئەم جۆرە چوارپێیە هێشتا نەبینراوبوو. لەسەر ئەوەشا خواستی کشتوکاڵ هەبوو لەناویانا وەك لای سەرەوە وترا..ئێمە لەسەر ئەو بیرەین کە ئەم (ڕووداو)ە کۆچوڕەوی دووەمجاری (ئاری)یەکانە چونکە شەپۆلی یەکەمین، عیلام، گۆتی و کاسی و ڕەفیقەکانی کردیان، ئەوە بو لە ڕۆژاوای ئێرانا خوارو ژوور دامەزران وەك لە نوسراوەکانی لای سەرەوە باسمانکردن. ئەوسا لە عێراقا (سۆمەر)و (ئەکەد)ەکان دانیشتبوونو خەریکی کشتوکاڵبوون. لە کۆنا لەبەر نەبوونی (لەوەڕ) چلۆن هەندێك خێڵاتی (سامی)ی عەرەبستانی بەجێهێشتووەو چووە بەملاو بەولادا. وەها دەرکەوتووە

ئەم عێلاتی (ئاری) دوایيەش لەبەر بێبارانیو کەم لەوەڕی وەیا لەبەر ناکۆکی خۆیانو دراوسێکانیان ناچار بوون بە عێلجاڕی دووبارە کۆچو ڕەو بکەنەوە چونکە ڕەوشتی ئیقلیمی هەردوولا (چۆڵ) تەبیاتە خەلکی ئەمجۆرە چۆڵانە هەمیشە مەعرووضی ئەم حالەتانەن بۆیە ئەگونجێ ئەم کۆچو ڕەوە دووەم (مەوجە) بێت. لەمانە خێلاتی شیمالی (قافقاس)و دریای خەزەر ڕویانکردووەتە (ئەورووپا)و هەرچی خێلاتی ڕۆژهەلاتی دەریاکەشە لێك جیابوونەوە، بەشێکیان چووە بۆ (هیندوستان)و (ئەفغان)و هەندێکی تریشیان ڕویکردووەتە بانی (ئێران). بەکردەوە ئەمانە هەموو ناویان (ئاری)بووە، تەنانەت ناوی ئێرانیش لەم ناوە پەیدابووە. ئەگونجێت هەندێك لەم عێلانە لە قەفقاسەوە هاتبێت. جا سەر گوروشتەی ئەم کۆچو ڕەوانە لە کتێبی (ویداس)ی هیندییە کانا نوسراوە[٨] .دەستە عەشایەری (ئێران) کە هاتوون گەلێك تیرەبوون، بەلام ئەوەی بڕە بووەو لە مێژوودا ناوی بەجێماوە (ماد، پارس، پارت، کاردۆخۆ، پاقت، سەغد)ەکان بوون. ئەمانە هەر یەکە عێلێکی گەورەی ئەوتۆ بوون وەك عەشرەتە زلەکانی ئێستا چلۆن بەناویەك عێلن کەچی لە دابەشبوونی ناوخۆیانا ئەبن بە گەلێك تیرە، جا ئەم عیلانە کۆنانەش ئاوەها فرە تیرە بوون وەکو (جاف) ناوی یەك عشیرەتی گەورەیە کەچی لەناو خۆیا ١٢ تیرەیە.. ئەگینا ئارییە کۆچەرەکان ئەیانئەتوانی (ئێران) پڕبکەنەوە بۆ ئەوەی ئاژەلیان بە ئاسانی بۆبەخێو بکرێ هەریەکە لەم عەشرەتانە ڕوویکردووەتە سەمتێکی ئێران. لەسەر ئەوەشا بەڕیزخوارو زووری یەکتریبوون چونکە مەترسییان بووە ئەك تووشی پەلاماردانی بێگانە ببن. جا ئەم کۆچ و ڕەوانە ئەپساوەتەوە زۆر درێژەیکردووەو بەرەو ڕۆژاوای ئێران تەنیوەتەوە. هێشتا دووەم هەزار سالێ پێش میلاد تەواو ئەبووە کە بەرایيان لەگەلێ نەتەوەکانی پێشووی خزمیانا کە بە (مەوجە)ی یەکەم هاتبوون لای ڕۆژاوای ئێران یەکگیربوون.

---

[٨] مێژووی عوصووری قەدیمەی براستد، باسی مادوو فورس، ل١٣٥ شوعووبی ئاری. وە مێژووی (کوردو کوردستانی)ئەمین زەکی بەگ.

## وتاری تەنریخی:

ئەم تیرەو نەتەوانە کە بە نێرانا بڵاوبوونەتەوە، لە نزیك نەتەوە کۆنەکانا نارامیانگرتووە. لە دواییا تێگەیشتوون کە ئەم قەومە کۆنانە هێزی عەشایەریو توانای جەنگاوەری پێشوویان نەماوە، بەڵکو لە ژێر تەنثیری مەدەنییەتی (سۆمەر، بابل، وە ئاشور) دا بەیەکجار لە دەماری ڕەقی عەشرەتایەتی کەوتوون، ئەوسا دەستیان بۆ درێژکردوون، لەبەر ئەوە لەناویانا شەڕو هەرا دەستپێکردووە بەبێ شك تازەکان بەسەر کۆنەکانا زاڵبوون و وڵاتەکەیان لێداگیرکردوون. سەرکەوتووەکان لەوەدوا وەك یەخسیر تەماشای خەڵکە کۆنەکانیان کردووە، هیچ مافیان پێنەبەخشیون. بەمجۆرە وردەوردە بوون بە(ئاغاو مسکێن)، ناحەزی پێشوویان لە بیرچووەتەوە تێکەڵاو یەکتربوون. لە کاتی کۆنا ئەم جۆرە ڕووداوانە لە مابەینی عەشایەرە کۆچەرەکانو شارستانییە کۆنەکانا زۆر ڕوویداوە. لە ئەنجامی ئەم چەشنە تێکەڵبوونەدا سەرۆکی نوێو نەقوامی (نوێو دەوڵەتی تازە هاتووەتەکایەوە، وە لە زۆرجێگادا بەمجۆرە ڕووداوانە نەخشەی جیهان تێکومەکان چووە. بەکورتی: لە ئەنجامی کارا قەومایەتی (ئاری)یەکانی نێران وەهای لێبەسەرهاتووە کەلای خوارەوە نووسراوە[19].

١- لەم عەشرەتە زۆرانەخێڵاتی (کاردۆخۆ) بەشیمالی عێراقا تێپەڕیوە بۆ ناو وڵاتی (سۆباری)و (نۆرارتۆ) لەوێ دامەزراوە. دیارە ئەم داگیرکردنو دەست بەسەرا گرتنە کە کۆچەرەکان کردوویانە لەدوای لەناوچوونی (دەوڵەتی ئاشۆر) هێزی سەندووەو پێکهاتووە. جا ئەم خێڵە تازانە بوونەتە حاکم بەسەر نەتەوە کۆنەکانی ئەوێدا، لە دوای بەینێکی دوورو درێژ بەپێی قانوون (تێکەڵ)بوون، کۆنو تازە خەڵکەکە ناوێتەی یەکبووەو بەشی حاکم کە کاردۆخۆکانبوون ناوبانگیان بەرز بووەتەوە.

---

[19] موهاجەرەتی نەقوام لە مێژووی گشتی گەورەی (احمد رفیق)دا موتالا بکرێت، بەرگی ٤.

٢- تایەفەکانی (ماد)و (مانای) کە دەسەلاتدارتر بوون، شیمالی غەربی ئێرانیان کردووە بە نیشتمانی (تازە)ی خۆیانو لە ولاتی (لۆللۆ، گۆتی، کاسای)دا جێگیربوون، بەلام ئاشوورییەکان پەلاماریانداوە، ولاتەکەیان داگیرکردوون، ئینجا ئەمان بوون بە مسکێنی ئاشوورییەکان هەتا دوای سەدەی هەشتەمی پێش میلاد مادەکان خەریك بوو کۆتایی بە دەسەلاتداری ئاشوریەکان بێنن‌و ئازادی جارانیان بسێننەوەو ئاشوورییەکان دەرکەن لە نیشتمانەکەیان هەتا لەدوای ئەوتەئریخە سەرکەوتن بەسەریاناو ئاشوورییەکانیان شکاندو لە (میدیە) دەریانکردن.

٣- (پارت) ەکان هەرچەندە لە ڕۆژهەلاتی ئێراندا ئەمانە ماونەتەوە، بەلام لە دواییدا کەوتوونەتە ژێر دەسەلاتی مادەکانەوەو لە دوای ئەوانیش چوونە ژێر حوکمی (ئەخەمینی) یەکانەوە.

٤- مایەوە تایەفەی (پارس)ەکان. ئەوانیش لە جەنووبو جەنووبی غەربی ئێراندا جێگیربوون، بەلام هەندێك هۆزیان لەولاتی (عیلامی کۆن)دا دامەزراوە. ئەوەندە هەیە پارسییەکان جارێ کەوتوونەتە ژێرحوکمی مادەکانەوە کەلەشیمالیانا بوون. ئینجا ناوی عیلام لەمەولا نەماوە. وا دەرئەکەوێ سەرەتای ئەم ڕووداوانەی دوایی لە دەورو پشتی هەزار سالی پێش میلادا هاتووەتەدی، وە لە ماوەی پێنج سەد سالێکا گشت ئەم تیرە (ئەوەی)ی ئاری کۆنو تازەیە ناوێتەی یەکبووە، واتە (انصهار) بووەو بنچینەی ئەتەوە ئارییەکانی ئێستا هاتووەتە پێشەوە کەوا فورسەکانی ئێران‌و پارتەکان‌و هیندییەکان‌و (کورد)ەکانی (تورکیاو ئێران‌و عێراق‌و سوریە)ن. ئەو کاتە سەرەتای پەیدابوونی دەولەتی (میدیە) بووە لە ئێران. جا هیچ دوور نییە ئەم ڕووداوانە کاتی خۆی بەم (تەرحەوە) یا تەحریکی نزیك ئەم جۆرە هەلسوڕا بێت، چونکە ئەم جۆرە ڕووداوە وەنەبێت بەتاسوخی هەر بۆ ئەمان بووبێت، بەلکو ڕووداوی یەك گرتنی ئەتەوە (سامی)یەکانیش لەمە ئەچێت، یەعنی

هەموو تیرە سامییەکان کە لە عەرەبستان هاتوونە دەرەوە لە هیلالی خەصیبو لە شیمالی ئەفەریقادا بەرەو دوا لەگەڵ ئەهالی ئەو شوێنانەدا ناوێتەی یەك بوون، تا لە ئەنجامی کارا گشتی بە زۆریی لە نەتەوەی عەرەبدا ونبووە. ئەم ئەنجامە لە تورکیاشدا عەینی شتە. نەتەوەیەکی بچووکی تورکی حاکم کە لە دەرەوە هاتووە ئەکسەریەتێکی گەورەی بێدەسەڵاتی مەحەللی قوتداوە جا بە کورتی دوور نییە نەتەوە کۆنەکانی زاگرۆس لەگەڵ تیرە نەتەوە تازەکانی دوایدا بەناوی ئارییەتییەوە ئاوێتەی یەك بووبن، ئەوسا کۆگای هەردوو نەتەوەی (کورد)و (فورس) پێکهاتووە، حاڵی حازر (کورد)و (فورس) دوو لقی درەختی کۆنە ساڵی (ئارای ئەژاد)ی ئێرانین.

## وەستانی کۆچ و ڕەوو پەیدا بوونی نەتەوەی دوایی (ئاری)ی ئێستا

عەشایەری مەنظوومەی زاگرۆسی دوایی لە نووکەوە ئەگەرچی وەك لافاو داویە بەسەربانی ئێرانا تا گەیشتوومتە ڕۆژاوای وڵاتەکە هەموو شتێکیان داماڵیوە، بەڵام کە زاڵبوون بەسەرخەڵکە کۆنەکەی ئەوێدا، ئەمجا ئارامیانگرتووەو دەسیانکردووە بە ڕێکخستنی نیشوکاری قەومەکەیان، ئەوەنە هەیە لەمانە هەردوو عێلی گەورەخۆیگرتووەوحکومەتی مەدەنی پێکەوەناوە. ئەویش لە پێشەوە (ماد)و لە دوایدا (فارس)ەکان بوون. تیرە ئارییەکانیتر بە شێنەیی کەوتوونە ژێردەسەڵاتی ئەمانەوە... ئەگەرچی لە پێشا ئەمانە یاسا (نظام)ی عەشیرەتی خۆیان ڕاگیرکردووە، بەڵام بەئەنجام کۆنوتازە گشتیان تێکەڵاو یەکتربوون. ئەم دوو نەتەوە باسکراوەی سەروو لە دوای ئارامگرتن بەرەودوا (دوو) ئیمپراتۆریەتی (ئاری)ی ئەوتۆیان هێناوەتە کایەوە کە گشت عالەمی (شارستانی)ی ئەو حەلە پابەندی فەرمانو حوکمیان بووە. نەتەوەی (کورد) لە بەینیانا تیرەیەك بووە لە عێلە گەورەکەی (ماد) بەپێی (یاسا)ی ئارییەکان ئەمانە لە ئیدارەو سیاسەتو ئیجتیماعا جارێ جیاجیا نەبوون،

بەڵكو لە ژێر ئەمری سەرۆكی گشتیدا بوون. لەبەرئەوە پێویست وەهایە جارێ باسو هەواڵی مێژووی كۆنی هەردوو عەشرەتە گەورەكە بە كورتی بگێڕینەوە.

## مادو فورس

هەموو زانای ئەقوام بەیەك ئاواز ئەڵێن تیرە عەشرەتەكانی ئەتەوەی (ماد) ناوپشتەی ڕەگەزی پاكوخاوێنی میللەتی (كورد)ە. لەوانە تیرەی (كاردۆخۆ) پێشڕەوی تیرەكانیتر بووە. وتەی (كاردۆ - خۆ) دوو پیتە . (كاردۆ) ناوی تیرەكەیە. (خۆ) ئەداتی جەمعە بەزمانی ئەرمەنی. ئەوان بەمجۆرە ناویان هێناون وەك ئێمە ئەڵێین (كوردەكان).جا لەدوای ئەم باسە كورتە پێویستە بۆ ئێمە دروستبوونی حكومەتی مادی كۆن بە بناغەی سەربەخۆیی (كورد)دانێین، وەك لایخوارەوە باسی ئەكەین. عێلاتی ماد لەسەدەی دەیەمی (پ.م) دا گەیشتوونەتە ڕۆژاوای (بانی ئێران)ەوە تاسەدەی نۆیەم هەموو سەرزەمینەكانی (زاگرۆس)ی دیوی ئێرانیان داگیركردووەو لەگەڵ ئاشۆرییەكانا كە گەورەترین دەوڵەتی سەرزەمین بووە ئەوحەلە ڕووبەڕوو وەستاون لە(٨٢٥ پ.م) دا. مادەكان ئەیانویست حكومەت پێكەوە بنێن، پایەداربن. لە بەرئەوە بەناچاری تووشی شەڕوهەرای خوێنڕێژانە بوون لەگەڵ ئاشۆریەكانا. ئەم شەڕانە بەسەد ساڵەها درێژەیكردووە. مادەكان لەپێشا كەوتوونەتە ژێرحوكمی ئاشورییەوە، ئازارو مەینەتی حوكمی بێگانەیان زۆرچەشتووە. مێژوو ئەڵێت: كاتی ئازادبوونی مادەكان كە نزیكبووەوە لە ژوور ئەمانەوە هەرایەكی تر قەوماوە، یەعنی لە ئاخرونۆخری سەدەی هەشتی پێش میلادا. دوای بەدوای یەك، دوو عەشرەتی تری تازە لە قافقاسەكانەوە هاتوونەتەخوارەوە بۆ ڕۆژهەلاتی نزیك، یەكێكیان (سیكیت)و ئەویتریان (كیمەری)ی ناوبووە لە پێشا قەومی (سكیت) هاتووە ئەوناوەی شڵەقاندووەو لە دوای ئەمانە ئینجا

کێمەرییەکان هاتوون. ئەمانە زۆر دورو بێرمزابوون. وڵاتەکانی ژورووی ئاشۆرییان جارێ بێزاوە ئەوسا دامرکاون، ئاشۆرییەکان بەمە زۆر پەرێشانبوون، سوپاکەی کزێتی هێناوەو تەنکبووە بۆ لەناوچوون. ئەمە خزمەتێکە قازانجی (ماد)ی تیابووەو کێمەرییەکانیش ئەمە تەنگی کردوون، زانای تورك ئەڵێن ئەمانە تورکمان بوون کەچی زاناکانی تر پێ لەممنانێن.

بێینەوە سەر عەشایەری (پارسی- فورس)مکان. ئەمانیش کە هاتوون لە پاینی مادەکانا یەعنی لە جەنووبی رۆژاوای ئێستای ئێرانا دامەزراون. لە پێشا مادەکان نیشانەی زیندوویەتییان پیشانداوەو حکومەتیان دروستکردووە. دەنگ وایە پارسییەکان لای مادەکان بێبایەخبوون. رەنگە ئەم کەم نرخییە لەبەر ئەوە بێت کە ئەم دوو عەشرەتە گەورەیە لەگەڵ یەکا رقەبەرییانکردووە، بۆیە مادەکان سڵیان لێکردوون و ناحەزیان بوون، وارێکەوتووە لە پێشا پارسییەکان کەوتوونە ژێر حوکمی مادەکانەوە، بەڵام دواجار حکومەتی ماد بەهەڵمەتی لەشکری (پارس) لەناوچووەو کە بانی قەومی ماد نەماوە. پادشاکان‌و کاربەدەستانی ئەم پارسییانە لەبەر ناحەزییەکەیان وەیا لەبەر بیرێکی سیاسی تر بۆنەهێشتنی ناوونیشانی (ماد) هەوڵیانداوە. مادەکان چونکە ناکۆك بوون لە ناوخۆیانا تەقەلای پارسییەکان سەریگرتووە. ئەگەرچی جاروبار هەندێك تیرەی ماد بۆ سەندنەوەی سەربەخۆیی جارانیان شۆرشیان بەرپاکردووە کە هیچیشی لێیەیدا نەبووە وەکو لەمەولا باسی ئەکەین، (هیرۆدۆتی)ی بەناوبانگو مێژونووسی یۆنانی کەچووە بۆ رۆژهەڵات‌و گەڕاوە بە ئێرانا لە دەوری (٥٠٠پ.م)دا ئەڵێت[٢٠]: (کەمن چوومە ئێران ناوبانگی (میدیە) لەناو خەڵکا زۆر کەم ببووەوەو ئەهالی رووداوەکانی پێشوویان لەبیر نەمابوو). جا لە بابەت بنچینەو رەگەزی (کورد، گۆتی، مادو مێدیە)وە زاناکان لەگەڵ یەکا پەیوەندییان نییە. هەندێکیان ئەڵێن ئەتەوەیەك کە ناوی (ماد) بوو بێت نەبووە لە (میدیە) داو ئەو سەرگوزەشتانە کە بۆ (ماد)و (میدیە) لەلایەن

---

[٢٠] تەئریخی گەورەی (احمد رفیق) بەتورکی. بەرگی دووەم، باسی یۆنان.

(هیرۆدۆت)و (یۆنان)ەکانەوە کراوە ڕاست نییە، چونکو بەڵگەی بەهێزنابینین لەو وڵاتانەدا کە ناونراوە (میدیە)، نەتەوەیەکی (ماد) ناو لەوێ دانیشتوو بوبێتن وە ئەڵێن (هیرۆدۆت) بە ئارەزووی خۆی میدیەی پێکەوەناوەو ناوبانگی مادی بڵاوکردووەتەوە، خەڵکیش لەسەر نوسینەکانی ئەو ڕۆیشتوون، بەڵام ئەم قسانە ئەو ڕاستییە تێکنادا کە نەژادی کوردەکانی ئیمڕۆ لەو وڵاتەدا ژیاوەو بە (هەڵە) ئەوسا مێدیەی ناونراوە، وە ئێستا گەلێك بەڵگە هەیە کە کوردەکان لە نەتەوەی گۆتییەکانن، ئەمانیش لە زاوزێی ئەو نەوانەن کە بە کۆچ و ڕەوو بەدووسێ مەوجە هاتوون لە ئەقوامی ئاریو لە زاگرۆسەکانا گیرساونەوەو ئاوێتەی یەکبوون[21]. بۆ ئەم مەسەلەیە ڕای زانا (مینۆرسکی)یش ئەوەیە کە کوردەکان لە تێکەڵبوونی گەلێك قەومی ئاری دروستبووە لە کوردستانەکەی ئێستایانا. هەر چەندە شەخصیەتی بوونی (ماد) لە گیرو گرفتا بێت، بەڵام ئەسەلێنرێت کە ئەم ناوە بوو بێت و بەو هۆیەوە لە دوایدا بوو بێتە (ناو) بۆ دەوڵەتو وڵاتەکەش. ئەگونجێت هەر ناوی ناوچەیەکیش بووبێت لە دەوڵەتەکەداو (مادەکان) لەوێ دانیشتبن، چونکو ئاشۆرییەکان لە مێژووی خۆیانا ناوی وڵاتێك ئەبەن کە (میدیە)ی ناو بووە لە دیاری (مادا)دا. شۆرەت وایە (مانای) ناوی ناوچەیەکبووە لە (میدیە). هەندێکیش ئەڵێن تیرەیەك بووە لە نەتەوەی (ماد). ڕەنگە (ماد) ناوی خێڵێکی گەورە بوو بێت کە لە ۹-۸ کۆمار دروستبووە، (ماد)یش یەکێك لەو کۆمارانەو لەگەڵ ئەوەشا سەرۆکایەتی گشتی‌یش هی ئەو بووە. وەیا بەناوی (ماد)ەوە هیچ تیرەیەك نەبوە، بەڵام ناوی گشتی عێلەکە ماد بووە، وەکو عەشیرەتی گەورەی (جاف) بێت، بەڵام عێلەکە لە ۱۳ تیرە دروستبووە کە هەر تیرەیە ناوی تایبەتی خۆی هەیە، کەچی ناوی (گشتی)ی عێلەکە (جاف)ە، ئەمانە هەموو ئەگونجێ بوو بێت، شك نییە ناوی (ماد) بە خۆڕایی دروستبووە. بەکورتی: بنچینەی مێژووی (ماد) وەك لای

---

[21] مێژووی (کوردو مەسەلەی کورد) هی دوکتۆر شاکر خصباك، ل۱۲، ۱۳ وە کتێبی باسیل نیکیتین کە ناوی (الاکراد) ە لە لاپەڕە ۲۰، ۲۱ دا.

سەرەوە باسکراوە ساغنەبووەتەوە. ئەگونجێت پاشەڕۆژ مێژوزانەکان بگەنە بنجو بناوانیو ساغی بکەنەوە.ئێستا باسی تەئریخی (ماد) و (میدیە) لەسەر ئەمە یەکی ناکەوێت ، چونکە عێلی ماد وەیا ماد وەیا تیرەکانی ڕاستن هەبوونو ئەمانە کردگاری تەئریخی خۆیان بەجێهێناوە. لەبەرئەوە چارە نییە لەسەر باسەکانی (ماد)و (مێدیە) هەر ئەڕۆین (کاردۆخۆ)کانی (زەینۆفۆن) ناو زانای یۆنانی کە لە کتێبەکەیا ناویبردوونو لە دوایدا (ڕۆم) ەکانیش ناوی‌وڵاتەکەیان بە (کوردۆئەن) نوسیوە کە مەعنای (کوردستان) ئەگرێتەوە بە ڕۆمی، لە مێژووی گشتیدا نوسراون. ئەمانە لە کوردستانەکەی ئیستای (تورکیا) لە ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆڵ)دا بوون کە بەشی ڕۆژاوای (مێدیە)ی ئەو حەلە بوو. ئەوە بوو (کاردۆخۆ) بە زمانی (ئەرمەنی)و (کوردۆئەن) بەزمانی ڕۆمی پێشڕەوی (ماد)ەکانبوون لە کاتی کۆچکردنا هاتبوونە ئەوێ، ئەتەوە کۆنەکانی ئەو ناوەیان خستبوە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو ئەمە لە ئەتڵەسی تەئریخی ئەو کاتەدا نیشاندراوە. جا ئەم (کاردۆخۆ) یانەن کە ڕێگایان لە (کەسەنەفۆن)ی سەرۆك لەشکری ١٠ هەزار سەربازی شکستەی یۆنانی گرت کە بە ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستادا گەڕابوونەوە هەتا سەر (دەریای ڕەش) جەنگیان لەگەڵکردبوون لە (٤٠٢پ.م )دا. ئەم چەرمەسەری دە هەزار سەربازی شکستەیەیە (یادداشت)ی حەربی کەسەنۆفۆن نوسیبوویو ناوی نابوو (ئانا بازیس) کە گەڕاوەتەوە بۆ یۆنانستانو داویە بەحکومەتی یۆنانی ئەو کاتە[٢٢].

## حکومەتی ماد (٨٦٠ — ٥٥٠پ.م)

پێش پێکهێنانی حکومەتی (ماد)ەکان ژیانی عەشیرەتییان هەبووە. لە بابەت هاتنیان بۆ ڕۆژاوای (ئێران)و ئارام گرتنیانو تەشکیلاتی تایفییان لای سەروو زۆر قسەمانکردووە، لێرەدا پێویست نییە ئەمانە دووبارە بکەینەوە.

---

[٢٢] مێژووی گشتی گەورەی (احمد رفیق) بەتورکی، بەرگی یۆنانی.

هەموو خێڵێك لە مادەكان سەرۆكی هەبووەو لە ئیدارەی قەبیلەیدا سەربەخۆ بوون وەك حكومەتێكی بچكۆلە، بەلام لەكاتی تەنگانەدا كە بەرهەڵمەتی بێگانە بكەوتنایە سوپای عەشرەتەكان لە قیادەی سەرۆكا ئەچوون بە هاواری یەكەوە، ئەمە لە جوملەی تەقلیدی كۆنیان بوو. عەشایری (ناری) كە هاتبوونە ئێران گەلێك تیرەبوون. لەبابەت جێگیربوونیان لە ئێران و ڕووداوە كۆنەكانی ناوخۆیانەوە زانیاریمان زۆر كەمە. ئەمانە هەر یەكە لەسەمتێكی ئێرانا دانیشتوونو كردوویانە بە نیشتمانی مێژوویی خۆیان. هەندێكیان سەربە (ماد) بوون و بەشێكیشیان سەربە (فورس)ەكان بوون. ئەمانەی لایخوارەوە سەر بە مادەكان بوون. ئەویش هەر لە كاتی تەنگانەدا بەهاواریانەوە ئەچوون:

پاقت: لە ئەفغانی ئێستادا لای سنووری ئێران.

پادث: لای خوراسان.

مامای: مادەكان بە خۆیان وتووە (مانای) لە ڕۆژهەڵاتی (ورمییە) دا بوون.

كاردۆخۆ: تیرەی هەرە بەهێزی (ماد)بووە لەجەنگا پشتیوانی سوپای دەوڵەتەكە بووە.

خوارزم: لەناوچەی ڕووبارەكانی (سەیحوون) و (جەیحوون) دا بوون[٢٢].

باختەر: لە سنووری ئەفغان و لای شیمالی ئێران دانیشتوون.

سەغد: لە شیمالی باختەرا بوون.

هەرقانییە: لە جەنووبی دەریای (خەزەر)دا لای مازیندەران بوون.

كاتێك كە ئەم عەشرەتانە لەناو دۆڵ كەژەكانا دامەزران و لە خەڵكە كۆنەكانەوە فێری ژیانی دێكانی بوون، بوونە نیشتەنی، گوزەرانیان بە

---

[٢٢] تەماشای نەخشەی تەئریخی گەورەی گشتی (احمد رفیق) خەریتەی ئیمپراتۆریەتی ئەسكەندەری گەورە بكرێ.

کشتوکاڵو حەیوان بەخێوکردن ئەکرد، وە پێشەو ڕەوشتی عەشایری پشیان مابوو. باوکی مێژوو زانان (هەردوونی) یۆنانی لە بابەت دانانی بنچینەی حکومەتی مادەوە ئەڵێت: لە دوای ئەمە کە حکومەتی ئاشۆری ٥٢٠ لە ئاسیای ڕۆژاوادا حوکمڕانیکرد، پێش هەموو نەتەوەکان کەلەژێرچەپۆکی ئیستیعماریدا بوون، قەومی (ماد) دەستیوەشاندو شۆڕشی هەڵگیرساند، واتە ڕووبەڕووی ئاشۆر وەستا، سوپای هەردوولا کە بەرامبەریەك وەستانو چوون بەگژ یەکا سوپای ماد سەرکەوت، ئەوسا نەتەوەکانی تریش چاویان لەماد کردو گشتیان لە ئاشۆر هەڵسانەپێوخۆیان لە دیلیی ڕزگارکرد. لە دوای ئەمە هەروو دوت ئەڵێ: لەم کاتەدا (دیۆسەس — کەی قوباد) ناو پیاوێکی زۆرزیرەك لە میدیە پەیدابووە ئەهالییەکە زۆرپەسەندیانکردووە، پیاوەکەشی پەڵپی لێنەگرتوون کە بیکەن بە (سەرۆك)ی خۆیان. لەسەر ئەوە قەومەکە هەڵیانبژاردووەو کردوویانە بە (پادشا)ی خۆیان. ئینجا کەی قوباد (ئاقباتان- هەمەدان) ی کرد بە پایتەخت و بانگ درا کە بەنەمری (یەزدان) کەی قوباد کرا بە پادشای میدیە. جا حکومەتی ماد بەمجۆرە هاتووەتە مەیدان. جا طەبیعەتی ئەم بەیانە ڕاست نییە، چیرۆکی پادشایەتییەو پێشینان دروستیانکردووە. ئەوی ڕاست بێت بۆدروستبوونی سەربەخۆیی (ماد) کزبوونی دەسەڵاتی (ئاشۆری)یەکانە. بەوە ڕێگا کراوەتەوە ماد بێت بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، لە پێشەوە ئاشۆرییەکان لە هەرێمی هێزو گوڕیانا بوون. وڵاتانی گۆتیو لۆللۆیان بەتەواوی زەوت کردبوو. ئۆرارتو و ئایریشیان خستبووە ژێرچنگی خۆیانەوە ، خەریکی بەربەستکردنی خراپەی عەشایرە باربارەکانی (سکیت) و (کێمەری) بوونو هەروەها کە عەشایەری دڕی مادیش پەیدا بوو ئاشۆرییەکان بەرەنگاری ئەوانیش بوون ویستیان ئەوانیش بخەنە ژێرچەپۆکی ئیستیعماری خۆیانەوە، بەڵام لە دوای یەك دووجار پێکهاتن بۆ ئاشۆرییەکان دەرکەوت کە بێ دەستکردنی (مادەکان) شتێکی ئاسان نییەو مادەکانیش لە هێزو گوڕی

ئاشۆرییەکان زۆرترساون. جا ئەم دوو حیسابەو لە بەینی ئەم دوو هێزەدا بوومتە هۆی ئەوە کە مادەکان لە تاوانا یەك بگرن و سەرۆکێك هەڵبژێرنو بیکەن بە پادشای خۆیانو لە ژێر فەرموودەی ئەو پادشایەدا بە لەشکرەوە لەرووی ئاشۆرا بوەستن تاکو نەکەونە ژێر چەپۆکیانەوە. ئاشۆرییەکانیش لەشکری زۆریان لە سنوری سەرزەمینی مێدیەدا ڕاگرتووە تا لە هەلکەوتا بچن بە گژیانا بۆ ئەوەی بەتەواوی مادەکان لەناوبەرن. ماد کە توانیویە ڕووبەڕووی ئاشۆر بوەستێت سەختیی وڵاتی میدیە بووە چونکو چیای زاگرۆس قەڵایەکی قایم بووە بۆ (ماد)ەکان. لەسەر ئەوەشا وادەرکەوتووە ئاشۆرییەکان بەئەنجام زاڵبوون بەسەر میدیادا. ئاشۆرییەکان هەندێك پێویستییان خستوومتە سەر مادەکان، وەکو:

(١) هەمووساڵێك (خەرج و باجیان) لێسەندوون.

(٢) لە موڵکی میدیادا سوپای ئاشۆر دانرێت .

(٣) لە تەنگانەدا لەشکری ماد بچێت بۆ یارمەتی ئاشۆر.

جا لەبەر ئەوە مادەکان هەتا ئاشۆر بەشەوکەت بووە هەمیشە سڵیان لێکردوونەتەوەو لە پارێزا وەستاون چەند صەد ساڵێك لەم حاڵەدا ، ئەمجا شارەکەی بە بینای جوان ئاواو بە کۆشكو سەرا ڕازاندوومتەوەو هەر چوار دەوری کردووە بە قەڵا، جا وێرانەی ئەم شارە کۆنە ئێستا لای شاری هەمەدانە. ئەم پادشایە لە زیرەکی خۆیەوە زانیویەتی کە جاریٚ خەریکی یەکگرتنو دامەزراندنی وڵاتەکەی بێت باشترە لە شەڕو شۆڕکردن، بۆیە هەتا دوایی ژیانی خەریکی ئەم کارە خێرانە بووە، وە لەبەر ئەوەشە توانیویە مادەکان دامەزرێنێتو ماڵو حاڵیان ڕێکخاتو فرمانی حکوماتەکەش ڕێبەرێبکات. بەرەکەتدا لەم سەردەمەدا (سەناحریب)ی پادشای گەورەو بە جنگی ئاشۆر لە بابل و عیلاما گیرۆدەی شەڕو هەرا بووە نەیپەرژاوە نەیەڵێت کەی قوباد شاە ئەم جۆرە ڕێکخستنانە بەجێبێنێت لە کیشوەرەکەی خۆیا، لەبەرئەوە کەیقوباد

لە كاتی ٥٠ ساڵی سەڵتەنەكەیان بەمرادی خۆی گەیشتووەو بەبێ دەنگی میدیەیكردووە بە دەوڵەتێكی هێزداری ئەوتۆ كە نەتەوەكانی بتوانن ئیمپراتۆریەتی ئاشۆرلەناوبەرن. لەدوای (كەی قوباد) (فرائۆرە - فەرهاد)ی كوڕی بووەتە شاە. ئەم پادشایەش جارێ لەسەر پێوشوێنی باوكی ڕۆیشتووەو لەگەڵ ئاشۆریەكانا موودارای كردووە، هەندێك عەشایری ئاری كەتازە هاتبوون خستوونیەتە ژێرحوكمی خۆیەوە. لە دوای ئەمە ڕووی كردۆتە جەنووب عەشیرەتەكانی (پارس)یشی كردووە بەدەستەو دانیرەی خۆی. ئیتر حوكمی ماد لە خەلیجی فارسەوە تا بەحری ڕەش لە هەموو ڕۆژاوای ئێراندا ڕۆیشت. ئینجا فەرهاد شاە وایزانیوە كە هێزو دەسەڵاتی مانەندی نییەو شوێن ئەو باوەڕە كەوتووە كە دەرەقەتی ئاشۆرییەكان دێو ئەتوانێ لە میدیە دەریانكات وە ئاواتی نەژادی بێنێتە جێ. بۆیە لە( ٦٣٣ پ.م) دا چووە بەگژ ئاشۆرییەكانا، بەڵام سوپاكەی بەرگەی تەوژمی دوژمنی نەگرت، شكاو خۆیو گەلێك سەرداریشی كوژرا. لە دوای ئەم (كەی ئەخسار)ی برا بچوكی بووەتە حوكمداری ماد. ئەم ذاتە پادشایەكی وریاو تێگەیشتوو بوو. سەركردەیەكی ئازاو هوشیاریشی هەبووە لە شكستی فەرهادی برایەوە زانیبووی كەوا سوپای (میدیە) تا لەسەر نیظامی عەشیرەتی بمێنێت قەت دەرەقەتی سوپای ڕێكوپێكی ئاشۆری نایەت. لەبەرئەوە دەسیكرد بەڕێكخستنی لەشكرەكەیو خستیە ژێر نیظامی عەسكەری ئەو حەلەوە. پیادەی لە سواری جیا كردەوە، چەكی ئەو حەلەی پێدان. بەمانە سوپایەكی پڕچەك و تەعلیم تەواو دروستبوو بۆ میدیە، ناوبانگی چالاكیو ئازایی و سوارییەكەی بلاوبووەوە. چەكیان ڕم، تیروكەوان، شیرو خەنجەر بووە.

کەی ئەخسار لە دوای ئەم دامو دەزگایە کەوتووەتە هەڵسوڕاندنی سیاسەتی دۆستو ڕەفیق پەیدا کردن، لەگەڵ (نابۆ پۆلاسر)ی مەلیکی بابلستانا لە دژی ئاشۆر پەیوەندی بەستو یەکیان گرت کە بە جوتە بچن بە گژ ئاشۆرا[٢٤] . لە ساڵی ٦١٥ پ.م بە (زاموا - لای سلێمانی)ی ئێستادا سوپای (ماد) چووەتە سەروڵاتی ئاشۆر، بۆ سەمتی (ئارافە - کەرکووك)ی ئێستاو داگیریکردووە کە ئەمە بۆ بەجێهێنانی حەرەکاتی جەنگی دوایی سوپای (ماد) زۆر گرنگبووە، چونکو ئێرە لەمەدوا بووەتە (بنکە) بۆ پەلاماردانی وڵاتی ئەصڵی ئاشۆر.

لەم کاتانەدا بۆ قایمکردنی پەیمانەکەی بەینیان (کەی ئەخسار) هاتووە کچی ئاستیاغی کوڕی خۆیداوە بە (نەبۆ خدنەصر- بەختنصر)ی شازادەی بابل. لەشکری ئاشۆر لەم کاتەدا لە هەموو لایەکا گیرۆدەی تەسکینی شۆڕشەکانی ئەقوامی ناوخۆی بوو، تا لەم کاتەدا هاواریان بۆ (کەی ئەخسار) هێنا کەوا عەشایری (سکیت) بە هاندانی ئاشۆرییەکان پەلاماری (میدیە)یداوە. لەسەر ئەمە سوپای (ماد) گەڕاوەتەوە بۆ مادو چووە بەگژ سکیتە کانا شکاندویاننو لە میدیە دەریانکردوون.. لەساڵی (٦١٢پ.م )دا (کەی ئەخسار) دیسان چووەتەوە سەر ئاشۆر، ئەمجارە لەشکری موتەفیقی بابلیشی پیا گەیشتووە. لەبەری ڕۆژئاوای دیجلەوە سوپای کلدان و لە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە سوپای ماد واتە هەردوو سوپاکان چوون بۆ سەر (نەینەوا) کە پایتەختی ئاشۆرییەکانبوو پێچاویانە. ئەمجارەیش (سکیت)ەکان دووبارە بەیارمەتی ئاشۆرییەکانەوە هاتوون، بەڵام ئەم کەرەتە (کەی ئەخسار) پێش دەستیکرد بە هیوای تاڵانی ئاشۆرییەکان ئەم عەشرەتە دڕەشی فریوداو پەیمانی لەگەڵاکردن کە هەرچیەکیان دەسکەوت بەشی بکەن. لەسەر ئەمە (کەی ئەخسار) عینوانی (ئۆممان - ماندا)ی وەرگرت، یەعنی بووەتە پادشای هەموو (ماد، ماتای، سکیت، کیمەری). بەمجۆرە سوپای هەموو لایەك گشتی یەکیگرتو شارەکەیان بە توندی دوورودرێژ پێچاوە هەتا زۆردارانە زەوتیان کردووە. پادشای بەدبەختی ئاشۆر (سین - شار- ئیشکۆم) بۆ ئەوەی بە ساغی نەکەوێتە دەس دوژمن لەگەڵ

---

[٢٤] مێژووی حوکووماتی کوردی ئەمین زەکی بەگ. بەرگی دووەم.

ماڵومناڵیان خۆیان هاویشتووەتە ناو قەڵاکەیان کە ئاگریان تێ بەردابوو، بەو جۆرە مەردانە خۆیان سوتاندووە. ئەمجا یەکگرتووەکانیش شارە ئاواو جوانەکەی (نەینەوا)یان لە دوای تالانکردن سوتاند، وە بۆ ئەوەی جارێکیتر ئاوەدان نەبێتەوە خانووەکانیان هەموو وێرانکرد، بەپێی هەندێ مێژوو ئەم لەناوبردنە لە( ٦٠٦پ.م )دا ڕوویداوە. لەبەشکردنی میراتی ئاشورییەکاندا هەموو سەرزەمینەکانی کوردستانی ئێستای (تورکیا) لەگەڵ شیمالی عێراقی ئیستا، یەعنی تا شاخی حەمرین گشت ڕۆژهەلاتی دیجلە بەر (میدیە) کەوتووە، وە بەشی ناوەندو جەنووبی (عێراق)و (سوریە)و (فەلەستین)یش بەر بابلستان ( یەعنی کلدانییەکان) کەوتووە. جا بەمجۆرە یەکەم دەوڵەتی جیهانگیری عالەم کە زۆرزاڵموخوێنرێژ بوو لەناوچووە. میدیە ئەوەندە گەورە ببوو دەوڵەتەکانی دەوروپشتی مەترسییان لێئەکرد. لە ڕۆژاوای (ئەنادۆڵ)دا ئەوکاتە دەوڵەتی(لیدیە)هەبوو. حکومەتێکی دەوڵەمەندی بەخۆناز بوو لە دەسەلاتداری (میدیە) ڕقی هەڵسابوو، ئەیویست بیشکێنێ.. لەسەرئەوە جەنگێکی دوورودرێژ کەوتووەتە بەینیانەوە.ئەوەندە هەیە لە( ٥٨٥پ.م )دا لەگەرمەی شەڕا وا ڕێکەوتووە ڕۆژ گیراوە، لەسەرئەوە هەردوولا ئەم ڕۆژگیرانەیان بە تووڕەبوونی(خوا)یی داناوەودەسیان لەشەڕهەلگرتووە، وە لە دوایدا ڕێککەوتوون و ئاشتیان بووەتەوەو ڕووباری (هالیاس - قزل ئێرماق)یان داناوە بەسنوور لە بەینی هەردوو دەوڵەتەکەدا، وە بۆ ئەوەی ئەم ئاشتییە قایمتر بێت (کچی) مەلیکی (لیدیە)ش لە (ئاستیاغ)ی کوڕی (کەی ئەخسار) مارەکراوەو بون بەخزمی یەکتری. ئینجا لەدوای ئەم هەموو کەینو بەینەوخزمەتە جوانانە بە ساڵێك، کەی ئەخسار مردووە. ئەوسا (ئاستیاغ)ی کوڕی لەسەرتەختی شاهی میدیە دانیشتووە، جا سەرەتای حکومەتی ئەم (ئاستیاخ)ە شایە بێ شەڕو هەرا ڕابوردووە.

**وتاری تەئریخی:**

کە شەڕو هەرای (میدیە)و (ئاشوڕ) هەلگیرسا سوپای (میدیە)و (ئەتەوەی ماد) ئەیانویست تۆڵەی چەند سەد ساڵە پێشووەکانی یەخسیری ئەزادییان لە ئاشوڕییەکان بسێنن. بۆیە گشت عەشرەتە ئارییەکان دەسیانداوەتە چەکو ڕوویان کردووەتە (ئاشوڕییە). سوپای (ماد) لە( ٦١٢ پ.م) دا بە دوو قۆڵ ڕووی کردووەتە ئاشوڕیە. قۆڵێ یەکەم لە (ئەڕافە - کەرکووك)ی ئێستاوەو قۆڵی

دووەمیش لە ڕێی (ڕەواندوز)ی ئیمڕۆ بەسەر (ئەربەئیللۆ) یەعنی (ئەربیل) شاری موقەددەسی (خواکان)ی ئاشۆرا کەوتووەتە ڕێ. بەڕەوشتی حاڵا وادیارە قۆڵە سوپای هەرە قەوی (ماد) بەرەی (کاردۆخۆ) کان بوو، کە لەم قۆڵی دووەمەدا بووە، چونکە لەوە پێشی لەکاتی حوکمڕانی ئاشۆریدا کاردۆخۆکان لەوناوەدا نەبوونو دیارە کاردۆخۆ بەهۆی هێرش کردنە سەر ئاشۆرییەکانەوە زۆربەڕقەوە، هاتوومو سوپاکەی بەلای (ئاربائیللۆ)دا تێپەڕیوە شارەکەی پێچاوەو زەوتیکردووە، ئینجا ڕوویانکردووەتە سەر نەینەوا ئەوێشیان گرتووەو ئەهالییەکەیان قەلاچۆکردووە، بۆیە لە (مێدیە)وە بێباکانە ئەهالی بەهێرش هاتوون بۆ ئەوناوە. چونکە ئاشۆرییە نەمابوو کە لێی بترسن. شاری ئارەبائیللۆ کە داگیرکرا مادەکان خۆیان تیا دانیشتوون، ئینجا بۆیە پاش لەناوچوونی ئاشۆرییەکان بە دووسەدودە ساڵ کە سوپای شکستەی گەسەنەفۆن گەڕاوەتەوە بۆ یۆنان وبەلای زاخۆی ئێستادا تێپەڕیوە، تووشی هەڵمەتی (کاردۆخۆ) کانی ماد بوونو هەتا سەر دەریای ڕەش لەگەڵ ئەمو عەشرەتەدا بەشەڕ ڕۆیشتوون. جا ئەمە ئەوەمان تێ ئەگەیەنێت ئەو وڵاتانەی ئاشۆر کە ئێستا (کوردستان)ی تورکیاو (کوردستان)ی شیمالی عیراقە لەو حەلەوە بە کوردە فاتیحەکانی (ماد) مەسکوون بووەو ئەوەش بەڕەزامەندی (مێدیە)کراوە چونکە سیاسەتی مێدیە وە هابووە کە لە ئاشۆرییەکان کەس نەمێنێت لەو وڵاتانەدا. جا ئەم تازە هاتووانە ناوی شاری (ئەربەئیللۆ)ی ئاشۆرییان بە گورجی گۆڕیوەو کردوویانە بە (ئەربەل) و لەدواییدا بووەتە (هەولێر) . ئەمە ٢٥٧٠ ساڵە ئەهالی ئەم وڵاتانە بە دێهاتو شارەکانیەوە وەك لەسەرەوە نوسراوە گشتی بووەتە (کاردۆخۆ)ی ئەژادی کوردی ئیمڕۆ، هەرچەندە ئەم چەن وەختە گەلێك نەتەوەی جیهانگیری ئەم وڵاتانەی داگیرکردووە، بەڵام بونیەی نەتەوەکە نەگۆڕاوە، هەر کوردیو هەر کوردبووە. ئینجا قەومایەتی وڵاتی (ئەربەل)و هەموو وڵاتەکانی شیمالی موسڵو لە پشت سنووری عیراقیشەوە گشت سنووری کوردستانی تورکیای ئێستا کە (زەینۆفۆن)ی زانا پیا ڕۆیشتووە لە ئاشۆرییەتیەوە کە بووەتە کوردایەتی جارێکیتر نەگۆڕاوە هەر بەکوردایەتی ماوە. داخی گرانە لە مێژووی گشتیدا ئەم بەسەرهاتانە هیچ تەفسیر نەکراوە چونکە نەتەوەی کورد (کەیان)ی نەبووە کە بەسەرهاتی خۆی (خۆی) بینووسێت و تەفسیری بکاتەوە، کەسێکیتر دەخلی چییە بەسەریەوە؟ قەومی

ئاشوٚر بەو گەورەییە لەناوچووە. لە جیاتی نەتەوەی ئاشوٚر کە نەماوە نەتەوەیەکی (کاردوٚخوٚ) ناو هاتووەتە ولاٚتەکەوە تیا دانیشتووەو بەتەواوی پڕیشی کردووەتەوە. کەچی مێژووە گشتییەکان هیچ لەم بەسەرهاتانە نانووسن و نالێن کە حکومەتی (ماد) ئاشوٚری لەناوبرد، ئەهالی (میدیە) هاتن لەولاٚتەکانی ئاشوٚرا دامەزرانو کردیان بەنیشتمانی خوٚیان. ئیتر لەو کاتەوە لەوێدا ئالوگوٚڕێکیتر نەبووەتەوە.

## پشێوی ولاٚتی مادو هەلسانی قەومی ( پارس — فورس )

لەکاتی کوٚنا عادەت وا بووە دەولەتێکی بەهێز ولاٚتێکی هاوسنووری داگیر بکردایە، یەکەم : سالاٚنە خەرجێك نەخرایە سەر ولاٚتە بەزیوەکە. دووەم: لە شەڕا نەیانبردن بوٚ کوٚمەك. سێیەم: لە بارەگادا پادشاکەیان لای خوارووە دائەنیشت، قەومێکی شکست خواردوو - ئەگەر پێویست نەبوایە لەناو ببرێن- ئەمانەی لای سەروویان لێداوا نەکرا. جا میدیەش لەگەلٚ قەومە بەزیوەکانیا لەسەر ئەم پێودانە ڕوٚیشتووە. کەوا بوو ڕاگرتنی (تابیعیەت) لە کاتێ کوٚنا دلنیایی تیانەبووە، ڕێگای یاخیگەری هەمیشە بەرەلاٚبووە. بوٚیە مێدیە بەهوٚی فتوحاتەکانیەوە ناچاربووە کە دەولەتەکەی ڕێکبخاو ژێر دەستەکانی لەخوٚی نەڕەنجێنێت. جا بەم حیسابە پێویستبوو پادشاکانی مدیە (وریاو) نازاو کارمە بنو سەرداری سوکانی دلسوٚزو وریاو موفتەدیر بن. کەچی (ئاستیاغ) لەو پادشایانە نەبووە کە بتوانێت بە دیرایەتی خوٚی تەختو تاجی دەولەتەکەی بپارێزێت، وە بوٚپێولەتی سەرەڕای ئەم کەمدەسەلاٚتییە هاتووە لە بڕواو ئاینی قەومەکەشیا زوٚرداریکردووە کەوا بەم هوٚیەوە خەلکی ولاٚتەکەش تەنگەتاو بووەو لەگەلٚ زولموزوٚری ترا کە کردوویەتی گەلێك لە ماقوولاٚنی دولەتەکەشی لێڕەنجاوەو ئاژاوە کەوتووەتە (میدیە)وە. لە لایەکی ترەوە ڕزگاربوون. لەم دەورەدا خانەدانی (ئەخەمینی - کەیانی) لە فارسی حوکمیان ئەکرد. ئەمانە هەمو تیرە عەشرەتەکانی (پارس، تیرەکان، پارت) یان بەوریاییو زیرەکی خوٚیان خستبووە ژێردەسەلاٚتی خوٚیانەوە. ئەمجا کە هەستیانکرد پشێوی ڕوویداوە لە میدیەدا، ئەمانیش لێیان ڕاستبوونەوە، مودیری ئەم یاخیگەرییە حوکمداری بەناوبانگی (پارس، فورس) (سیروٚس،کوٚرش، کەیخوسرەو)ی گەورە بووە. ئەم

پیاوە گەورمیە حەوتەمین شای کەیانییەکان بوو. لە نووکەوە تەنیا حاکمی فورس بوون، بەلام لەدوای کزبوونی ئاشوّرییەکان ولاتی (عیلام)یان زەوتکردووە، ئەوسا عینوانی شایەتییان داوە بەخۆیان، واتە بوون بەشای (فارس).( لەسەر ئەوەشا) چونکە (میدیە) لەمان بەهێزتربووە، هێشتا حوکمیان ڕەواجی بووە بەسەرفورسەکانا. ئەوەندە هەیە (میدیە) هیچ پەلپی لە فورسەکان نەگرت کەلەقەبی شایەتییان بۆخۆیان ئیعلانکرد، چونکە بەپێی عەقلیەتی ئەو کاتە ئەوەیان بەگەورەیی دائەنا کە تابیعەکانیان لەقەبی شایەتییان ببێو لە بارەگایانا دانیشن، یەعنی پادشای (مێدیە) شای شاهان بێت.

## لەناو چوونی مێدیە

لەکاتی (ئاستیاغ)دا (کەیخوسرەوی دووەم) کە بە (کوڕی گەورە) بە ناوبانگە، بووەتەحوکمداری فارس. ئەم پیاوە گەورمیە سەرداری هەرە بەڕێزو بەدەسەلاتی کاتی کۆنە. کەچووەتە سەرتەخت لەخۆیا توانای جیهانگیریی شکبردووە، وە کە بێکارەیی ئاستیاغیشی دیوە، دامێنی بزورگەواری کردووە بەلاداو دەستیکردووە بە داگیرکردنی ولاتانی چواردەوری خۆی. هەموو تیرەوقەومەکانی ئێرانی جەنووبی لەژێر سایەی خۆیا کۆکردووەتەوەو کردوونی بەیەك ئەمجا سوپایەکی پڕمەشق و پڕچەکی پێکهێناوە. ئەوکاتە هیچ دەوڵەتێك لەوەچاکتر چەکی نەبووە. لە دوای ئەم خۆ قایم کردنە بۆ جەنگ لە حکومەتی مێدیە یاخی بووەو پەلاماری (ماد)ی داوە. کەیخوسرەوی زرنگو زۆرزان ئاگاداری ناڕێکی ناوخۆی مێدیە بووە. بگرە لە ژێرەوە تەفرەقەشی خستبووە ناویانەوە، هەندێك سەرداری کردبوو بە لایەنگیری خۆیو وایلێکردبوون لە کاتی جەنگدا لە ئاستیاغ شا هەلگەڕانەوەو بە لەشکری خۆیانەوە لایانداوەتە لای سوپای خوسرەو. بەم خەیانەتە لەشکری ئەستیاغ شا زۆرکزبووە. لەسەر ئەوەشا هەردوولا کە دەستیانکردوە بە جەنگ، پاشماوەی لەشکری (مێدیە) بۆ ڕاگرتنی شەرەفی قەومەکەی، شەڕێکی زۆر مەردانەی

لەگەڵ هۆردووی کەیخوسرەوا کردوودو عامبازی دوژمن بوومو زۆریان لێ کوشتوون. بەڵام ئەم ئازایی دواییە دادی نەداوە، لەدوای کوشتارێکی زۆر مادەکان شکاون بەجۆرێکی وەها شکاون کە لەگەڵ (شاهی ماد) دا گەلێك سەردارو پیاو ماقوڵیش کەوتووە کە لە ساڵی( ٥٥٠پ.م) دا بووە ئاستیاغ بەسەرومالەوە تیاچوومو دەوڵەتی (مێدیە)شی لەناوبردووە. چونکە لەدوای ئەم سەرکەوتنە کەیخوسرەو لە ناقباتاندا هەموو سەردارەکانی مێدیەو پیاو ماقووڵی (پارس)و سەرکردەی کۆمارەکانی تری ئاری کۆکردووەتەوە، لەمانە (مونتەمەر)ێکی گشتی قەومی مێژوویی پێکهێناوە. لەم کۆگای میللییەدا لەدوای مەشوەرەت بەڵێن دراوە لەسەر (عەزل) کردنی ئاستیاغ لە (شایەتی) و بانگدانی (پادشایەتی)ی کەیخوسرەو لەسەر هەموو کیشوەری (ئێران)و سەرزەمینەکانی تری (مێدیە)[٢٥]. وتمان، بەڵکو کردگاری جوانتری بەجێهێناوە لەمەولا، وەکو: لەدوای ئەم کۆنگرەو قەرارانە لە ئیشوفرمانی حکومەتییا لەگەڵ سەردارو پیاوماقووڵی مێدیە کردەوەی شیرینو جوانی بەجێهێناوە. فەرقی پیاوماقووڵی (فورس و ماد)نەکراوە. حقوق و ئیمتیازیان چوون یەکبووە، وەکو یەك ڕایگرتوون لە مەجالیسو دانیشتنو رابواردنا. لەلایەکی تریشەوە ئەو حوکمو زۆرداریە کە ئاستیاغ دایناوو لەسەر ئایینی قەومی ماد کەیخوسرەو لەسەری لابردوون. بەکورتی، ئەم سیاسەتی نەرم و بەنرخی شاهانەیە بوومتە هۆی ئەوە کە مادەکان لەم ئاڵوگۆڕە دڵ شکست نەماون چونکو نەیاندی وەك ئەهلی وەطەن تەماشا نەکرێن وە لەگەڵ فورسەکانا

---

[٢٥] لە کتێبی کوردو کوردستانی محمد امین زکی، بەرگی دووەم لە ٣٢. ٣٣ وە لە نووسراوەکان تۆفیق وەهبی و مێژووی شیخ محمد مەردۆخی ئێران کەڵك وەرگیراوە بۆ ئەم باسانە.

چونیەك ڕائەگیرێن. لەبەرئەوە بە حكومەتەكەی كەیخوسرەوشاهەوە گورجو گولْ نوساون. جا ئەم تەرحە یەكگرتنو تیكەلْ بوونەیە بووەتە هۆی پەیدابوونی ئیمپەراتۆریەتی گەورەی ئێرانو بە ئاسانی لەناوچوونی حكومەتی مێدیەی كۆن، تەنانەت ناوی (ماد) زۆر زوو لەبیرچووەتەوە. لە دوای ئەمە لەژێر سایەی ئەم دەولەتە جیهانگیرەدا هەموو تیرە نەتەوەی بچووك و گەورەو كۆن و تازەی ئاری تێكەلاو بووەو بناغەی نەتەوایەتی ئێستای ڕۆژهەلاتی (ئەنادۆلْ )و شیمالی عێراقو هەموو ئێران، لەسەر ڕەنگی دوایی دامەزراوە. بەكورتی حكومەتی (ماد) لەدوای حوكمڕانییەكی سەدوپەنجا ساڵی بە ئینقلابێكی گرنگی مێژوویی لەناوچووەو لەجێی ئەو دووەم دەولەتی جیهانگیری لە مێژووی گشتیدا كە دەولەتی (ئەخەمەنی ئێران)ە پەیدابووە.

## حکومەتی (فارس - ئێران)ی کۆن (٥٥٠ پ.ن.م)

وەکو لای سەرەوە باسکرا، ئیمپراتۆریەتی (ئێرانی کۆن) پادشای بزورگەواری (ئەخەمەنی)ی فارس (کەیخوسرەوشای دووەم) دایمەزراند، لەدوای ئەوە کە بەیەك هەڵمەتی کوشندە دەوڵەتی (ماد)ی لەناوبرد. کیشوەری (فارس)ناوچەی جەنووبی ڕۆژاوای ئێرانە لەسەر کەناری خەلیجی فارس عەشایری (ناری)دوایی کە بە کۆچو ڕەو هاتوون لەوێ باریان خستووە لە سنووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی عیلام (ئیلام)دا. عیلام ئەو کاتە پەرێشانبوو بەدەس سوپای ئاشۆرییەوە. ئەمانە دەستوریان هەبوو، سەرۆکی تیرە عەشرەتەکان کۆئەبونەوە یەکێکیان هەڵئەبژارد ئەیانکرد بە (سەرۆکی گشتی)ی هەموویان. جا لەو کاتەدا سەرۆکی گشتی لە خێزانی (ئەخەمەنی) هەڵبژێررابوو. ئەم خانەدانە (ئەنشانی) وەیا (ئەنزانی)بوون، ئەوەتە لای جەنووبی ڕۆژهەڵاتی لوڕستانی ئێستا. ئەمانە لە پێشەوە هەر بەسەر (فارس)دا حوکمیان کردووە، تەنانەت وەکو لە مێژووی( ماد)دا وترا ئەمانە سەردەمێك لەژێرحوکمی مادیشا بوون. ئەمەش ئەو کاتە بوو کە ئاشۆرییەکان خەریکبوو کزئەبوون. سەرداری گشتی فورسەکان ئەو کاتە مەلیکایەتی خۆی ئیعلانکرد ناوچەی خوراسانیشی داگیرکرد کە عێلانی (پارت)(هێزەکان- خوراسان)ی تیا دانیشتبوو، بەپێی کیتابەی (بەهەشتوون)و وتەی (مستەر هۆڵ) خێزانی ئەخەمەنی لەناوەندی سەدەی حەوتەمی پێش میلادا لەسەر تەختی (شاهەنشاهی) دانیشتوون. بەڵام لەدوای دووەم حوکمدار خانەدانی مەلیکیی بوومتە دوو قۆڵ. مێژووی ئیرانی کۆن ئەڵێت: قۆڵێکیان (پارس)و ئەویتریان (ئەنزانی) بوومو مستەرهۆڵ وتوویە لەبەری ئەنزانی چوارپاشا، وە لەبەری پارسی، سێحوکمدار هاتووە (قوروس - کورِ کەیخوسرەو)ی دووەم کە مێژوو بە خوسرەوی گەورەی ناوناوە حەوتەمین پادشایە وە لەبەری ئەنزانییە[1]. لەباسی حکومەتی فورسدا ئەم تۆزە زانستییە کە لەسەرەوە نوسراوە بەسە بۆکتێبەکەی ئێمە، چونکە ئەدواری مێژوویی حوکوومی فارسی کۆن، کەهی کاتی (کەیانی، ئەشکانی، وساسانی)یەکانە لە مێژووی ئێرانا نوسراوە. وە هەرچەندە خزمایەتی قەومی (کورد)و (فورس) شتێکی ئاشکرایە، بەڵام لەبەرئەوەی پێویستی ئێمە باسکردنی مێژووی تایبەتی (کورد)ە، بۆیە لەبابەت سەرگوزەشتی مێژوویی (فورس)ی کۆنەوە هەر لەم ئەختە زانینە وازمان هێنا.

---

[1] مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك (هۆڵ) لاپەڕە ٥٥ لە مێژووی ئەمین زەکی بەگ بەرگی دووەم لاپەڕە ٢٢-٢٣.

## ناوی (کورد)چلۆن ساغ بووەتەوە؟

هەتا ئێرە باسی هەردوو دەستە قەومە کۆنەکانمان کرد کەوا لە (کوردستان) ژیاونو نەتەوەی کوردی ئێستایان لێهەلکەوتووە. لەمەودواش، یەعنی لەدوای لەناوچوونی (مێدیە)وە کە دەوری تطوری دوایی کوردە، باسی ئەوە ئەکەین کە نەتەوەی کورد هەتا پەیابوونی ئیسلامیەت چی بەسەرهاتووە. ئەم دەورە لە (٥٥٠ پ.م )ەوە تا ٦٤٢ پ.م کە کەیانی ناری کۆنی تیا ڕووخاوەو ئیسلامیەت پەیدابووە، دەوام ئەکات. بەمەدا دیارە ساغبووەتەوە بونیەی میللەتی کورد لەسەر ڕووکار (شکڵ)ی ئێستایان نزیکەی ١٢٠٠ ساڵی پێچووە، چونکە ناوی (کورد و کوردایەتی) لەم دەورەیەدا بەتەواوی ساغ بووەتەوەو لەگەڵ ئەوەدا ناوە کۆنەکانیشی یەکە یەکە کوێر بووەتەوە یەعنی هەرچی تیرە قەومەکانی کوردستان هەیە کە لە (مێدیە)ی جارانا ژیاون تێکڕای ناوی کوردیان لەسەر ساغبووەتەوە. بەتەواوی کەس نایزانێ ئەم ناوە چلۆن ساغ بووەتەوە، لەم ڕووەوە زانای ئەقوامو متخصصینی زمان گەلێك وردبوونەوە، گشتیان ئەڵێن ناوی کورد لە ناوێکی وەك ناوەکەی خۆی پەید بووە. هەرچەندە باسەکەی لای خواروو لەسەرەتای کتێبەکەدا بەکورتی وتراوە، بەلا زۆرپێویستبوو لێرەشا دووبارەی بکەینەوە. لەبەرئەوە دوبارەمان کردووەتەوە. لە مێژووەکانی ٢-٣ هەزار ساڵی پێش میلادا ناوی نەتەوەی (گۆتی) لەناو باسو هەواڵی (سۆمەر)و (ئەکاد)دا براوەو لە ئەلواحی دۆزراوەی دوو هەزار ساڵ پێش میلاددا باسی وڵاتی (کارداکا) کراوە لە (کوردستان)ی ئێستای تورکیادا بووە، وە لە مێژووی (ئاشۆر)یشا بە بۆنەی ڕووداو لە بەینی خەڵکی کوردستانو ئاشۆرەکانا زۆر باسی نەتەوەی (گۆتی، کورتی، کاردۆ)کراوە، وە لە نوسراوی ئارامییەکانیشا، ئەمانە ناویانهاتووە (کرت)یان پێوتوون. (ئیسترابۆن) ناو زانای یۆنانیش پێی وتوو (کورتی)و لە کۆچو ڕەوی تیرە عێلەکانی (ماد)دا یەکێکیان کە (کاردۆخۆ)ی ناوبوو، چووەتە سەرزەمینی(ئۆرارتۆ)و (نایری)یەوە لەوێ دامەزراوە کە ناوپشتەی کوردستانی تورکیای ئیمڕۆیە. وە هەروەها لەکاتی حوکمی وایەکانی (ئەسکەندەر)و

بەتایبەتی لەکاتی دەسەڵاتی دەوڵەتی (ڕۆم)دا بەم وڵاتانە (کوردۆئەن)و بەخەڵکەکەی (کوردۆ)بێژراوە (٢٥٠پ.ن.م). بەکورتی: بەرەودوا نـاوی دانیشتوانی کۆنی کوردستانی ئیمڕۆ وە ناوی(سیرتی، کاردۆك، کورتیوی، کوردۆکی، کاردۆخۆ، کوردۆشی، بەکاردا، کاڵدی، خالدی، گۆتی، کورتی، کەرت، کوردۆ) لەلایەن مێژونووسە کۆنـەکانو ئیدارەی حکومەتەکانی کاتی هەزارساڵی پێش میلادەوە ئەم ناوانە لای سەروو نـاو نوسکراوەو بەبۆنـەی جەنگو جۆو داگیرکردنی مۆڵکـو شـتو هاشـەوە لەگـەڵێك جێگـای تریشـا هەربـەمجۆرە باسی ئـەم قەومانـەکراوە کـە ئـەو شـوێنانە ناوجەرگـەی کوردسـتانی ئەصڵی ئیمڕۆیە، وە لەسەرەتای ئیسلامیەتەکانی ٤٠٠ ساڵی هیجری سـەلجووقییەکان بەناوچەی (میدیە)ی جارانیان وتووە (کوردستان)وە بەخەڵکەکەی ئەوناوەیان وتـووە (کورد). جا ئەم وشە چەوتانە کە بەتەواوی ناچنـەوە سەروشـەی کـورد. بێگومـان لـە بەر چەوتیو ئیختیلافی لەهجەو زمانی قەومەکانی ئـەو حەلەیـە ناچنـەوە سـەریەك، لەناو وتاری قەومەکانی ئێستاشا ئەم جۆرە چەوتایەتی زمان و وتنـە هـەر هەیـە. جا گریمـان ئـەم ناوانــە هیچیـان بەتــەواوی وشـەی (کـورد)ئەگرێــتەوە، خۆچۆنیـەتیو نزیکییان بەیەکتری قسەی تیا نییە. ئایا ناگونجێ بڵێین بەدرێژایی زەمان ئـەم ناوانـە تطوری کـردووەو لەسـەر وشـەی (کـورد)سـاغبوومتەوە؟. مێـژوو لـەم تـەحرە شـت دروستکردنانەدا زۆرئازایە، وەکو: لەپێش ئیسلامییەتا ناوی (عەرەب)هیچ وەك ئێستا دنیـای نـەگرتبووەوە بگـرە ئەوحەلـە بەهـەندێك عەشـایری نـاو عەرەبستان بێـژراوە (عەرەب)، کەچی لەدوای فتوحاتی ئیسلام ئەوەتە ئەبینین ئەم ناوە بەهەموو لایەکی جیهانا بڵاوبووەتەوە، گشت ئەقوامی (سامی)و (غەیری سامی)خستووەتە نـاو باوەشـی خۆیـەوە، بـەپێی مێژووی میسرییەکان لـە نەتـەوەی (قبطی)ن ولەڕەسـەنی (حـام)ن، کەچی بەپێی تطوراتـی مێژوویی ئەوەتـە بوونەتـە (عـەرەب). لەمێژووی ئـەمریکادا حاڵی حازر ئەم جۆرە تطورە ئەوەندە زۆرە ئەبێتەوە. لەوێ نـەك نـاوی نەتەوەیـەك، بەڵکو ناوی پیاوێك بەسەروڵاتێك وە یانەتەوەیەکا بڕوا. ئەی ناوی نەتــەوەی ئینگلیز ئێستا؟ لـە تطورتێکی وەها دروست نـەبووە؟ ئـەی چییـە؟ نـاوی (ئـانگل ساکسـۆن-بریتۆن نۆرماند)کە چوار نەتەوە بوون لە بـەریتانیا چی لێهاتووە؟ ئـەم چوار نـاوە

چلۆن بووەتە ناوی ئینگلیز؟ غەیر ئەم نەتەوانە لە بەریتانیادا ئاوێتەی یەك بوون و (انصهار)یان کردووە، لەباتی هەرچوارناوەکە وتەی (ئینگلیز)بەجێماوە؟ جا ئە تطوراتانەی لای سەروو نموونەیەکی تەئریخییە ئەگونجێ لە مێژووەکەی لای ئێمەش عەینی تطور دروستبووبێت. یەعنی قەومە باسکراوەکانی لای سەرووی خۆیشمان گ گشتی لە کوردستانا ژیاوەو ئێستا لە جێی ئەوان تەنیا ناوی کوردو نەتەوەی کور پایەدار ماوەتەوە، مەعنای ئەوەیە کە ئەو نەتەوانە گشتی لە نەتەوەی (کورد)ا (انصهار)ی کردووەو براوەتەوە!.

## دوای لەناوچوونی (ماد) مێژووی کورد

وەکو لای سەرەوە باسکرا، دوای لە ناوچوونی حکومەتی (ماد) هەمو سەرزەمینەکانی (کوردستان) لەناو میرانی مادا بۆ دەوڵەتی (ئەخەمەنی- کەیانییان فارس ماوەتەوە. ئەگەرچی لەدوای (کۆڕ) بەقیتی (موغەکانی ماد)یەعنی مەلاکان، بۆ سەندنەوەی سەربەخۆیی جاران (غۆماتا) ناو سەردارێکو جارێکی تریش (فەرائۆرتیش - فەرهاد)ناو سەردارێکی تری ماد لە کەیانییەکان هەڵساونەوەو ویستوویانە دووبارە حکومەتی نەتەوەیی خۆیان دروست کەنەوە بەڵام ئەم هەراپان سەری نەگرتووەو لەلایەن (داریوش)شاوە تەفروتووناکراوە، وە هەراکەش لە چەشنی یاخی گەرینا حووەتە مێژووەوە نەك (شۆڕشی ئازادی)، (٥١٨پ.ت.م). داریوش ئە سەرکەوتنەی لەسەر لەوحەی (بەهیشتوون) لای (کرماشان) نوسیوە بۆئەوەی هەمو کەس بیبینێت لەسەرشەقامی گشتی ڕێبوارانا لە ئێران لای بێستوون دانراوە. ئینج ئەم سەرزەمینانە لەوحەلەوە تا هێرشی (ئەسکەندەر)ی گەورە کە دووسەد ساڵێك ئەگرێتەوە، لەژێرحوکمی کەیانییەکانا ماوە. بەئەمروفەرمانی شاهانی (ئەخەمەنی گەلێك لە یاخیگەرەکان تەعجیرکراون بۆجەئووبی ئێران لای لورستانی ئیستا لەوێ دایانمەزراندون. بۆئەوەی چاوی یاخیگەرانی پێبشکێت، لەسەر ئەوەشا یاخیگەریی هەرڕوویداوەو دەربەدەری تریشکراوەتەوە شك نییە بەشی زۆری ئەم دەربەدەرانە (کاردۆخ)ەکان بوون. لە دەوری ئەردەشێر شادا کەیخوسرەوی برای شاە، کە والی

ئەنادۆلْ بوو، یاخیبووەو ویستوویەتی تەخت وتاجی ئێران لە ئەردەشێری برای داگیربکات، جا ئەم شازادەیە بە سوپای فورسەوە ڕوویکردووەتە ئێران. لەم لەشکرە بەکرێگیراوەدا ١٣ هەزار سەربازی یۆنانیش بۆ کۆمەك لەخزمەت شازادەخوسرەو بووە. کەچی ئەم شازادە بەدبەختە لە شەڕا کوژرا لە عێراقو لەشکرەکەی شکا. جا گەسەنۆفۆن ناو جەنەڕاڵێکی یۆنانی لەناویانا بووەتە سەرداری ئەم شکستەیە لە مێژووی (٣٠٢ پ.م)دا. ئەمانە گەڕاونەتەوە بۆ یۆنان، جا ئەم جەنەڕاڵە بە یۆنانی کتێبی (ئەنا بازیس)ی بەناوی ئەم سەفەرەوە نوسیوەو ناوینناوە (گەڕانەوەی دەهەزاران) لەوێدا وتوویە، هەرلەمزاخۆوە تا نزیك دەریای ڕەش بەناوی قەومی کاردۆخۆدا بەشەڕکردن هاتووین، چونکە کوردەکان وازیان لێنەهێناوین..تا ئەوجەلە ناوی ئەم نەتەوەیە بڵاونەبوبووەوەو لەڕوداوی مێژووەکانا نەنوسراوە، وە یا ناویان نەهێنراوە، بگرە ئەمە هەوەلْ کەرەت بوو. (گەسەنۆفۆن) لە کتێبەکەیا باسیکردوون. لە سەرگوزشتەکەیا ئەڵێت: (ئەم نەتەوەی کاردۆخۆیە قەت سەری بۆحکومەتی ئێران دانەنەواندووە. تەنانەت جارێکیان، پادشای ئێران لەشکرێکی ١٢٠ هەزار کەسی ناردووەتە سەریان کە بەزۆر بیانخاتە ژێرحوکمی خۆیەوە، بەڵام لەدوای جەنگێکی خوێنین ئەمانە لەشکرەکەی شاهیان شەقوپەق کردووە))[٢]. بەمەدا دیارە نەتەوەی کورد لە دەوری حکوماتی (مێدیە)ش و (کەیانی)یشا وەك سەربەخۆ وەهابوون. وڵاتەکەیان هەر بەناو لە جیسمی ئیمپەراتۆریەتی ئێرانا بووە. بەڕاستی ئەم نەتەوانە بەرەودوا لەکاتی حکوماتی دوای ئەمانیشا بەناوو هەربەڕەسمیات مسکێنی حکومات بوون، بۆ تاڵانکردن لەگەڵ لەشکری شاه ئەچوون بۆ شەڕو تاڵانییان ئەهێنا. بەڵام کە زۆریان بۆ هاتبێت گەڕاونەتەوە. بەمجۆرە لەدەوری (ماکدۆنی)و (ساسانی)دا هەتا حکومەت بەهێزبوو بێت سەرپێچییان نەبووە. لەکاتی ئاژاوەی ناوخۆدا ئاڵای یاخیگەرییان هەڵکردووە لەژێر فەرمانی سەرۆکی خۆیانا، نەیانهێشتووە (کەس) حوکمیان بەسەردا بکات. ئەوەندە هەیە رەسمەن بەحکومەت نەناسراون. ڕەنگە لەناو

---

[٢] مێژووی کوردی أحمد رفیق، بەرگی یۆنانیو، مێژووی امین زکی، بەرگی دووەم.

یەکتریشا پێکەوە نەنوسابن. ئەگینا هەستیان بەهێزو توانای خۆیان ئەکردو، (تامو ئازادیو سەربەخۆیی ئەبووە (کەڵکەڵە)بۆیان.

دەوڵەتی کەیانیانی ئێران (ئەسکەندەری گەورە) لەناوی برد لە (۳۳۰پ.ن.م) دا، لەدوای ئەسکەندەر کیشوەری کوردستان یەعنی (مادو گۆردۆ ئەمین) کەوتووەتە ژێ حوکمی (سەلفکۆسەکان) کە میراتگری ئەسکەندەر بوون. ئەمانە لە سوریە حکومەتە گەورەکەی خۆیان ئیدارە ئەکرد، لەم کاتەدا بەشەڕوشۆڕی ناوخۆ سەردەمێکیش کوردەکان بوون بە مسکێنی ئەرمەنی لەسەدەی دووەمی پ.ن.م بەدواو با ئەوەش بزانین کە ئێران زوو لە حوکمی سەلفکۆسەکان خۆی ڕزگارکردو دەوڵەت (پارت – ئەشکانی) لە ئێرانا پێکهێناوە لە ناوەندی سەدەی سێهەما (۲۵۰ پ.ن.م سەلفکۆسەکان کە میراتگری ئەسکەندەر بوون لەگەڵ حکومەتی ئەشکانی تازەدا ک دەوڵەتی ئێرانی زیندوو کردبووەوە هەمیشە لە شەڕو بەربەرەکانێیا بوو. مەیدا ئەم هەراو هوریایانە زۆری لە ئەرمەنستانو کوردستاندا ڕوویداوە. لەدواییدا ک دەوڵەتی ڕۆماش پەیدابوو دەسیکرد بە جیهانگیریکردن، جارێ سەلفکۆسەکانیان لەن بردووە، چونکە دەستەویەخە ئەوان لە پێشەوە بوون. ئینجا بەزمی ڕقەبەریکرد کەوتە بەینی ڕۆمو ئەشکانییەکانەوە هەر لەسەدەی یەکەمی پێش میلادەوە ئاخریو ئۆخری سەدەی حەوتەمی پاش میلادو پەیدابوونی ئیسلامیەت کە نزیک ۷۰۰ ساڵ ئەکا. بەربەرەکانی ئەمانە لەگەڵ خانەدانی ئەشکانیو ساسانی ئێر ئەپساوەتەوە. زوربەی ئەم جەنگانەش لە خاکی پاکی کوردستانابووە. ڕۆمەکا خۆیان بە کوردستانیان وتووە (کوردۆنن) یەعنی کوردستان ناوێکی کۆنە. چونک سەرەڕێ بوو لە بەینی ئەم دوو دەوڵەتە ڕۆژهەلاتیو ڕۆژئاواییەدا، هەر یەکە لەماز ویستویەتی کوردستانی بۆ بمێنێتەوە تاکو بتوانێت بەسەر ئاسیای ڕۆژئاوادا زاڵبێ لەناو کۆییدا ئەوی زەرەرمەند بووە بە طەبیعەتی حاڵ کوردو ئەرمەنەکان بوو چونکە نیشتمانەکەی ئەمانە لەژێر پێی لەشکری هەردوولادا وێران بووە، بەرەکەتد کوردەکان ئیشیان بەوە چاکبووە کە فاتیحەکانیان هەمیشە بەبێگانە ژماردووە، زووتر هەرلە بۆ ڤازانج (مەسڵەحەت) بەدوایانەوە بوون. لەگەڵ ئەوەشا مشور ئەوەیانخواردووە کە بە زەرەری کەمتر ڕزگار ببن، ئەگینا ئەم شەڕو هەڵمەتە د براوانە ئەکوردیان ئەهێشتو ئەکوردستانو ئەئەرمەنستان. هەنگامی ئەشکانییەکا تاکو ۲۲٤ پ.ن.م درێژەی کێشاوە. ئەمانە لەبەرهەرای بەردەوامی ڕۆم ئەیانپەرژا

نیسلاحاتێکی بەکەڵك لە کوردستانا بکەن. (دین کەرت) ناو کتێبی ئایینی زەردەشتییەکان لەم دەورەداو لە ناوەندی سەدەی یەکەمی دوای میلادا کۆ کراوەتەوە[2].
لە ٦٠ پ.م بەدواوە وڵاتەکانی ئەرمەنستانو کوردستانو مادی بچوك توشی هەڵمەتی نەتەوەی (ئالان)و (گورجی)بووە. ئەمانە (ئاری) نەژادبوون. ئەو وڵاتانەیان بێزاوە. حکومەتی ئەشکانی هیچ بەهاواری خەڵکی ئەو ناوەوە نەچووە، بەڵکو عەشایری کوردو ئەرمەن خۆیان لەم عەشایرە کێوییانە ڕاپەڕیون، مەردانە بەرامبەریان ڕاوەستاونو بەربەستیان کردوون. لەسەدەی یەکەمی پاش میلاد بەدواوە کوردستان بەرەنگاری هەڵمەتی قەیسەری بەناوبانگی ڕۆم (ترازان)بووە. ئەم قەیسەرە حکومەتی ئەرمەنی لەناوبردو کوردەکانیشی شپرزە کرد. لەم کوردانە هەرچی توانیویە ڕاویەتیە کێو، یەعنی قەڵا سروشتییەکەی خۆی، تا فەرتەنەی (قەیسەر) تێپەڕ بووە.
ـەکاتی ساسانییەکانا دووبەرەکی ڕۆمو ئێران گەرمتر بووە، چونکو ساسانییەکان خۆیان بەمیراتگری ئەشکانییەکان دانـاوە، ویستویانە ڕۆمەکان لەوڵاتی کوردستان کەنە دەرەوە. بەهۆی ئەم بیرەوە هەمیشە خەریکی لەشکر ئارایی و جەنگ بەرپاکردن ـوون. (ئەردەشێری پاپەکان)کە بناغەی خانەدانی ساسانی دانـاوە، ڕۆمەکانی ـکاندووەو ئایینی زەردەشتی کردووە بە ئایینی ڕەسمی دەوڵەتی ئێرانو بووەتە احەزی ئایینەکانی تر. لەدڵی ساسانییەکانا هێزێکی گەرماوگەرمی قەومایەتی ئاری)هەبووە، لەگوێ ڕووباری (دیجلە) شاری تێسفوون (مەدائین)یان ناوا ـردووەتەوەو کردوویانە بە پایتەختی زستانەو بەهاوینیش ئەچوونەوە ـوێستانەکانی ئێران. تاقی (کیسرا) ئەمان دروستیان کردووە. ڕۆمەکانیش لەدەورەی ڕۆمی (وان) حکومەتێکی ئەرمەنییان پێکهێنابوو ئەیانویست بیکەنە چەکوشی شەڕو یانکەن بە گژ ئێرانیەکانا، ئەمانەت بۆ دڵخۆشکردنی ئەرمەنەکان هەندێك ناوچەی وردستانیشیان دابوونێ. لەبەرئەوەی ڕۆمەکان ببوونە (مەسیحی) بەمهۆیەوە ئەرمەنەکانیش لەدوای ٣٠٠ ساڵی پاش میلاد بەبیرێکی سیاسیو بۆ مەسەلەتی هومی خۆیان چوونەبەر ئەم ئایینە. چونکە کوردەکان لەسەر ئایینی نەژادی خۆیان ابوونەوە، ئەمجا بەتەواوی بوونە ناحەزی ئەرمەنەکان و بەئاشکرا بوونە لایەنگری ـەوڵەتی ئێران. لەبەرئەمەیە کە لەم تەئریخە بەدواوە ڕقەبەری سیاسی، دوو بەرەکی

---

[2] مێژووی امین زکی بەگ، بەرگی یەکەم.

ئاینیی چووه سەر. ئەمە گەشەی داوە بەتەفرەقەو مالوێرانیی هەردوولا. شای ئێران بەناوی ئاینەوە گەلێك کوشتاری لە ئەرمەنەکان کردووە. ئەرمەنەکانیش لە هەلکەوتا تۆلەیان لە کوردەکان کردووەتەوە. وە لە دەوری (شاپوور) شاو (بارامی گۆڕ)دا لەشکری ڕۆمو ئێران لە کوردستانا زۆر بە گژ یەکا چوون...لەسەدەی شەشەمی زاینیدا عەشایری (گۆران)ی کورد بەسەرداری (گوانانرا) ناو سەرۆکێکیان هەلساونە پێو داوای سەربەخۆییان لە شاهی ئێران کردووە. تومەز خەیالی (ئازادیو سەربەخۆیی)مەزەی کوردەکانی بزوتووە. وەحکومەتی ئێرانیشیان کزو بێهێز دیوە. بۆیە ئازایانە ئەم قیامەیان کردووە. تەنانەت حکومەتێکی بەجێو بەڕێیشیان پێکەوە ناوە، شاری (کرماشان)یان کردووە بەپایتەخت، وە تا ئازەربایجان حوکمودەسەلاتیان ڕۆیشتووە. لەسەرئەوەشا وادیارە پادشاکانی ساسانی،دەستوبرد لەشکریان بردووەتە سەر ئەم حکومەتە تازەیەو نەیانهێشتووە خێر لە (ئازادی)ی خۆیان ببینن، بەلکو حکومەتەکەیان لەناوبردوون.

لەکاتی (نەوشیروان)(خوسرەوی پەروێز)دا بەینێك ئێرانییەکان زالبوونەوە بەسەردەولەتی ڕۆمی بێزانسی وەیا ڕۆژهەلاتا. بەلام قەیسەر (هەراقلیۆس)لە دوایىدا خۆیکۆکردووەتەوە بەلەشکری زۆرەوەو لە ئەرمەنستانو کوردستانەوە گەلێك سەفەریکردووەتە سەرئێرانو زۆر زەرەری خستووەتەوەو خوێنی ڕشتووە لە کوردو لە ئێرانییان، چووەتە ئێرانو (ئاتەشکەدە)کانی روخاندووە. تەنانەت (ئاتەشکەدە)ی (ئازەر کوشتاسب)یش بەو ناودارییە لەوێرانبوونو بەتالان چوون ڕزگاری نەبووە. لەسەردەمی (خوسرەوی پەروێز)دا ئەم مەینەتانە کوردستانی شڕوهوڕ کردووە. وە بەتایبەتی ناوچەی (شارەزوور) زۆر پەرێشانبووە. شارودێهات لەژێرپێی لەشکری هەرقەلی قەیسەردا لەناوچووە. تەنانەت (هەرقەل) بەمە دەستی هەلنەگرتووە بەلکو بەدوای خەسرەو شاهدا چووەتە (ئەردەلان) لەوێیش دەریپەڕاندووە. جا لەمکاتەدا بووە کە ئاینی پیرۆزی (ئیسلام)لە (مەککە) دەرکەوتووەو، چاوی عالەمی ئینسانیەتی ڕووناککردووەتەوە. حەزرەتی محەمەد (ص)لە( ٥٧١ پا.م )دا تەشریفی هێناوەتە دنیاو لە( ٦٢١ پا.م )یشا بانگی ئیسلامەتی فەرمووە، وە لە( ٦٢٢ پا.م )دا تەشریفی بردووە بۆ مەدینەو لە( ٦٣٢پا.م )لەوێ وەفاتیکردووە. بەمە مێژووی هەوالی (کورد)ی پێش ئیسلامیەت ئەبڕێتەوە. وە لەبەرئەوەی هەموو ئەتەوەی کورد چووەتە سەر ئاینی ئیسلامیەت ئەمەیش بۆی بووەتە دەورێکی تازەو ژیانێکی

ئەوظوهوور، بۆیە لێرەدا کۆتایی بەداستانی پێشوو ئەهێنین لە فەسڵێکی تازە باسی هەواڵی دوای ئیسلامبوونیان ئەکەین[4].

**مادی بچووك ( لە ٣٢٠ پێ.م موە تا ٣٢ پێ. م )**

هەندێك مێژوزان وڵاتی مادیان داناوە بە دوو بەش:

١- مادی گەورە کە بریتیبووە لەسەرزەمینی کوردستانی تورکیاو عێراق، وە بێجگە لە (لوڕستان)و (بەختیاری) هەموو کوردستانی ئێران، یەعنی (میدیە)ی جاران.

٢- مادی بچوك کە برتییە لە وڵاتی ئازەربایجان وەیا ئاترۆپاتین. ڕەنگە ناوی ئازەربایجان لەناوەکەی دوایی دروستبووبێت. ناوی بەشی دووەم لەپاش داگیرکردنی ئێران لە لایەن (ئەسکەندەری گەورە)وە پەیدا بووە. ئەویش بەناوی (ساتراپ)ەکەی ئەسکەندەرەوە کە والی ئازەربایجان بووە ناونراوە. ئەم ساتراپە وەك والییەکی سەربەخۆ هەڵسووڕاوە لەوێ. وا دەرئەکەوێ لە دوای (ئەسکەندەر) کە دوڵەتی (سەلفکۆس) پەیدا بوو، لەبەر زلیو گەورەیی دەوڵەتەکەو دووری ئازەربایجان لە (مەرکەز)ی حکومەتەوە، والی ئازەربایجان یەعنی (مادی بچووك) جۆرە سەربەخۆییەکی پەیداکردووەو، کە دەوڵەتی ئەشکانیش لە ئێرانا دروستبوو ئەم سەربەخۆیی مادی بچووکە هەر دەوامیکردووە، چونکو ئەشکانییەکان (پارت) جارێ گیرۆدەی سەلفکۆسەکان بوون نەیانپەرژاوە بەمادی بچووکەوە خەریکبن. بەمەدا دیارە حکومەتی مادی بچووك کە بە حکومەتێکی کۆنی کورد ئەژمێررێت، گەلێك ژیاوەو تا تەئریخی ٣٢ پێ.م بەردەوام بووە، ئەو حەلە (فەرهاد)ی چوارەمی پادشای ئەشکانی چووەتە سەر مادی بچووکوحکومەتەکەی لەناوبردوون. کوردێتی ئازەربایجان شکی تیانییە. (کورد یەعنی ماد) چونکو (ماد)ناوی گشتی نەتەوەیەکە. زمانی (مادو عەشرەتەکانی) هەموو یەکەو ئەویش لەسەرکوردی ساغبووەتەوە، چونکو وەختێك کە زاناکانی ئیسلام چوونە ئازەربایجان، دیوانە ئەهالییەکەی هەموو عەشایری کوردە. بەم حیسابە کاتی سەربەخۆیی حکومەتی (مادی بچووك)٢٠٠ ساڵێك

---

[4] بۆ مەعلووماتی زیاتر تەماشای مێژووی امین زکیبەگ، بەرگی یەکەم بکرێ.

ئەگرێتەوە. بەڵام لەدوای ئەو مێژووە، ئیتر ناوی (مادی بچووك) نەماوە. دیار
حکومەتی ئەشکانی وە لەدوای ئەمان خانەدانی ساسانی زۆرداربوون، نەیانهێشتوو
کوردەکانی ئازەربایجان جارێکیتر دەستپەیدا بکەنەوەو ببنەوە بە حکومەتەکەی
جاران. داخم ناچێت کە لە بابەت ڕووداوی مێژوویی ئەم کیشوەرەوە، نەبۆکاتی
سەربەستییان وە نە دەربارەی باسو هەواڵی دواییان هیچ زانستییەکمان نییە، هەت
دوای ئیسلامیەت گشتی ونە!! چونکو هەردوو سەلتەنەکە بۆ ئازربایجان هیچو
نەنوسیوە بەرەکەتدا مێژووزانی ئیسلام باسو هەواڵی پاش ئیسلامەتی ئێرەیان بە
نوسین. لەسەر ئەوەشا هەر چەند جارێکیتر حکومەتی سەربەخۆ لێرە پەید
نەبووەتەوە، بەڵام بەپێی سیاسەتی ئیداری ئەو کاتە عەشرەتەکانی ئازەربایجان ک
هەموو (مێد)ن و کوردن دیسان تەرحە سەربەخۆییەکی عەشرەتی ناوخۆیان هەبووە
ئەوەندەی هەیە تا دەوری ئیسلامیەت ئەم وڵاتە بووەتە مەیدانی شەڕو هەرای بەینی
هەرلادوو دەوڵەتی ئەشکانیو ساسانی لەگەڵ دەوڵەتی (ڕۆمای ڕۆژئاوا)وە لە دوای ئەو
دەوڵەتی (بێزانس)یەعنی دوو دەوڵەتی ئاسیای ڕۆژهەڵاتو دوو دەوڵەتی ئەوروپای
ڕۆژئاوا کە هەمیشە سوپایان بەرێوە بووە بۆ سەریەکتری لە ئازەربایجانا. (بۆیە)لە
ڕووداوانەدا بەشی ئازەربایجانیش هەمیشە وێرانیو سەرگەردانی بووە. زاتەن بۆ ئە
جۆرە وڵاتانە کە خۆشەویستی قەومی تیا پەیدا نابێت لە دڵی نەتەوەکانیانا
یەکگرتن فێرنابن ماڵوێرانی و سەرگەردانی هەمیشە بە باڵایان براوە.

## مەدەنیەتی نەژادی کورد شکڵ و تەبیات و ژیانی عێلانی پێشوو[5]

هەروەك لە باسەکانی پێشوودا لە ڕووداوی مێژوویی نەژادی کورد گەیشتین
پێویستە لەوتارەکانی لەمەولاشا لە بارەی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتی خۆیا
چییانکردووەو، لەڕای نیشتەجێیدا چلۆن هەڵسوڕاون ئەوانەش بزانین، تا لە بابەت

---

[5] مێژووی کوردو کوردستان هی امین زکی، بەرگی یەکەم، فەسڵی حەوتەم، ل۲۹۰
.۲۹۳

شكلّو تەبیاتو ژیانی كۆمەلایەتیشیانەوە چەردمیێك زانیاری پەیدا بكرێت. هەموو زاناكانی ئەوروپا، ئەوی كەموزۆر لەگەلّ ڕەوشتو مەدەنیەت شكلّو تەبیاتو ژیانی كوردەواریدا خەریكبووە، بەیەك زمان ئەلّێن: كەس ناتوانێ شكلّو سەرو سەكوتی نەتەوەی (كوردی)ی كۆن بەیەك تەعریف بەیان بكات، ئەمە بەلگەیەكە بۆ ساغبوونەوەی ئەوە كە كوردی ئێستاو كۆن لەیەك ڕەگەزی (تایبەتی)یەوە نەهاتووە، بەلكو لەگەلێك نەتەوەی بەشكلّو ڕووكار جونیەك وەها بە (زمان)خزمو نزیك بەیەك پەیدا بووە، وەكو لای سەرەوە وتمان نەظەریەی دوو مەوجە نەقوامی كۆن لە زاغرۆسەكانا تێكەلّ یەك بووەو ئەو ناوێتەبوونە نەتەوەی كوردی بەهەرمەهێناوە بیرێكی زۆر ڕاستە پەشیمانی تێدا نییە. دائیرەی مەعاریفی ئیسلام. ئەلێت: ئەو شكلّ و تەبیاتە كە موستەشریقەكان بۆ (كورد)وتوویانەو دەربارەی كردگاری هەندێكی كەمیان كە دیویانن ئەیلێن، ناتوانین بیكەین بە تەعریف بۆ هەموو ئەو نەتەوە زۆرانە كە ئەلێن نەتەوەی (كورد)لەوانە كەوتوومەتەوە. ئەمانە هەروەكو مێژوویەكی تایبەتی بۆ ڕێك نەخراوە، لەبابەت ڕەفتاریشیانەوە دووبارە درێژە بەقسە بدەن بۆیان . جا لەبەرئەمە ڕاستی قسە ئەوەیە كە لە بابەت ڕەوشتیانەوە كەس ناتوانێ تەعریفێكی تەواویان بۆ بیەژێ، بەلكو هەر (سەرپۆتێك)ئەتوانرێ باسی شكلّو تەبیاتو تەرحی ژیانیان بكرێت. لەپێش هەموو شتێكا ئەوە زانراوە كە ئەمانە لەسەر ڕەوشتی عەشیرەتیو لەسەر حالەتی (ڕەوەكی) زۆرماون. بۆیە لە شارستانێتی (مدنیت)دا وەها دواكەوتوون. لەمانە ئەو كۆمارانەی هاتوونە پێ دەشتیو لەسەر ناوی گەورە ژیاون، دەستو برد قابیلیەتی شارستانیەتی خۆیانیان نواندووە، وەكو لە (سۆمەر)و (عیلام)ەكانا بینراوە. بەلام داخم ناچێت، بۆیەش بۆ گەلێك تایفەكانی تر ئەم خێرو بەرەكەتە هەلنەسوڕاوە؟ گەرچی لە سۆمەرەكانەوە شارستانیەتی پەڕیوەتە ناوچیاكان بەناو تیرە ئاریەكانی نەژادی (كورد)ا كە (گۆتی، لۆللۆ، كلی، سۆباری، وەمیتانیو مادەكان) بوون بلاوبوومەتەوە، بەلام لەبەرئەوەی سەرزەمینی كوردستان، سەخت هەلكەوتووە ئەم تەئثیراتە زۆر ناتەواو بووە، وە لەبەرئەوەی هاتوچۆ كەمبووە لەناویانا تەئثیراتەكەش هەر بەنسیبی چەند تیرەیەك بووە، وە

ەوێیشا هەر لە حاڵی لاسایی (تەقلید) کردندا ماوەتەوە. لەبەرئەوەی جۆی خۆراك و
اوو هەواو تامی خاکو ئەرز تەئثیری هەیە لەسەر بونیەو ڕەنگو شکڵو تەبیاتی
ـرۆڤ، زۆر نەگونجێ ئەم بابەتە ڕەوشتانەی نەژادی کورد لەگەڵ هەینەتی مرۆڤی
ەشیرەتەکانی ئێستادا (کەوا بەرودوا لە عەینی وڵاتا پەروەردەبوون)، فەرقێکی
ەوتۆی نەبێت بگرە نەتەوەی ئێستا زۆر ئەگونجێ لە پێشینەکان بچێت. بەپێی
ەوشتی (قاعدە): خەڵکی شاخستان وەك تەبیەتیان تونگە، ئەگەر هێشتا لە حاڵی
ەشرەتییابن، لەگەڵ تەبیعەتە کەیانا شەڕئەنگێزیش ئەبن. جا کوردەکانیش کە
ەمیشە لەمحاڵەتەدابوون وازیان لە خوو شەڕوشۆڕکردن نەهێناوە، لەبەرئەوەشە
اکو ئێستا هەر بەدواکەوتوو ماونەتەوەو هیچ یەکیان نەگرتووەو بێهێزماون. وە بە
ەمانین ببن بە میللەتی گەورە چونکە لەبەر ئاژاوە نەیانپەرژاوە مشووری حاڵی
یشتەجێتی خۆیان بخۆن. بەناوی کۆگای نەتەوایەتی (هەینەی ئیجتماعی)یەوە چوار
نتی مومتاز لە کورددا دیارە، پێویستە بوترێت:

١- لە نەژادیانەوە هەتا ئیمرۆ کوردەکان کردویانە بەخوو لە فرمانا لە دەوری
سەرۆك)یان ئاڵاونو لەقسەی دەرنەچوون، وە لەخۆیان بەگەورەتریان ژماردون.

٢- لە فرمانا قسەی سەرۆکیان بەجێهێناوە.

٣- پیشەو خووی نەژادیان ڕاگرتووە. تەرکی خووی کۆنیان بەعەیب ژماردووە.

٤- شارستانییەکانیان توجارو بازرگان ، پیشەسازو کارگەچیو فرمان بەڕێکەر بوون.
خەڵکی شاخو دەشتەکانیشیان زوراعو ڕەنجبەرو کۆچەرو ئاژاڵ بەخێوکەرو ڕاوچی
بوون. کەواتە صنف صنف بوون، وەکوو: ئاغاواتو خاوەن مولکو ئەهلی دین بوون.
ئەمانە دەستەی هەڵبژاردە بوون (زوڕاعو مسکێنو خاوەن هونەرو یەخسیر)یش
دەستەی عەوام و بێنرخ بوون. لەم کوردانە ئەوی دامەزراوەو جێگیربووە لە شوێنێکا،
هەج تیرەیەکی لەدەوروپشت بووبێت کردوویە بە (کورد)و ناوێتەی خۆیکردووە.
ئیمرۆ لە عێراقا هەندێك تایەفە هەیە لە ئەصلا کورد نین، کەچی بە تەئثیری
دراوسێتی لە پەنای کوردا بەمرور بونەتە کورد. کورد بەتەبیات حەزی لە ژیانی
دامەزراو کردووە. کەچی بەحوکمی پیشەی عەشیرەتی شەڕوهەرای دانیمی سەرمایەی

فەخرو خۆهەڵکێشانی بووە. مەراقی یەکگرتنو دروستکردنی دەوڵەتێکی وەطەنی و میللی هیچ ماندووی نەکردووە. بەکورتی: ئەوەندە زانراوە کە لەناوئەقوامی ئاسیای ڕۆژئاوادا وێنەی تایبەتی و ڕوخساری نەتەوایەتی (ئاری) ئێستا کە لە دوو نەتەوەدا ماوە. ئەوانیش (فورس)و (کورد)ەکانی ئیمڕۆن کە لە (ئێران)و (کوردستان)ەکانا ئەژین وماون. لەبابەت پیشەی کۆگایی (ئیجتماعی)ی کوردانەوە (دائیرەی مەعاریف گەورەی ئینگلیز)، بینا لەسەر قسەی زاناو سەیاحەکانی ئینگلیز ئەڵێت: (فرمانی ناوماڵ و حاڵەتی خێزانی کورد زۆر ئەوصافی پێشکەوتنی تیایە. کورد رووخۆش و دڵپاکەو زۆر بەغیرەتە. میوانی لا بەحورمەتە. ئافرەتی کورد سەربەستو ئازادو پاکە. لەم ڕووەوە ژوور ئافرەتی فورس و تورك ئەکەوێت. سەروڕوو کراوەیە لە دێهاتا. سەرو پۆتلاك داپۆشراوە نییە. لەناو شاریشا لە بێگانەوە ڕووداپۆشینی وەرگرتووە. ئافرەتی زۆر بەناوبانگ لەکوردا هەڵکەوتووە. هەندێکیان رەئیسەی عەشیرەت بوون. وەنەبێ کورد حەز بکا لە یەك (ژن)زیاتر بێنێت، هەندێك دەوڵەمەند نەبێت. کەچی زۆرحەز لەگۆرانی و سەماو هەڵپەرکێ ئەکەن)[٦].

## ئاین و بڕوا

ئەوانەی چاك سەرنجیان داوەتە مێژوو، وە لە ئایین و بڕوای ئینسانە کۆنەکان وردبوونەتەوە، بێگومان لەوە حاڵیبوون کە هەموو ئادەمیزادی ئەم سەرزەمینە لەپێش هاتنی کتێبی ئاسمانیدا شتە گرنگو سەیرەکانی سروشت یان بە (خوا) زانیوەو، پەرستوویانە، وەکو: ئاسمان، ڕۆژ، مانگ، ئەستێرە، دەریا، بروسکە، باران، با، خاكو، ئاگروشتی وا. وە لە دواییدا کە شارستانیەتی (مەدەنیەت) پەرەی سەندووە ژمارەی ئەم خوایانەش زیادی کردووە، بگرە لای نەتەوەکانی (یۆنان)و (ڕۆما)ی کۆن ژمارەی ئەمانە گەیشتووەتە چەند صەد دانە خوا. ئەو مرۆڤە کۆنانە لایان وەها بوو کە ئەمانە ئەچنە تەرحی ئینسانی غەیبییەوە، شتێکیان بەدەستەو لەناوخۆیانا گەورەو بچوکیشیان هەیە، وە وایان ئەزانی کە هەموو فرمانێکی ئەم (گەردوون)ە ئەمانە ڕێ بەرێی ئەکەن، بۆیە لە شکڵی عاجباتیدا وێنەیانکردوون لە ترسانا وەیا

---

[٦] مێژووی کورد کوردستانی امین زکی، بەرگی یەکەمی عەرەبییەکەی، فەصڵی حەوتەم ل:٢٩٠-٢٩٢.

بۆ مەسلەحەت پەرستوویانن. جا ڕەگەزی (بت پەرستی) نەمەیە. ئەگەر بێتو بڕوانینە ئایینو عەقیدەی تیرەو قەومەکانی هیندۆ ئەوروپایی و ئاری کۆن ئەبینیز هەر لە هیندوستانەوە تاکو ولاتی (ڕۆم) وەکو پەرستنی قوای طەبیعەت لەناویاذ باوبووە، (گیان)ی ئەژادی خۆشیان پەرستووە، وە لە بناغەوە هەر چەندە بڕوای هەموویان یەکیش بووە، کەچی لەدوای جیابوونەوەیان لە یەکتری زۆری پێنەچووە وەك قەومایەتییان (تەفرەقە)ی تێکەوتووەو ئایینو بڕوایشیان گۆڕراوە. بگرە وایلێهاتووە بڕوای تایەفەیەکیان لەویتر نەچووە. بێینەوە سەرنەتەوە کۆنەکانی (زاگرۆس) کە دەستەیەکبوون لەمانو پێش گوشادی مێژوو هاتوونەتە ڕۆژاوای ئێران وە لەوێ تێکەڵ سامییەکانبوون ئەوانیش بڕوایان تێکچووە. بڕوای (ئەکادی عەمورەی، ئاشۆری، وە کلدان)ی سامی تەئثیری کردووەتە سەر بڕوای (سۆمەر، عیلام گۆتی، لۆللۆ، وە کاسی و ئارییەکان)و هی ئەمانیش تەئثیری کردووەتە ئەوان. یەعنی ئەمانە هەر یەکە بە تەرحێکبوون بە (ڕۆژ، مانگ، ئەرز، دەریا، ئەستێرە، ئاسمان، با، بروسکە)پەرستو لە پاشانا کە نەتەوەکانی تریش دوایی هاتوون وەکو (ماد، ماتای، پارث و، پارس)ەکان و تێکەڵاوی پێشینییەکانبوون، سەرلە نوێ بڕوایان تێکچووەتەوە. لەگەڵێ جێگا خوای (ئاری)یش پەرستراوە. تازە هاتووەکان هێشتا بڕوای ئارییە کۆنەکانیان لەدڵابووە کە خۆیان (مازدیانی)یان پێ وتووە[٧].

## ئایینی ئاری کۆن

ئەگەرچی ئایینی ئاری کۆن بە بناغە وەك ئایینی هیندۆ ئەوروپاییەکان بووە کە ئایینی (فیدا)ی هیند وێنەیەکە لەو، بەڵام لەدوای تەفرەقە بوونیان هەریەکە ڕەنگێکی تازەی وەرگرتووەو مەزاپاشیان گۆڕراوە. بەڕاستی لەلایەن ئایینی ئەم ئارییە کۆنانەی ئێرانەوە زانینێکی ڕاستو بێگرێی عیلمیی نیە کە پیاو بەتەواوی متمانەی پێبکا. هەردوو سەررشتەی زانراو هەیە کە لەم ڕووەوە دەسگرۆییمان بکا، ئەویش یەکێکیان ئەو نوسراوە ئەخشینە مێژووییە کە لە شیمالی ڕۆژاوای ئێراندا دۆزراوەتەوەو هی کاتی (١٤٠٠ پ.ن.م)ە. دووەمیشیان نوسراوەکانی (پەرسەپۆلیس)ە. لە نوسراوی یەکەمیندا ناوی سێ خوای هیندی نوسراوە کە (میهترا = میهر) یەعنی

---

[٧] ئەم باسانە لە مەجەللەی (الرسالة) ژمارە ٢١٦ ئەغەستۆسی٩٣٧و نوسراوەکانی تۆفیق وەهبیدا بینراوە.

ڕۆژ، وە (ئیندرا) خوای باران، وە (ڤارۆنا) ئاسمان. بەمەدا وادیارە بڕوای ئایینی ئەهالی پێشووی ئەوناوە ( کە هەمووشیان ئاری بوون) لەگەڵ بڕوای هیندییەکانا لە پێشا چونیەك بووە. کەواتە ئێرانییە کۆنەکانیش ڕۆژپەرست بوون (میهر)یان پێ وتووە کە بەبێگومان لە (میهترا)ی هیندەوە هاتووە. بەڵام بەلەهجە ئەمان گۆڕیویانە. وە هەروەها ئاسمان، باو باران، وە بگرە ئەستێرەو مانگو بروسکەو خاك و ئاگریشیان پەرستووە. لایان وابووە کە ڕۆژو مانگ لە (ئاگر)ن وخوای ڕووناکیو سەرچاوەی (چاکە)ن. بەڵام لایان واشبوو کە هەندێك هێزی خراپە کەریش هەیە ئەوانیش بابەتە (خوا)یەکن، (دیڤەس - دیو)یان ناونابوون، وە وایانئەزانی هەرچی خراپە هەیە ئەمانە ئەیکەن، ئینجا ئەمەیە لەدواییدا بووەتە (دێو)و (شەیتان). بێینەوە سەر نوسراوەکەی (پەرسە پۆلیس)کە خوێنراوەتەوە، ئەویش باسی پادشا کۆنەکانی پارس ئەکات کەوا (ئاهوورامەزدە)یان پەرستووەو (میهر - مترا)و (ئاناهیتا)شیان بەخوا زانیوە. بەڵام (ئاهوورامەزدە) یان لە ژوورهەمووخواکانیانەوە داناوەو وتوویانە ئەم خوایە نابینرێت (ئاگر) ڕەمزی ئەوە. جا وادیارە ئەم ناوە لە (ئاهوورە) ناو خوای هیندو (مەزد) ناو (خوای ئارییەکانی ئێران) پەیدا بووەو بەمروور بووەتە (ئاهوورامەزدە) کەمەبەستیان (ئاسمان) بووەو بە خوای ئەخلاق و چاکەو و بەدروستکەری (گیان)و ئەرزو ئاسمانیان داناوە. کەچی بە پێچەوانەی ئەم تەقەلوباتەی ئێران لەناو هیندییەکانا ناوی (ئاهوورە) بووەتە ناوی ئەوخوایانە کە خراپە ئەکەن. سەرەڕای ئەمەش زاناکان ئەڵێن لەناو (ئاری)ی هەرە کۆنا ناوی خوای ئاسمان (دیاوس) بووەوخوای هەرە گەورەشیان بووە. تەنانەت مێژوونوسەکان ئەڵێن لەسەردەمی ئەخەمەنییەکانا کە (هەرە دوت)ی یۆنانی چووەتە ئێران، ئەم ناوە لەوێ هێشتا ماوەو لە سیاحەت نامەکەیا باسیشی کردووەو لەگەڵ خوای ئاسمانی خۆیان کە (زەوس)ی ناوبووە بەراوردی کردووە. ئینجا عاجباتی ئەوەیە کە ئەم ناوە لە ئێرانا بەجارێ نەماوە. ڕەنگە تەقەلوباتی دینیو سیاسی ناو ئێران بوبێت بەهۆی ئەم نەمانە وەکو: کە پارسییەکان زاڵ بوون بەسەر هەموو ئێرانا خواکەشیان کە (ئاهوورامەزد)ە ببوو بەخوای گەورە بەسەر خواکانی تری هەموو ئێرانا. بۆیە لەژێر

تەنثیری ئەم سیاسەتەدا لەدەوری ئەخەمەنییەکانا ناوی (دیاوس) بەیەکجار ئەماوە (ئاهوورەمەزدە) جێی ئەوی گرتووەتەوە. پێویستە ئەوەش بزانرێت کە تەقەلوباتی ناو ئێران لەمەشا نەوەستاوە، بەلکو لە دوایيا ناوی (ئاهوورامەزدە)یش سووك بووەو بووەتە (هورمـزد). لای خەڵکی ئەو کاتـە (شـەراب) موقەددەس بـووە. مردوویـان چەورکردووەو تەرمەکەیان لـە هەوادا داناوە بۆ درنـدەو باڵندە بیخوا. (خوشـك)و (کچ)و (دایك) مارەکراوە، یەعنی حەرام نەبووە لە ناویاندا.

جا بە کورتی: لە دوایيدا ئەم هەموو بڕوایە ساغبووەتەوە لەسەر (دوو) شت (١) خێرو چاکە (٢) شەڕو تاریکە. ئەوی بە کەڵکی ئینسان هاتووەو سوودی بۆبووە وەك ڕزق و ڕۆزی، ڕووناکی، باران، پیتو بەرەکەتو شتی چاکی تر بەهی خوای (چاکە) دانراوە، وە ئەوی زەرەریشی پێئەگەیاندن وەکو نەخۆشی، مردن، بێبارانیی، تەنگە تاوی، گرانی، وە خراپی تر ئەمانەش بەپیشەی خوای شەڕو تاریکی نەزانرا. ئینجا خوای یەکەمینیان ئەپەرست و عەبدایەتییان ئەکردو لەخوای دووەم ئەترسان و بۆ دووربوون لە خراپەکانی قوربانییان بۆ ئەکرد و دوعایان بۆ ئەخوێند کە ئەم دوعایانەش لە دوایيدا بوونەتە سیحرو جادوگەریی. وا دیارە لەسەرەتای دەوری ئەخەمەنییەکانا کە هێشتا (زەردەشت) نەهاتووە ئەم تەقەللوباتە وایکردووە لە بەشی پارسییەکانا ئاهوورەمەزدە بووە بە خوای هەرەگەورەو خەلقکەری خاك (ئەرز) و ئاسمان و هەموو گیانداران و دوژمنی درۆو خراپەو پارێزەر (حامی)ی سەڵتەنەتی ئەخەمەنی. لەسەر ئەمەشا خوای بچوکتریش هەر بووە کەوا هەندێك لەوانە تەنیا خوای (خراپە) کردن بوو (دئیقە)ی ناو بوو.

لەپاش (زەردەشت) پادشاکانی دوایی ئەخەمەنی بەناوی (هورمز)ەوە ڕۆژیان داناوە بە پارێزەر (حامی)ی سەڵتەنەکەیان و پەرستوویانە. لە مانیشەوە لەدوای ئەسکەندەر ڕۆژ پەرستیی بەناو (ئەنادۆڵ)دا بڵاوبووەتەوە. مێژو نووسەکان وەها ئەگێڕنەوە کە ئارییە کۆنەکانی ئێران لەگەڵ ڕۆژدا (تریشقە)شیان پەرستووە. وایانزانیوە کە ڕۆژ چاوی ئاسمانەو (بروسکە)ش کوڕی ئەوە. جا لە دوای ئەم هەموو تەقەللوباتە (زەردەشت) ناو پیاوچاکێك پەیدابووە ئەم بڕوایانەی ڕێکوپێك

(تنظيم)كردووەو، بيری (تاق و تەنيايی) خوای بلاوكردووەتەوەو بووەتە (پێغەمبەر)ی ئارييەكان..

## زەردەشت

(زەردەشت) یا پێغەمبەرە وەیا مورشیدێكی بڵندی نەتەوەی ئاری كۆنە. بەتەواوی نەزانراوە كە خەڵكی كوێیەو كەی پەیدابووەو كتێبی (ئاوێستا)شی چ وەختێك و بەكامە لك (شوعبە) زمانی ئاری نوسیوە. ئەوەندە هەیە زۆر نەگونجێت ئەم كتێبەی بە زمانی (ماد) نوسیبێت. چونكە بەپێی بڕوای هەندێك زاناو گەلێك مێژوونووس ئەم زاتە لەدوای تەئریخی( ٦٠٠پ.ز.م )لای گۆمی (ورمێ) لە شوێنێك پەیدابووەو لە تەمەنی ٢٠-٤٠ساڵیدا دەسیكردووە بە بلاوكردنەوەی ئایینەكەی یەعنی (ئایینی زەردەشتی) وە هەتا نزیك( ٥٠٠ پ.ز.م) یش ژیاوە ئەوسا مردووە. ئینجا ناوچەی گۆمی (ورمێ) ناو پشتەی ولاتی (ماد)و (كاردۆخۆ)كانە، ئەوەندە هەیە: هەندێكی تریش لەوبیرەدان كە ئەم پیاوە چاكە لەسەردەمی (٧٠٠پ.ز.م )دا پەیدابووە. زەردەشتییەكان ئەڵێن لە منالییا زەردەشت شتی عاجباتی (معجزە)ی لێبینراوە، وە لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا خەڵكی بانگ كردووەتە سەر ناسینی خوای (تاق و تەنیا). (جاویدانی موقەددەس) زەردەشتی بردووەتە خزمەت ئەم (خوا)یە كە (ئاهوورەمەزدە)ی ناوەو (یەزدان)یش هەر ناوی ئەوە. زەردەشت هێناویە هەرچی توانایەكی (چاكەكردن) هەیە داویە بە (ئاهوورەمەزدە)و كردویەتی بە (خوای تاقانە) و هەرچی توانای (خراپە كردن)یش بووە داویە بە (دنیقە) یەعنی (دێو)و كردویەتی بە (شەیتان) كەوا لە زمانی (پەهلەوی)دا ئەمە بە تەعبیری (ئەهریمەن) ناوی براوە. لە دوایيدا زەردەشت بەوانەی كە نەچوونەتە سەر ئایینەكەی (دێو پەرست)ی وتووە، یەعنی (شەیتان پەرست) ئەمجا بەشێك لە كوردەكانیش ئەم توانجەی (زەردەشت) یان بەركەوتووە. وەها زانراوە كە زەردەشت بە ئەمری (ئاهوورمەزدە) چووەتە لای (وێشتاسپ- هیس تاس پەس) ناو حاكمی (باختەر)

زەمین (خوراسانی ئێستا) کە لە نەخەمەنییەکان بوو خەریکی بووە هەتا هیناویەیە سەر ئایینی زەردەشتی، ئەوسا گونجاوە ئەم ئایینە بەناو ئێرانا بڵاو بووبێتەوە، یەعنی ویشتاسپ بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی پاراستووە، چونکە زەردەشت لە نیشتمانەکەی خۆیا هەرچەندە خەریکبووە کەس گوێی لێنەگرتووە. لەدوای ئەوەی ویشتاسپ بووبە زەردەشتی، بووش بە پادشای ئێران کەوا لەناو خۆیانا (گوشتاسپ)ی پێئەڵێن ئەم پاشایە باوکی (دارایۆسی گەورە)یە کە مێژووی ئێران بەناوی (ئەسفەندیار) وە یا (بەهمەن) ناوی ئەبات. وا ئەگێڕنەوە کە زەردەشت لەتەمەنی پیریدا لە هەرایەکی ئایینیدا بە کوشتچووە. وا دیارە نوسخە ئەسڵییەکانی کتێبی (ئاوێستا) لە کاتی هێرشبردنی (ئەسکەندەر)دا لەناوبراوە. بەڵام لەدوای ئەمە بەئەمری (ئەردەشێری پاپەکان) کە یەکەم شای ساسانییەکانە سەرلەنوێ کۆکراوەتەوە. ئەوەندە هەیە بەشێکی ئەم نوسخانەش (لەکاتی هێرشی ئیسلامیەتا لەناوبراوە لەسەدەی (۹/۸م)دا، بەڵام پیاوی دینداری پارسییەکانیش لەدوای ئەم تەئریخە دووبارە کۆیانکردووەتەوە. پارسییەکان متمانەیان نەبووە ئەم پارچانە لە ئێرانا بمێنێتەوە، لەبەرئەوە بردویانەتە (هیندوستان) ئێستا لەوێ بە پارێزراوی ماوەتەوە[^8].

## ئایینی زەردەشتی[^9]

لەبەر ئەوەی لە پێش ئیسلام بوونا بەشێکی نەتەوەی کورد زەردەشتی بوون پێویستە بزانرێ کە ئەم ئایینە چلۆن بووە. بۆیە وا لایخوارەوە نەختێك قسەمان لێکردووە. کتێبەکەی زەردەشت کە ناوێستای ناوەو (زیندەویستا)ش هەرئەوە بە (پەهلەوی) بەمەعنا (تەفسیری ناوێستا)یە ئەم کتێبی ئایینییە ئەڵێت: خوای تاقو

---

[^8]: مێژووی کوردو کوردستانی امین زکی بەگ، تەرجەمەکراوی عەرەبی. بەرگی یەکەم، باسی (زەردەشت).

[^9]: بۆ ئەوەی زیاتر لەمە ئاگاداربن بڕواننە نوسراوەکانی امین زکی بەگ و تۆفیق وەهبی.

تەنیا (ئاهوورامەزد)یە. ئەم خوایە کە (گەردوون)ی خولقاندووە، دووگیانی یەك زگیشی هێناوەتە کایەوە کە هەرگیز لەیەك جیانابنەوە، یەکێکیان هی پاکو چاکە، ئەوی تریشیان هی پیسوخراپەیە.

ئەمانە ئەم گەردوونەیان بە تاریکیو ڕووناکی دەرخستووەو هەتا دوایی (دنیا)ش دێت ئەمانە پێکا دێنوشەڕئەمنێنەوەو، ئاهوورەمەزدەش هیچ خۆیان تێناگەیەنێت. بەم پێیە عالەم بووەتە دوو بەش و دوو لەشکر: لەشکری ڕووناکی لەگەڵ سەردارەکەیان (هورمزد) بەشێکە، وە سوپای تاریکییش لەگەڵ سالارە کەیا کە (ئەهریمەن)ی ناوە بەشەکەی ترە. (هورمزد) لەگەڵ شەش فریشتەی یارمەتی دەریا کە (جاویدانی موقەددەس)یان ناوە، عالەم ئیدارە ئەکا. لەمانە چواریان (چوار عونسوورەکەی طەبیعەت)یان پێسپێرراوە (خاك، ئاو، ئاگر، هەوا) کە بییانپارێزن، بێجگە لەمانە فریشتەی تریش هەیە وەکو (وجودی مجرد) کە (یەزد - ئێزەد)یان پێوتراوە. ئەمانیش دووبەشن (ئاسمانی)و (زەمینی). لەبەشی ئاسمانیدا (هورمزد) زوور هەموویان کەوتووە، وە لەناو بەشەکەی سەرزەمینیشا (زەردەشت) لە زوور ڕەفیقەکانیەوە. بێینەوە سەر ئیشوکاری ئەم (یەزد)انە، ئەمانیش لەم دنیایەدا فرمانی تایبەتییان پێسپێردراوە. لەوانە (ڕۆژ)و (مانگ) کە دوو هێزی ئاسمانین ڕەمزی (دوو یەزد)یشن لەو یەزدانە. پێویستە ئەوەش بزانین کە لەسەردەمی پەیابوونی ئیسلامەتیا ئێرانییەکان ناوی (خوا)یان ئابوو (ئێزەد) وە یا (یەزدان). بەرامبەر ئەم سوپای (هورموز)ە خوای تاریکی‌یش کە (ئەهریمەن)ە سوپای هەیەو یارمەتی دەرەکانیشی ناویان (دێو) بووە، ئەهریمەنیش سەرداریانە فرمانی ئەهریمەنو دێوەکانی نەهێشتنی چاکەیە کەوا فریشتەکانی هورموز بەجێی ئەهێنێت، تاریکی، گوناه، خراپە، درۆ ئەهریمەن دایهێناوە، قسەی چاك، ڕەوشتو بیری باشو، کردەوەی پاکو بەکەڵك ئەمانەیش هورموز دایهێناون. هورمز (ژیان) ئەهریمەن (مردن)ی دروستکردووە، بە کورتی: گشت شتی باش هی هورمزەو شتی خراپیش هەمووی هی ئەهریمەنە. (ئاوێستا) لە بابەت دروستبوونی عالەمەوە زانستی ئەدا ئەڵێت: (ئاهوورەمزدە) لەدوای دروستکردنی (گیان) عالەمی ماددی بە شەش دەور

هێناوەتە مەیدان. لەدوای ئەوە (ئەهریمەن) بە زۆرداری خۆی هاتووەتە کایەوەو لەڕووناکیدا دەستیکردووە بە دروستکردنی خراپەکانیو بەربەرەکانێکردن لەگەڵ هورمزا هەتا زەردەشت پەیدا بووە. ئەوسا ئەهریمەن ڕویکردووەتە کزبوون، وە بەئەنجام ئەبێ بچێتەوە دنیای تاریکی. ئایینی زەردەشتی هەواڵی قەبرو قیامەتیشر نیشان ئەداو ئەڵێت: گیان لەناوناچێت. لە گۆڕا پرسینەوەو لە قیامەتا حیساب هەیە. ئەبێ هەموو گیانێك بە پردێکا بپەڕێتەوە، ئەگەر (گیان) خراپەی نەبێت بە ئاسانی لە پردەکە تێپەڕ ئەکا ئەچێتە (بەهەشت)، خۆ ئەگەر خراپەکەر بێت ئەکەوێتە ناو تاریکییەوە تووشی مسەوەر ئەبێت. ئەگەر چاکەوخراپە بەرامبەر یەك بێت جێیەك هەیە (هەمەستەکان)ی ناوە گیان ئەچێتە ئەوێو، لەدوای هەڵسانی قیامەتو موحاکەمەو حیسابکردن، ئەمجا هورموزو ئەهریمەن خۆبەخۆ ئەکەونە یەکو ئەهریمەن لەناو ئەبات.

ئایینی زەردەشتی ئەڵێت: شتی هەرە باش بۆ ئینسان کشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژاڵە. زەردەشت (وتوویە). پاداشتی ئادەمیزادی خاوەن مرووەت ئەوەیە کە هەرگیز نامرێت.. جەردەیی، دزیو درۆزنی لای زەردەشت لە شتە زۆرخراپەکانن. بەپێی ئەم ئایینە پیاوێك توانیویە تەنها ژنێك بهێنێت و، چیا ئەمری بەنێو کردنیشی کردووە ئایینی زەردەشتی (ئاو، ئاگر، خاك، هەوا)ی داناوە بەچوار (عونصوری موقەددەس وتوویە پاکژ نابێ پیس بکرێت. ئاگر لە ڕۆژەوە هاتووەتە سەر زەمینو بووە بە (رەمز) بۆ زەردەشت. زەردەشتییەکان لایان وایە (زەردەشت) پێغەمبەر بووە. خو (یەعنی ئاهوورەمەزد) قسەی لەگەڵ کردووەو (وحی)یشی بۆ ناردووە. ئارییەکان لە پێش هاتنی زەردەشتدا (مەلا)یان هەبووە (موغ - موگ)یان پێوتوون. ئەمانە ڕابەریی عەبدایەتی خەڵکبوون لە وڵاتا. لەدوای زەردەشت، بۆ فێرکردنو تەعلیمی ئایینەکە بەخەڵك دوبارە (موغ) پەیدابووەتەوە. یەکێك لە ئیمتیازی ئایینی زەردەشتی بانگ دانی تاق و تەنیایی خوایە، کەوا لەوەپێش لە ئارییانا وەها نەبووە ئەیانوت ئەم خوایە کە ئەهریمەنی لەناوبرد ئیتر خراپە نامێنێت لە زەمیندا، و فەضیلەت جێی ئەوە ئەگرێت. ئەو ڕێکوپێکییە کە لە زەردەشتیدا ئەبینرێت،

بۆچاکەی ئینسان ئەم ئاینە ئەمری پێکردووە، لە ئاینەکانی پێشوترا نەبووە. هەموو ئاینێك بۆ ساغکردنەوەی کارێك پەیدابووە بەتەنیا، ئایینی (زەردەشتی) بۆ ساغکردنەوەی (چاکە)کردن هاتووە، بەلاّم ئارییەکان لەم فەضیلەتە نەگەیشتوون، بەلّکو لەدوایدا ئایینەکەیان کردووە بە(بت پەرستی)یەکی بێتامو، لاسایکردنەوەیەکی بێکەڵك. وا دیارە لە کاتی (داریوّس شا)ی گەورەدا ئایینی زەردەشتی بووەتە ئایینی رەسمی خانەدانی پادشاکانی ئێران، کەچی لەناو کۆمەڵی خەڵکا هێشتا ئایینی ئاری کۆن لە برەودا بووەو زەردەشتی بەتەواوی بلاّونەبوبووەوە. بەتەواوی نەزانراوە کە نەتەوەی (ماد) بڕوایەکی چلۆنیان بووە. بەوەدا کە ئەمانیش ئارین و سەروبەر ئێرانی بوون، ئەبێ (ئاهوورەمەزد) پەرست بووبن. باوەجوو زەردەشت (مێدیە)یی بووەو ویستوویە ئاینەکەیان ڕێکبخا، کەچی (موغەکان) ڕێیان لێگرتووەو نەیانهێشتووە لە هەوڵەکەیا سەرکەوێت، ئەویش ئەوسا ڕۆیشتووە چووەتە (باختەر) لەوێ سەرکەوتووە، کەچی لە دوایدا مادەکانیش‌و هەموو نەتەوەکانی کوردستانی خزمیشیان لە تەئثیراتی ئەم ئایینە کەلەپەناو سایەی حکومەتی ئێرانا بلاّوبووەوە ڕزگار نەبوون، بەڵکو هەر لەدەوری نەخەمەنییەکانا بە طەبیعەتی حاڵ بۆنی زەردەشتی کەوتووەتە (مێد)یشەوە.

نەبێت ئەوەش لەبیرنەچێت کە ئەم ئایینە لە دوایدا لە خۆیەوە تێکچووەو بەلای کۆنا بایداوەتەوەو بووەتە بابەتە (بت پەرستی)یەکی تەواو، یەعنی گەلێك بڕوای تێکەڵبووە. ئەڵێی بڕوای ئاری کۆن، لە ئێرانا هەمیشە لە برەودا بووە، تەنانەت لە دوایدا مەزهەبی (مانی)و (مەزدەك)یش پەیدا بووەو باوی سەندووە. ڕاستییەکەی ئێرانییەکان مەیلی بادانەوەیان هەمیشە لە دڵا بۆ سەر ئایینی کۆن. لەسەردەمی ساسانییەکانا لە (٣٠٠م) بە دواوە پەرستنی هەندێ خوای کۆنی (هیندۆ ئێرانی) کە زەردەشت مەنعی کردبوو لێیان، بێنراوەتەوە. خوایەتی (ڕۆژ، مانگ، خاك، با) دوبارە هاتووەتەوە کایەوە. بەطەبیعەت کوردەوارییەکەش لەم بادانەوەیە ڕزگاری نەبووە. باوەجوو گەلێك زانا وتوویانە کە (بت پەرستی، ڕۆژ پەرستی، درەخت پەرستی) تا دێرزەمان لە کوردستانا هەربووە. وا دیارە پێش ئیسلامیەت لەناو کوردەواریدا ئایینو

بـڕوای نـاری کـۆن یـەعنی (پەرسـتنی هـێزی طەبیعـەت)و زەردەشـتی و بـەلکو (مـەزدەك)یـش بـاوبووە. یـەعنی گشـتیان بەتـەواوی لەسـەر یـەك بـڕوا نـەبوون. لەبەرئـەوە ئـەتوانین بڵێین کـە لـە کـاتی کۆنـا بـڕوا دانەمـەزراوە، بـەلکو هەمیشـە لەئاڵوگۆڕا بـووە وەکو هـەر لەبەرئـەوەی ئێرانییـەکانو کوردەکـان ئاگریـان زۆر لـەلا موقـەددەس بـووە لـە ئـەنجاما بـێ ئیختیـار بـوون بـە (ئـاگر پەرسـت) یـەعنی (مەجووس). لەناو کوردستانولەئێرانا ئایینی عیسایی زۆرکەم بلاوبووەتەوە. تـاقمێك لە مێژونووسەکان وەها ئەزانن کە (نەستووری)یەکان کورد بوون، بەلام کـە بـوون بـە (مەسـیحی) کوردەکـان لـێیان جیابوونەتـەوە. پادشـاکانی ئـێران نەیانهێشـتووە مەسیحیەت پەرەبسێنێ لە ئێرانا. بـەکورتی، تـا پـەیدابوونی ئیسلامیەت، بـە کـوردو فورسـەوە ئارییـەکانی (زاگـرۆس) و (ئـێران) گشـتیان هـەر (زەردەشـتی)و (مـەزدەکی) بـوون کـە ئـەویش جـۆرە مەزهـەبێکی زەردەشـتییە. بـەلام پەهلەوییـەکان کـە لەساسانییەکانن بە زەردەشتیان وتووە (مەزدەستی) لەسەر لەهجەی پەهلەوی. بـەلاە گەلێك لە کوردەکان بێجگە ئەم دوو مەزهەبە لەسەر ئایینی ئـاری کۆن مـابوون کـەو تووشی ئاڵو گۆڕێکی زۆریش ببوو، ئەویش پەرستنی هێزەکانی طەبیعەت بوو کـە بـە تـەعبیری ئێستا ئەشـێ بەهـەموو ئەمانـە بڵێـین (زەردەشـتی)و (مەجووسـی). زۆر ئـەگونجێت بـە (یـەزیدی)یـەکانی ئـەمڕۆ کـە کـوردنو ئایینەکـەیان لـە پاشمـاوەی (مـەزدەکی) وەیـا (مەزدەستی) ئـەچێت کە لـەناوکوردەواری ئێسـتادا پێیـان ئـەڵێن (داسی)، دایان بنێین بەجۆرە (بت پەرستی) یەك، ئەمانە هێشتا (دیاوس) ئەپەرستن کە لە ژێر تەئثیری درێژەی دەوراتا ناوەکەش و ئەوسافی کۆنیشی گۆڕراوەو بووەتـە (مەلیکە تـاوس). ئینجا هەتا پـەیدا بوونـی ئیسلامیەت هـەواڵی ئـایینی ئـێرانو کوردستان بەمجۆرە بووە، بـەلام لـەدوای ئـەوەی ئیسلامیەت پـەیدابووە، وە لەشکری ئیسلام هەموو ئێرانو کوردستانی داگیرکرد، کوردەکانو فورسـەکانیش لـەژێر تـەئثیری تەدبیری سیاسەتی تازەی عەرەبەکانا وازیان لە ئایینی ئەژادیان هێنـاو هـەموویان بـە کۆمەڵ چوونە سەرئایینی ئیسلام.

## زمان

بێگومان (زمان)ی تایفەکانی هەرە پێشوو (زاغرۆسەکان) کاریکردووەتە سەر زمانی (کوردی)ی کۆن، یەعنی وتەیان کەوتووەتە زمانی کوردییەوە. زاناکان ئەڵێن زمانی ئەمانە زمانی قافقاسییە، یەعنی ئەمانە تیرە ئارییە هەرە کۆنەکانن. ئەوەندە هەیە هێشتا بە تەواوی یەکلایی نەبووەتەوە، بەڵام دیاریشە کە ڕەگەزی ئاریو قافقاسی یەکە، چونکو هەموویان خەڵکی یەك شوێن بوون. هۆی لەوەڕ بۆ ئاژاڵ لە یەکتری جیاکردوونەتەوە. زانای سامییەکانیش ئەڵێن ئەمانە قافقاسین (سامی) نین. جا لەبەرئەوەی ئەمانە لەگەڵ کوردا پێکەوە ژیاون ئەبێ شتێك لە زمانی ئەمانە لە کوردیی ئێستادا هەبێت. جا داخیگرانە هەتا ئێستا بەتەواوی نەزانراوە زمانی ئەم ئارییە کۆنانە چلۆن بووە. بەڵگەیەك وەیا (خەتێك) کە بەوزمانە نوسرابێت هێشتا نەخوێنراوەتەوە. ئەمەش وەها ئەگەیەنێ کە ئەم نەتەوەیە بەزمانی خۆیان نوسراویان بەجێنەهێشتووە. تەنیا بەناوە کانیانا کە زاناکان لە ئاثار (نیشانە)ی (سۆمەرو ئەکادو ئاشۆر)ا خوێندویانەتەوە لەگەڵ قیافەتەکانیا کە لە نیگارە کانیانا نیشانیانداون و بەو تەعریفاتە کە دەرحەقیان نوسراون ناسیویاننەتەوە، ئەڵێن ئەمانە بە زمانیش و بەڕەگەزیش (قافقاسی) وە یا (ئاری)ن. ئینجا دەربارەی زمانی ئەو نەتەوە کۆنانە لەمەزیاتر جارێ (زانستی) نییە بەدەستەوە. بێینەوە سەرنەتەوەکانی دوایی کە (ماد، کاردۆخۆ، پارس و پارتەکانن). بەپێی کتێبی موقەددەسی هیندییەکان لەناو ئەم ئارییانەدا دوای ١،٤٠٠ ساڵ پ.ز.م خوێندنو نوسین دەستپێکردووە. ئەگەر لە خاکی کوردستانی کۆنا لەمەولا نوسراو نەدۆزرێتەوە لە بابەت (زمان)ی ئەم نەتەوانەشەوە هیچ کات زانیاری پەیدا ناکرێت.

لەسەر ئەوەشا مادەم نوسراوی (عیلام، گۆتی، کاسی)ی دۆزراوە هەیە کە هێشتا نەخوێندراوەتەوە، بێ هیوا نابین بەڵکو ئەگونجێ بەهیوا بین کە هەوڵی زاناکان بچێتە سەر و ڕمووزی ئەم نوسراوانەمان بۆ بخوێنرێتەوە، ئەوسا ئەو ئیدیعایانە بە درۆ دەرئەچێت کە ئەڵێن ئەقوامی کۆنی ئەژادی (کورد)و زمانەکانەی خۆیان تەنیا بۆ (وتن)و زمانی (بابلی)و (ئاشۆرری)یشیان بۆ (نوسین) بەکارهێناوە. خۆ ئەگەر خوایکرد نوسراوەکان خوێندرانەوە ئەوسا لەگەڵ ناوو نیشانیانا گەلێ شتی پەنهانی

ئەكرێتەوە. لەدوای ئەم وتارە درێژە، ئینجا با بێینە سەر چەندوچوونی زمانی تەبەقەی دووەمی نەژادی کورد یەعنی (ماد) و خزمەکانی تری ئەو نەتەوانە. وەنەبێ بەمەعەیەنی زمانی قەومی (ماد) و شێوەی تیرەو تایەفەکانیان دیار بێت. هەر چەندە زاناکان ئەڵێن کتێبی (ئاوێستا)ی (زەردەشت) بە زمانی (ماد) نوسراوە کە بەمەشا ئەگونجێت بڵێین (ئاوێستا) بە زمانی کوردی کۆن بێژراوە، بەڵام خۆ بەو زمانە تاکو ئێستا نوسراوێکی تایبەتی نەدۆزراوەتەوە کە لەگەڵ (ئاوێستا)دا بەراورد بکرێت تاکو حەقیقەت دەرکەوێت لەسەرئەوەشا مادام (زەردەشت) خەڵکی (مێدی)یە بووە کتێبی (ئاوێستا)شی هەر بەوزمانە نوسیوە کە ئەویش لەگەڵ زمانی پارسییەکانی ئیستای هینددا فەرقێکی ئەوتۆی نیە. عێلاتی (ماد، کاردۆخۆ، پارس، پارت) تیرەو کۆماری عێلاتە زۆرەکەی (ئاری)ن با بەشێوەش زمانەکەیان فەرقی هەبێت، خۆ بە بناغە هەریەك زمان بوون. ئەم جۆرە فەرق و فرووقەی شێوەی زمانە لە هەموو نەتەوەکانی سەرزەمینا ئێستاش هەیە. پیشەی سروشتی وای ئەهێنێتە پێشەوە مادام نەتەوەکان تەرە ئەبن لەیەك، بۆیە زمانەکەیان وایلێبەسەر دێت وەکو مێژوو ئەڵێ یۆنانە کۆنەکان بەهەموو کیشوەری ئێرانا گەڕاون و بەهەموو ئێرانیان وتووە (مێدیە) و کوردستانی ئێستا کە (مێدیە) ی جارانەو کوردەکانیش لەوێدا دانیشتوون کەواتە ئەمانە لەوانن لە (ماد) و (کاردۆخۆ) کانن، زمانەکەشیان مێراتییە لەوانەوە بۆیان ماوەتەوە ئەوە هیچ پەڵپی لێناگیرێت. کەواتە زمانی کوردی ئێستا ئەبێ وەك زمانی (ماد)ی کۆن بێت. مێژووی ئێرانی کۆن وتوویە: زمانی فارسی کۆن، (سانسکریتی هیندو زمانی (ئاوێستا)ی زەردەشت گشتی لە زمانی (ئاری) پەیدا بووە. زاناکانیش ئەڵێن کوردەکانی ئەمرۆ لە نەتەوەی مادەکانن و زمانەکەیان لە زمانی ئەوانەوە هاتووە. لەدەوری ئەخەمەنییەکانا شێوەی زمانی نەتەوەی حاکم کە (فارس) بووە دیارە بووەتە زمانی ڕەسمی وتن و نوسین لە حکومەتدا. لەکاتی ئەم حاکمیەتەدا گەلێك وتەی فارسی کەوتووەتە کوردییەوە. تەنانەت زمانی تایەفە کوردەکانی جەنووبی غەربی ئێران کە (لوڕەکان)ە وتەی فارسی زیاتر تێکەوتووە. چونکە ئەمان نزیکتر بوون بە فارسەکان؟[١٠]. ناوچەی (کاردۆخ)و (مێدیە) وتەو شێوەی (ئەرمەنی) وە لە دوایدا (ڕۆمی)ی تێکەوتووە، چونکە کوردەکانی شیمالی ئێران زۆر نزیك بوون بە مان. لەسەر ئەوەشا لەدوای حوکمی ئەخەمەنیەکان

---

[١٠] سەیاحەتەکانی (هەر دوت) پیشانی ئەدات.

شێوەیەکی تازە لە شیمالی ئێرانا پەیدابووەو باوی سەندووە لە مێدیەی جاران. ئەهالی بەم شێوە تازەیەیان وتووە پەهلەوی. دواجار ئەم شێوە تازەی زمانە بووەتە زمانی ئەدەب و نوسین و ساسانییەکان کردوویانە بە لەهجەی ڕەسمی حکومەت . خاوەنی (مێژووی کۆنی ئێران) ئەڵێت: لە وردبوونەوەی ئاثارو نیشانەی دۆزراوە بۆمان دەرئەکەوێت کە زمانی (پەهلەوی) لەدوای دەوری ئەخەمەنی بووەتە شێوەی زمانی هەموو خەڵکی ئێران. تەنانەت کە ئیسلامەتیش پەیدا بووە هەتا سەردەمێك لەهجەی پەهلەوی لە هەموو ئێرانا هێشتا زمانی کۆمەڵانی خەڵك بووە. لەم دواییەدا لە (فەیووم) لە میسر نوسراوێك دۆزراوەتەوە هی کاتی سەدەی دووەهەمی هیجرییە بە زمانی پەهلەوی نوسراوە، ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی ساسانییەکان، وا دەرکەوتووە ئەم نوسراوە زۆر نزیکە بە زمانی کوردی چونکو وتەی نوسراوەکە زۆر لەوتەی (کوردی)ی ئێستا ئەچێت وەکو وتەی (دینی کەرت) یەعنی (ئاایینی کورد) لەو نوسراوانەیە. وە لەسەدەی سێهەمی هیجریدا نوسراوێکی تریش دۆزراوەتەوە بەناوی (داستانی دینك) ئەم نامیلەکەیە کە بە شێوەی (کوردی کرمانجی) نوسراوە باسی ئاایینی زۆر تیایە)[١١]. زانای ئەم باسە ئەڵێت ئەلف وبای پەهلەوی زۆر سەختو گران بووە چونکە وەها دەرکەوتووە کە لە نوسینی پەهلەویدا هەزار پیت زیاتر بەکارهێنراوە، وە (ئەلف و با)ی پەهلەوی لە (ئەلف و با)ی ئارامیی وەرگیراوە. لەناو زاناکانا وا باوە ئەم جۆرە نوسینانە تەنیا قەشەی مەجووسەکانی ئیستای هیندوستان کە (پارسی)یەکانن ئەتوانن بیخوێننەوە. ئەو نوسینانەی لە ڕۆژاوای ئێرانا لەدوای (ئەسکەندەر) دۆزراونەتەوەو بە زمانی پەهلەوی نوسراون، لای زانایانی ئاثار بوونەتە (بەڵگە) بۆ سکەی دەوری ساسانی کە ئەدۆزرێتەوەو هەندێك زاناش ئەڵێن دەنگ وایە لەکاتی دوایی ساسانییەکانا بەفەرمانی شای ئێران شێوەی (فارسی) بووەتە زمانی ڕەسمی حکومەت ، چونکو نووسینو خوێندنەوەی پەهلەوی زۆر گرانبووە. لەبەر ئەوە بەناچاری وازیان لێهێناوە. جا، ئەوسا بەم زمانە سووك و تازەیە کتێبی (ئاویستا) تەرجەمە کراوە، پێیان وتووە (زەند) وەیا (زەنداویستا). جا سەرگوزوشتەی (زەنداویستا) بەم دووجۆرەیە. لە دواییدا کە ئیسلامیەت پەیدا بوو، وە بە کوردوفورسەوە هەموو ئێران بووەتە موسڵمان، وەخت بووە ئەمانە هەمووی لەناو

---

[١١] بۆ زانینیی زیاتر بڕوانە مێژووی امین زکی بەرگی یەکەم بەعەرەبی باسی (اللغە و اللسان) ل٢١٤-٢١٩.

بچێت کشت زمانی (ئاری) خویر بدرێنەوە. بەرەنگەندا پاشاکانی ئەوسەی (بویەیی)
گەیشتوومنەتە فریایو نەیانهێشتووە ئەم میراتی ئارییە یەعنی زمانی ئاری بە یەکجاری لەناو بچێت. ئەمریان کرد کە زمانی ڕەسمی حکومەتی ئێران (فارسی) بێت لە( ٣٦٧هـ ، ٩٧٧م)دا. ئەم مەترسییە لەبەرئەوە بووە کە وتەی (عەرەبی) بە لێشاو کەوتووەتە زمانی فارسییەوە خەریك بووە زمانە کە هیچ بایەخی نەمێنێت[١١].
بێینەوە سەر زمانی کوردی کە هیچ دالدەیەکی نەبووە، وە کەسێك نەبووە پارێزگاریی بکا تەنیا هەلکەوتی سروشتی جوغرافیای (نیشتمانی کورد) کەوتووەتە فریای. یەعنی چیاکانی کوردستان بۆی بوومەتە پەرژین لەگەلْ زمانەکەیا نەتەوەکەشی پاراستووەو لەناو نەچووە.

•

## کورتەی تطوراتی مێژوویی زمانی کورد لە (٣) هەزار سالْ پێش میلادەوە

کورد، وەك قەومایەتییەکەی لە تێکەلْبوونی نەتەوەی کۆنو تازەی (ئاری) بەرهەمهاتووە، زمانەکەشیان بەهۆی ئەم تێکەلاوبوونەوە ئالوگۆڕی تێکەوتووە، عێلەگەورەکانی (ماد) کە گەیشتوونەتە. ڕۆژاوای ئێرانو زالْبوون بەسەر تایەفە کۆنەکانی زاگرۆسا، تایەفە کۆنەکان لەژێر ئەم ئارییە تازانەدا توانەوەو تێکەلْیان بوون. زمانی (ماد) بەم تێکەلْبوونە زۆر وتەی تازەی تێکەوتووە ولاتی تازە، ناوی تازە، نەتەوەی تازە، چەشنە سەرزەمینی تازەی خولْقاندووە. بەکاوخۆی هەموو شتێك گۆڕراوە. زمانی ماد هیچی لەکیس نەچووە، بەلْکو بەوتەی تازە زمانەکەیان دەولەمەندبووەو بەلْکو شێوەکەشی گۆڕراوە، نەخوازەلا لەناو تیرەی نەتەوەکانا.

### لە ١٤٠٠ پێ.م تا ٦١٢ پێ.م:

ئینکار ناکرێ کە کوردو فورسەکان ئیمڕۆ خزمو کەسی یەکترین، وە لە زمانیشا بەیەك بێگانە نین، بەلام چونکە ناوچەی جوغرافییان جیابووە تطوراتیشیان جیاجیا بەسەرهاتووە. زمانی فارسی لە ناوچەی خۆیا ئالوگۆڕی تێکەوتووە. هەرچی زمانە کوردییەکەیە لەدوای تێکەلْبوونی ماد بەمباقیاتی تایەفە کۆنەکانی کوردستان، ئەویش

---

[١١] مێژووی امین زکی تەرجەمەی عەرەبییەکەی. بەرگی یەکەم ل٣٢٢-٣٢٤.

لە ناوچەی تایبەتی خۆیا تطوری بەسەرا هاتووەو شکڵی زمانێکی ئاری تازەی سەندووە. ئەمجا دیارە لە فارسی چوونی زمانی کوردی لەبەرئەوەیە کە ڕەگەزی هەردوو زمانەکەیە، ئەگینا زمانی کوردی تێکەڵو پێکەڵبووی زمانی فارسی نییە، بەڵکو زمانێکی جیای سەربەخۆیە وەك (سێر سیدنی سمیث) خاوەنی مێژووی (ئاشۆر) ئەڵێت: لەسەدەی شەشەمی پێش زاییندا نەتەوەی کورد زمانی تایبەتی خۆی هەبووە لەناو زمانەکانی چواردەوری خۆیا. وە (مێجەر سۆن)یش ئەڵێت: ئەمە ڕاستەو زمانی کوردی لەو کاتەدا سەربەخۆ بووە (١٤٠٠پ.ز.م تا ٤٠٠ پ.ز.م)[١٣]. زمانی پێشووی (ماد)و (پارس)و (هیندی)یەکان کە لە کاتی تەق و ڕەوی جیابوونەوە کەیانا چونیەك بووە، بەمرووری زەمان زۆرگۆڕراوە. لە هینددا ناوی بووەتە (سانسکریتی) و زمانی ئێرانییەکانیش لەسەرشێوەی تازە پێیان وتوون (پەهلەوی)و (فارسی) کە جیاجیا دوو شێوەی شیمالو جەنووبی ئێران بووە. پەهلەوی لەسەرشێوەی (ماد) و (کورد)ەکان بووەو سەردەمێکی زۆر زمانی ئەدەبو ئایینو زمانی ڕەسمی حکومەت بووە بە تایبەت لە کاتی ساسانیدا. ئەگەرچی فارسییەکە ئیستیقامەتێکی ئیسلاحی تازەی وەرگرتووە، بەڵام وتەی زۆری بێگانەشی کەوتووەتە ناوو گەلێك وتەی (ئاری)ی کۆنیشی لەکیسچووە. ئەوسا شێوەی شیمال کە تەرخان بوو بۆ (پەهلەوی) وردە وردە بۆ زمانە کوردییەکە ساغبووەتەوە، وە لە شێوەی جەنووب زیاتر لەسەر بناغەی زمانی ئاری کۆن ماوە. هەرچەندە ئەویش هەندێ وتەی ئەرمەنیو ڕۆمیو قافقاسی تێکەوتووە. بەڵام بەمانەش تطورات ئەبڕاوەتەوە بەڵکو لەدوای پەیدابوونی ئیسلامیەت و بوونی قەومی (کوردو فورس) بە ئیسلام، زمانی (فارسی)و(کوردی) بەهێزش وتەی عەرەبی تێکەڵ بووە لە(٧٠٠م)تا(٩٥٠م) وە لەمدواییەدا تورکییشی تێکەوتووە. کورد کە بووەتە موسڵمان لە کەمتەرخەمی (مەلا)کانیشەوە وتەی ئایینی عەرەبی تێکەوتووە، بەڵام دیسان لە فارسی چاکتربووە، چونکە هەرچی کوردییەکەیە هەر لەنووکەوە وەك فارسییەکە بەرهەڵمەتی عەرەبی نەکەوتووە، چونکو

---

[١٣] مێژووی کوردو کوردستان تەرجەمەی امین زکی بەرگی یەکەم، ل٣٢٢-٣٢٤.

نوێندەوارەکانی کورد لەگەڵ عەرەبیو فارسیدا خەریکبوون بە کوردی نەیاننوسیوەو
ـەیانخوێندووە، وەك زاناکانی بێگانە ئەڵێن. (مێجەرسۆن) کـە زانایـەکی ئیـدارکو
ـوستەشیریقێکی بەناوبانگی ئینگلیزەو لە کوردێك چاکتر، زمانی کوردی زانیـوە، لـەم
ـبەنەوە ئەڵێت: ئەو زمانەی کە کوردەکانی ئێستا قسەی پێئەکەن وەنەبێ شێوەیەکی
ێسەرو بێ قاعیدە بێت، بەڵکو شێوەیەکی پاکوخاوێنی (ئاری)یە، لە زۆرکۆنەوە خۆی
ـاگرتووە، هەتا گەیشتووەتە ئیمرۆ لە گشت زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان زیاترخۆی لەوتەی
عـەرەبی پاراستووە تـەنیا هـەندێك وتـەی ئـایینی کەوتووەتـە نـاو (ئـەوەش چـارە
ـەکراوە) ئەگەر زمانی کوردی (کەیان)ی ببێت و بپارێزرێت و زانـای قـەومی خۆیـان
ـەگەڵیا خـەریك ببێـتو ئـەوەی بۆزمـانی ترئـەکرێت، زانـاو ئـەدیب و شـاعیرەکانی
کوردیش بۆ زمانەکەی خۆیان بیکەن، شك و شوبهە نییە کە زمانی کوردییش ئـەبێت
بە زمانێکی گشـتی ئـەوتۆ کـە هـەموویان بـەبێ زەحمـەت قسەی پێبکـەن، نـەك وەك
ئێستا هەر تیرەیەك لەشێوە تایبەتییەکەی خۆی زیاتر نەتوانێت لە شێوەکانیتر بگات.
(مێجەر سۆن) ئەڵێت: زمانی کوردی ئیصلاحاتی ئەوێت. ڕێگا بدرێ کە لە قـەواعیدو
ـوسینو سەرف نەحوی کوردیدا ناهەمواریەکانی تێدا نەمێنێت ئەڵێت: زمانی فارسی
تطوری کردووە بەڵام کەس لە زمانی کوردی نە پرسیوەتەوە. هـەموو ئـەزانین کە لـە
کاتی کۆنا زمانی فارسیو کوردی یـەك بـووە جیـاواز نـەبوون. لەپاشا لێکجیابوونـەوە،
جیاجیـا تطوری تازەیـان بەسـەرا هاتووە[٩]. فارسـی هـەرە کـۆن نـەماوە. هـەر شـێوە
چووەتـە سـەرلەهەجەیەکی تـازە بۆخـۆی. کوردییـش لەناوچـەی قـەومی خۆیـا
تطوریکـردووە، واتـە شـێوەکانی (بـاری) تازەیـان وەرگرتـووە. هەڵکـەوتی سیاسـی و
کۆمەڵایەتی (کوردستان) وای هێناوەتە پێشەوە کە گەلی کورد (کەیان)ی نەبێت، وە لە
بەرئەوەشـە کـە زمـانی کـوردی هیـچ کـاتێك شـێوەیەکی گشـتی یـەکزمانی بـۆ
ڕێکنەکـەوتووە، بـەڵکو وەکـو ئێسـتا ئـەبینرێت بەشـێوەیەکی جۆراوجـۆری وەك
کرمانجی، سۆرانی، لوڕیو بادینیو، هەندێك (لەك) هەیە بەشێوەی وردەڵەتریش قسە

---

[٩] بەرگی یەکەمی تەرجەمەی عەرەبیی مێژووی امین زکی.

عبدالله الحمدانی) له موسڵەوە بەمەرزەبان گەیشت ئەوا بەلەشکرەوە هاتووەتە سەر ئازەربایجان. لەسەر ئەم ڕووداوە مەرزەبان ناچاربووە هەندێك لەشكری لە دەوری قەڵا بەجێهێشت‌و لەگەڵ زۆربەی هێزەکەیا ڕووی کردووەتە سوپای حەمدانییەکان کە لەلای (سەڵماس) بوون‌و سەرداری عەشیرەتی (هازبەنی)، (جعفر شکۆیە)شی بەلەشکری کوردەوە لەگەڵابوو. لە میانی هەردوو سووپاکەدا جەنگ دەستپێکرد، خواو ڕاستان لەو کاتەدا بەفرێکی بێداد باریوە، ئەمجا سوپای حەمدانییەکان بەرگەی ئەم بەفرو سەرماو سۆڵەیەی نەگرتووە وازی لە جەنگ هێناوەو بەرەو موسڵ گەڕاوەتەوە. بێینەوە سەر باسی ڕووسەکان، ئەوانیش لەم کاتەدا شەو لەناکاوێك لە قەڵاکەی (شارستان هاتوونە دەرەوەو خۆیان گەیاندووەتە (گەمی) یەکانیان و گەڕاونەوە بۆ وڵاتی خۆیان. بەمجۆرە حکومەتی (ڕوادی) لە ئاژاوەی دوژمنانی دەرەوە ڕزگار بوو.لەدوای ئەم بێدەنگییە مەرزەبان شا دووبارە کەوتەوە ڕێکخستنی ئیشوکاری ناوخۆیی وڵاتەکەی لەگەڵ ئەوەشا خەریکبوو سنووری وڵاتەکەشی گەورە تر بکات. بەڵام مەرزەبان هیچ کاتێك لە دوژمنی دەرەوە ڕزگار نەبووە. لەم دەورەیەدا حکومەتی (ئال بۆیە) دەسەڵاتی بۆ عەبباسییەکان نەهێشتبوو (معز الدولە)ی بۆیەهی حوکمی بەسەر عێراقا ئەکرد، لە بەغدا هەرخۆی حیساب بوو. (رکن الدولە)ی براشی حاکمی شیمالی ئێران بوو لە شاری (ڕەی)دا ئەنیشت. مایەوە (عماد الدولە)ی برایان ئەویش حوکمداری ئێرانی باشوور بوو لە (شیراز) دا ئەنیشت (٣٢٢هـ ٩٤٠م). چونکە لە بەغدا باڵیۆزی مەرزەبان سەرزەنشت کرابوو سەردارەکەی مەرزەبان لە (معز الدولە)ی مەلیکی بۆیەهی زۆر دوڕ دۆنگ و دلگیر بوو، ئەیویست تۆڵەی لێبکاتەوە. بەڵام ئەبوایە لە پێشا بەگژ (رکن الدولە)ی برایا بچێت کە لە (ڕەی) بوو بۆ ئەوەی لە پشتی سوپاکەی ترسی نەبێت. لەبەرئەوە جارێ لەگەڵ (ناصر الدولە)ی حەمدانی (موسڵ ) ڕێککەوت تا ئەم بتوانێت بچێتە سەر رکن الدولە و لە(ڕەی) بیشکێنێت، بۆ ئەوەی لە دواییدا هەر دووکیان بچنە سەر (بەغدا)و حکومەتی بۆیەهی بەجارێك لەناو بەرن. بەڕاستی بڕیاری سەردار مەرزەبان لەسەر ئەم تەدبیرە لەوا نەبوو کە گەڕانەوەی تیا بێت بەڵکو لە دڵیا پێویست بوو کە سنووری دەوڵەتەکەی گەورەتر

بکات، کەچی بە ديمەن تۆڵـە کردنـەوەی کردبـوو بـە بيـانوو، لەبەرنـەوە کەوتـە تەدارەکاتو لەشکرئارایی. رکن الدوله ئاگاداری ئـەم گردەوارییانـەی (مـەرزەبان) بـوو لەبەرئەوە دەسبەجێ بۆ براکـانی نووسـی و داوای کۆمـەکی لـێکردن، ئـەوانیش خـێر سوپایان بۆ نـارد. لـەدوای ئـەم تەدارەکاتـەی هـەردوولا سـوپاکانیان بەرامبـەر یـەك وەستاو شەڕێکی قورسیانکرد کوردەکان هەڵەتی مەردانەیان نەکرد، بـەڵام دوژمـن بـە ژمارەو بە تەدارەکاتی چەك زۆر لەو سەرومرتر بوو، لەبەرئەوە سەرەڕای ئەم هەموو هەڵمەتانـەی سـوپای ڕوادیـەکان دەرەقـەت نـەهات و شـکا. لەسـەرکردەکانی سـالار مەرزەبان زۆریان لێ کوژرا بوو، وە هەندێکیشیان لەگەڵ مـەرزەبانا بـەدیلگیرابوون، رکن الدوله مەرزەبانی نارده بەندیخانەی قەڵای (سمیرم) لای ئەسفەهان.باقی ماندەی لەشکری شکاو گەڕایەوە ئازەربایجان، لەوێ مـاقووڵانی دەوڵەتی ڕوادی کۆبوونـەوە لـە دوای ئەنجومەنیکی بەهەراو هوریای گەرم (واهسـوٚزان)ی بـرای مـەرزەبانیان کـرد بـە حاکمی خۆیان، ئەمجا کشانەوە بۆ شاری (ئەردەوێڵ)، لـەدوای ئـەم بڕیـارە دەسیانکرد بە تەقەلای پاراستنی دەوڵەتەکە. وە لەبەر ئەوەی بـە باشیانزانی (دیسم) یشیان لـە بەندیخانـە بـەردا کەوتنـە تێکۆشانو بەربـەرەکانێ لەگـەڵ محەمـەد عبدالـرزاق نـاو سـەرۆك لەشـکری (رکـن الدولـە) کـە کرابـوو بـە حـاکمی ئازربایجـان لەلایـەن بۆیەهییەکانەوە. لە ئەنجامی ئەم کێشمە کێشمەدا والییەکەی رکن الدوله نـەیتوانی لـە ئازەربایجان بحەوێتەوەو گەڕایەوە (ڕەی) لە ٣٤٢ هـ ، ٩٤ م دا.

ڕزگار بوونی مەرزەبان:

لەدوای ئەم کارەساتە بەسایەی دەسەڵاتو نوفوذێك کە لـە ناوتایەفـەکانی دەیلـم و کوردەکانا هەیبوو، دەیسم خەریکبوو حوکمی وڵاتەکە بۆ خۆی داگیر بکـا. لەلایەکـەوە ئـەم کەمین‌وبەینـە لـە ئازەربایجانـا هەڵئەسـوڕا. لەلایـەکی تـرەوە خـزمو دۆسـتی (واهسۆزان) لە قەڵای (سمیرم) خەریکی بەردانی (مـەرزەبان)بوون. ئەمانـە دڵسۆزانە تێنەکۆشان لە موئامەرەیەکدا. ئەمانە کاربەدەستی قەڵاکەو بەندییەوانەکانیان کوشت و مەرزەبانیان ڕزگارکرد، ئەوسا هەموویان پێکـەوە هاتنـەوە ئازەربایجان. لەملاشـەوە

واهسوران حەریکی ئەدبیری لەناوبردنی دەیسم بوو. نوندوبیریی دەیسم بوی ببوو
خراپەو چووبووە ئەستۆیەوە. بێجگە لەمە کوردەکانی دەیلەمیش لێی بە بیانووبوون
و خزمەکانیشی لێی تۆرا بوون. بۆیە کە دەیسم بە لەشکرەوە هەستاو چووە سەر
تاقی واهسۆزان و بەرەنگاری یەك بوون، دەیلەمییەکان لایان دایە لای دوژمن لەسەر
ئەمە دەیسم رایکردو خۆی گەیاندە ئەرمەنستان. جا لەمکاتەدا مەرزەبان گەیشتەوە
ئازەربایجان‌و حوکمی گرتەوە دەست. ئینجا لەدوای هەندێك سەرگوزشت لەسەر
راسپاردنی مەرزەبان دەیسم گیراو هێنرایە تەورێز. لەوێ میلی بەچاوا هێنراو کوێر
کرا. ئینجا خرایە بەندیخانەوە. لەدوای بەینێك (جوستان) کوشتی. لەدوای ئەمانە
مەرزەبان زۆر نەژیاوە. واهسۆزانی برای کردووە بە جێنشینی خۆی و جوستانی
کوڕیشی کردووە بەجێنشینی ئەو. جا لە دوای ئەم تەتبیقاتانە ئەم شای گەورەی
ئازای کوردە لە ساڵی ٣٤٥هـ ٩٥٥م دا مردووە.

## واهسۆزان و کوڕانی مەرزەبان:

سالار مەرزەبان سنووری دەوڵەتی (ڕوادی)ی گەورە کردبوو. ئەرمەنستان‌و توورەی
مەراغەو موکریان (موقان)یشی خستبووە سەر ئازەربایجان. رکن الدولەشی کردبوو بە
ناوای خۆی و لەگەڵیا ئاشتبووەوەو هەرئەوەی پێئەویست سالارێکی گەورەو با
تەدبیری بێت. دەوڵەتەکە بەرێوە ببات. بەڵام داخم ئاچێت ئەم گەورەیە پەید
نەبووە، بەڵکو بۆ بەدبەختیی لەدوای مردنی مەرزەبان فرمانی دەوڵەتەکەشی
تێکچووە، چونکە وەسیەتەکەی سالار مەزرەبان بەجێنەهێنرا. کوڕەکانی مەزرەبان و
واهسۆزانی مامیان تێکچوون و ئاژاوەیان خستووەتە وڵاتەکەوە. پیاوماقووڵانی
دەوڵەت(دۆستان شا)یان کرد بەجێنشینی باوکی. (واهسۆزن)یش کەوایزانی زیز بوو
چووە قەڵای (ترم) لەوێوە دەستیکرد بە تێکدانی وڵات‌و فیتنە نانەوە. دوودڵیی
ناخۆشی خستەناو برازاکانیەوە، ناخرییەکەی کردنی بەگژ یەکا. (جوستان شا)
ناسری برای و دایکیانی بەفێلگرت و حەپسی کردن‌و گەلێك پارەشی بەسەرلەشکر
سەرکردەکانا بەشییەوەو ئیدارەی حکومەتەکەی گرتە دەسخۆی، برایم سالاری کوڕی
مەزرەبان لەمکاتەدا لە ئەرمەنستان بوو. کە ئەم هاوارەی بۆ هات لەشکری هێنا

هاتەسـەرمامی. واهسـۆزان کـە وایزانــی ڤینــی هەڵسـاو بەرقــەوە بــرازاو برازنــە بەندکراوەکانی لای خۆی کوشتو ئەمجا سوپای هـەلگرت بـەرەو پـیری (برایـم) سـالار چوو، (٣٥٩هـ) ئەم لەشکرە (ورمیە)و (مەراغە)ی داگیرکرد. برایـم سـالاریش هـەلات و گەڕایەوە ئەرمەنیە. لەدوای بەینێك دووبارە سوپای هێناو هاتەوە سەرمامی، بەڵام لە ئـەنجاما ئـەم جارەش هـەر خۆی شکاو ڕایکردە لای (رکـن الدولـە)ی بۆیـەهی زاوایـان لـە(ڕەی). رکـن الدولـە حورمـەتی گـرتو لـەدوای بـەینێك لەشکری دایـەو نـاردی بـۆ ئازەربایجان ئـەم جارە واهسۆزان شکاو لـەناوچووە. مەشـوەرەت وایـە برایـم سـالار لەمەولا بەبێ ناحەز تا ٣٨٠هـ لەسەر تەختی ڕوادی لە ئازەربایجان حوکمی ڕەوابووە. تەنانـەت وڵاتـی شارەزووریشـی لـە ژێـر حوکمـابووە. لـەم کاتــەدا کیشـوەرەکان بـێ شەڕوشۆڕحەساونەتەوەو نـاوەدانیی و دەوڵەمـەندیی ڕوویکردووەتـە ناویـان. لەلایـەن ڕەوشـتو پیشــەی برایـم سـالارەوە لـە مێـژوودا ئـەوی دیـارە ڕابـواردنو عـەیشو نۆشەکەیەتی. لەدوای مردنی برایم سالار یەك لەدوای یـەك (ڕاویدی)ی کوڕی برایـم سالارو (گلاس)ی کوڕی ڕاویدیو ئەمجا (واهسۆزان)ی دووەم کە کوڕی گلاسە چوونەتە سەر تەختی پادشایەتی تاکو ٤١٥هـ حوکمیان بەجێهێناوە.

### واهسۆزانی دووەم:

فـەرمانڕەوایی واهسـۆزان شـای دووەمـی روادی زۆر درێـژ بوومتـەوە، بـەڵام داخـی گرانم مەسەورەو ڕووداوی ئەم دەورە ونە. حکومـەت لـە ٤١٥هـ وە تـا ٤٥٨ هـ (١٠٦٥م) هەرچی حوکمدارانی ڕوادی هەیە بە واهسۆزان کوڕی مامەڵان ناوبانگیـان ڕۆیشتووەو لە ڤەبیشیان (ناصر خسرو) وەیا (سیف الدولە ابـو منصور) بـووە. جـا بـە تـەواوی نەزانراوە کە ئەمانە هەموو هەر واهسۆزانی دووەمـە یانـە خـۆ ئەشخاصی تـر بـووەو واهسۆزانیان پێوتـوون. لـە (٤٢٠هــ ١٠٢٩م) دا خێڵی درنــدەی (غـەز) کـە لـە بـەرەی تورکمـانن هەڵمـەتیان داوەتــە سـەر ڕۆژاوای ئـێران و ڤۆڵێکیشـیان ڕوویکردووەتــە ئازەربایجان و بەینێك گەشتی ئەو ناوەیان کردووەو بێژاویانە. لـە دواییـدا خێڵەکانی کورد کە (هازبەنی)شیان تیا بووە لە تاوانا گشتیان هەڵساونو یـەکیانگرتووەو لەگـەڵ سوپای وا هسۆزانی شادا پێکـەوە پـەلاماری ئـەم خێڵە درندەیـەیان داوەو زۆریـان

لێکۆشیوونو بە هێل سەرەتەکانیان لەناوبردوونو لە وەختە [illegible]

٤٣٢هـ. لە ساڵی ٤٤٦هـ ١٠٥٤م دا سوڵتان (طغرل)ی سەلجووقی کە لەئەسفەهانەوە ڕوویکردووەتە ئازەربایجان (ابومنصور واهسۆزان) سەری بۆ دانەواندووە، واتە بووەتە تابیعی مەلیکی سەلجووقیەکان. بەم ڕەنگە دەوری سەربەخۆیی حکومەتی ڕوادی دوایی هاتووە. لەمەولا بووەتە دەوڵەتی ژێردەستو لەلایەن هەواڵیشیانەوە زانیاری کەمبووەتەوە. برایم سالاری کوڕی واهسۆزان تا ٤٩٠ هـ ١٠٩٦م لە دوای باوکی بەژێر دەستیی سەلجووقیەکان حوکمدارێتییکردووە. وەها دیارە حکومەتی میرەکانی تورك لەکاتی حوکمدارێتیی ئەما ناوچەی تەورێزی داگیرکردووە، حکومەتی ڕوادی هەر لە مەراغەو موکریانا ماوە.

## میر ئەحمەدیل:

ئەم سەردارە کوڕی سەردار برایمی واهسۆزانە. لە مەراغەدا حکومەتی ڕوادی زیندوو کردووەتەوە. ئەمجارە حوکمیان هەتا ٦٢٤ هـ ١٢٢٦م درێژەیکردووە. لەمدەورەدا موڵکی عەبباسی سەرپا بەدەستی دەرەبەگەکانەوە بووە. هەمووشیان بەدیمەن (سەربەخۆ) دیاربوون. ئەم جۆرە بەڕێوەچوونی حکومەتییە لەوکاتەدا لە ئەوروپاشا هەر وابووە. یەعنی ئاغاو بەگەکان لە ناوچەی خۆیانا سەربەخۆ بوون، بەڵام بەڕەسمیات ژێر دەستی خەلیفەبوون. لە مێژوودا ئەمجۆرە ئیدارەیە ناونراوە (اقطاع - دەرەبەگی). کەچی لە ڕۆژهەڵات، لە وڵاتی ئیسلاما لەمکاتەدا لەگەڵ خەلیفەکانی عەبباسیدا گشت ئومەرای ئەقطاعیش فەرمانبەرو ژێردەستی مەلیکەکانی سەلجووقی بوون. میر ئەحمەدیلیش یەکێك بووە لەوانە. لە بارەگای شای سەلجووقدا لای سەرپەڕ دائەنیشت. لەوکاتەدا ئەمە ڕوتبەونیشان بوو. میر ئەحمدیل هەمیشە ویستوویەتی شەوکەتو دەسەڵاتی جاران بداتەوە بەدەوڵەتی (ڕوادی). دەستە سوپ سوارییەکەی زۆر بە جەنگ بووە. لە بارەگای (سوڵتان محەمەد مەلیکشاە)ی سەلجووقییدا، باطینییەکان بەخەنجەر کوشتوویانە...

## ئاق سونگور ئه حمه‌دیل:

ئه‌مجۆره ناوانه له توركییه‌وه هاتووه، عینوانه‌وخراوه‌ته سه‌ر ناوی ئه‌سڵیی سالاره‌كان، چونكه ئه‌و كاته ده‌وری ده‌سه‌ڵاتداریی توركمانه‌كان بوو. ناوو شێوه‌ی زمانه‌كه‌شیان بووه‌ته باو له‌ناو ئاغاو ماقووڵانی ڕۆژهه‌ڵاتدا. ئه‌مجۆره كاریگه‌رییانه ئێستاش هه‌یه له‌ناو نه‌ته‌وه‌كانی ئیمڕۆدا، حوكم به‌ده‌ست كێوه بێت لاسایی ناوونیشانی ئه‌كه‌نه‌وه. ئاق سونگوڕ: كوڕی ئه‌حمه‌دیل بووه، له‌دوای باوكی له (٥١٠هـ ١١١٦م)دا له مه‌راغه بووه‌ته سه‌رداری ده‌وڵه‌تی ڕوادی وه له ٥٢٧هـ دیسان به‌ده‌ستی باطینییه‌ك وه‌كو باوكی كوژراوه لای شاری هه‌مه‌دان كه بۆ كۆمه‌كی سوڵتان (مسعود)ی سه‌لجوقی چوبووه ئه‌وێ. سه‌رۆكایه‌تی ئه‌م ئه‌میره به‌رده‌وری هه‌راو زه‌نای شاهزاده‌كانی سه‌لجووقی كه‌وتووه‌و ناوچه مولكی ڕوادی بووه‌ته پێخوستی له‌شكرو سوپای ئه‌م شازادانه كه به‌گژ یه‌كا ئه‌چوون. له‌به‌رئه‌وه گه‌لێك جار ئه‌ماره‌ته‌كه‌ی (ئاق سونگور ئه‌حمه‌دیل) له ژێر پێدا له‌ناوچووه‌و سه‌رله‌نوێ دروستكراوه‌ته‌وه له ئه‌نجامی كارا میرئه‌حمه‌دیل بووه‌ته (ئه‌تا بوك) واته (له‌له)ی شازاده (داود)ی كوڕی سوڵتان مه‌حموودی سه‌لجووقی پادشای به‌غدا كه به‌جێنشینی باوكی دانرا بوو. له‌و ده‌وره‌دا ئه‌تابه‌ك پیاوی هه‌ره گه‌وره‌و ماقووڵی (ده‌وڵه‌ت) بوو.

## ئاق سونگوری دووه‌م:

ئه‌م ئه‌میره كوڕی ئاق سونگوڕی یه‌كه‌مه. وا ده‌رئه‌كه‌وێ تا ساڵی ٥٦٤هـ (١١٦٨م) له‌سه‌ر میرنشینی ڕوادی مه‌راغه حوكمیكردووه. له كاتی حوكمی ئه‌میشا هه‌رای ناوخۆیی شاهزاده‌و ماقووڵانی سه‌لجووقی دوایی نه‌هاتووه‌و له ڕووی ئه‌م پشێوییانه‌وه ئه‌ماره‌ته‌كه زۆر كزبووه. له‌دوای گه‌لێك هه‌راو چه‌رمه‌سه‌ریی ئازربایجان له ناوه‌ند (ئه‌میر ئیل دنگز)و (ئه‌میر ئاق سونگور) دابه‌شكراوه له (٥٤٩هـ ١١٥٤م)دا ئاق سونگور ئه‌مجا بووه‌ته وه‌صی شاهزاده داوودی جێنشینی (سوڵتان محه‌مه‌د)ی سه‌لجووق واته (ئه‌تابه‌گ) یه‌عنی له‌له‌ی جێنشینی ده‌وڵه‌ت، ته‌نانه‌ت ئه‌م شاهزاده‌یه كه بووه‌ته پادشاه له به‌غدا ئاق سونگور چووه بۆ دیده‌نی، له‌وێ (ئه‌ریزیه)كی - حورمه‌ت

زۆری گیراوه  له ٥٦٢هـ ١١٦٦م دا. وهها دیاره ئاق سونکور له ٥٦٤هـ دا مردووه، (هتلغ)ی برای و کورەکانی ئاق سونگور لەسەر میراتی ئەمارەتەکە بەگژ یەکاچوون. بەمە ئەمارەتی مەراغە پەلپەلبووە. بەناو ئاق سونگوری سێیەم بوومتە میری مەراغە لە جێی باوکی، بەڵام ئەمارەتەکە ئەوەندە کزببوو لە دەسەڵات کەوتبوو. (پەهلەوان) کوڕی (ئێل دنگز) ناو سەرداری تورکی ئازەربایجانی حوکمی بەسەرا ئەکرد. ناوچەی تەورێز کە هێشتا لە جوملەی مولکی ئەمارەتی مەراغە بووە لە ٥٧٠هـ ١١٧٤ م دا دراوە بە ئەمیر پەهلەوان ناو نەتەوەی ئێل دنگز کەسەردارێکی تورکی بەچنگ بوو. ئەمە بوومتە خۆرەی ئەم لکی حکومەتی ڕوادی کوردە. ئەم کابرایە هەمیشە بە بیانوو بوو لەگەڵیان شەڕی پێنەفرۆشتن، ماڵی ئەبردن. لە ٦٠٥هـ ١٢٠٨م دا بەشاری مەراغەوە هەموو ئەمارەتەکەی داگیرکردووە. تەنیا قەڵای (ڕۆین دژ) کە زۆر قایم بووە بەدەس خانەدانی ئەحمەدیلەوە ماوەتەوە. بەیێنێکیش ئافرەتێکیان لەم قەڵایەدا حوکمی کردووە کە پێویستە بە شاژنێکی کلۆڵی بزمێرین چونکە دوا حاکمی خانەدانەکەیە. ناوی (من هواداد) بووە لە ٦١٨ هـ ١٢٢١م دا لافاوی سوپای مەغۆلیشی دیومو لە قەڵاکەیا بە پارێزراوی ئەم هێرشە بەسەریا ڕۆیشتووە. ئەوەندە هەیە لە دوایدا (جلال الدین شا)ی خوارەزمی کە لە عێراق گەڕاوەتەوە بێرەدا ڕۆیشتووە ئەم شاژنە بەدبەختەی مارەکردووە. جا بەم شووە بێجێیەی (مەلیکە هوداد) ئەو تۆزە حاکمییەتەشی نەماوە. بەمجۆرە لەدوای حاکمیەتیکی ٤٠٠ ساڵە خانەدانی (روادی)ی کورد بە تەواوی لەناوچووە (٦٢٤ هـ ١٢٢٦م)[۱].

**٢-حکومەتی دۆستەکی و مەروانی:**

١- دەوری دۆستەك: دامەزرێنەری بناغەی ئەم حکومەتی کوردە (شاه باز باد) ناو کوڕە کوردێکی دۆستەکییە سەرداری خێڵی حەمیدی بووە لە نزیك شاری دیاربەکر لە ئاوایی دۆستەك ناوی کوردا لە ٣٤٠هـ ٩٥١م دا. ئەم کەڵە مێردەی نەتەوەی کورد لە

---

[۱] دەوری حکومەت و ئەمارەتەکانی کورد هەمووی لەسەر مێژووی کوردو کوردستانەکەی امین زکی بەگ دروستکراوە.

کاتی ژیانی باوکیا کە خۆی هێشتا هەرزەکار بووە کەوتووەتە سەودای پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ. ئەوجوانێکی بەسام و بەخۆوە بووە، قەدو بالاو قەلافەتی نیشانەی بزورگی و زرنگی و زیرەکی تیا دیاربووە. هەر لە کاتی کورێنییەوە ناوبانگ و شۆرەتی بلاوبووەتەوە بەناو ئاسۆی خێڵەکانی کوردا، ئازایەتییەکەی بەهەموو شوێنێکدا بلاوبووبوەوەو ناوبانگی چوو بووە دڵی خەلکەوە. ئەوەی کورد لەتەك سەرداری ئازاو کردەوە ڕەنگینا هەمیشە بۆ پیشەی بەرزی مێژوویی ئامادەیە. لەبەرئەوە هیوای بڵندی شاەبازی خێرا پێکهاتووە. توورەی کوردستانی(دیاربەکرو گۆمی وان) ی بە سووكو ئاسانی دەسخۆی خستووە، لەشکرێکی ڕێکی بەتارەکو پرچەکی هەبوو. لەناوچەی (سعرد)و (بتلیس)ەوە دەسیکرد بە گەورەکردنی مەڵبەندی حکومەتەکەی. جارێ ڕوویکردووەتە ئەرمەنستان شاری (ئەحیش)ی لێسەندوون و بایداوەتەوە بۆلای ڕۆژاوا شارانی (دیاربەکر)و (میافارقین)و چواردەوری ئەمانەی داگیرکردووە. لەدوای ئەمە دیاربەکری کردووە بە پایتەختی خۆی و عینوانی (شجاع)ی لە خەلیفەی بەغداوە بۆ هاتووە. لەم کاتەدا پادشای هەرە ناوداری بۆیەهی کە (عضد الدولە)ی ناو بوو، وە (أمیر الامراء)ی دەوڵەتی عەبباسی بوو لە خزمەت خەلیفەدا، بۆ ئەوەی (حەمدانی)یەکانی پێ کزبێ و خۆی بەرزبێتەوە، لە گرتنی شاری موسڵدا شاەباز یارمەتی عضد الدولەی بۆیەهی داوەو بۆ دیدەنی چووەتە بارەگای عضد الدولە. مەلیکی بۆیەهی لە چاو پێکەوتنی ئەم سەرداری کوردە سامی لێنیشتووەو بیری خراپکردووە لەدڵیا. (شاەباز)یش هەستی بەم دڵپیسییەکردووە خێرا گەڕاوەتەوە لەشکرگای خۆی. لە دوای ئەمانی عضد الدولە لە (٣٧٣هـ ٩٨٣م)دا وڵاتی (ئەسیبین)یش کەوتووەتە دەس شاەباز. بەمە حوکمی شاەباز هەتا دەوری موسڵ ڕۆیشتووە. بەم بۆنەیەوە ناخۆشیی بەینی بۆیەهی و دۆستەکییان ئاشکرا بووە، گەلێك لەشکری بۆیەهی هاتووەتە سەر پادشای دۆستەك بەلام شاەباز گشتی شکاندوون و گەلێك دیلی لێگرتوون. لەسەر ئەمە سوپاییەکی زۆرتری بۆیەهی هات، شاەباز ئەمیشی شکاند، ئەم جارە کوردەکان ویستوویانە بچنە سەر شاری موسڵ. موسڵاوییەکان سەرکەوتنی کوردەکانیان پێخۆشتر بوو لە بۆهییەکان، چونکە بۆیەهییەکانیان نەئەویست. (باز) خەریکی تارەکاتی لەشکرێکی ئەستووربوو کە بچێت شاری (بەغدا) بگرێ و دەوڵەتی بۆیەهی لەناوبەرێتو خۆی ببێت بە (أمیر الأمراء)ی دەوڵەتی عەبباسی و خەیاڵە بەرزەکەی بێتەجێ. (صمصام الدولە)ی بۆیەهی کە ئەمەی بیست زۆر ترسا،

دەستیکرد بە هاوارکردن و خۆمەت ویستن لە هەموو دیەکی ودنی ...
لەشکرێکی بێڕادەی کۆ کردەوەو بەسەرداریی (زیار کوڕی شارا کویە)ی دەیلەمی کە
لەو دەورەدا بەسەردارێکی زۆر بەناوبانگ ناسراو بوو، ناردیە سەر (شامباز) هەردوو
لەشکر لای تەکریت پێکهاتن‌و شەڕێکی زۆر قورسیانکرد. وەها زانراوە کە کوردەکان
زۆر ماندوو بوون‌و تارەکانی جەنگیان ناتەواو بوو، لەبەرئەوە خۆیان نەگرت‌و شکان.
لەسەر ئەمە (باز) نەیهێشت سوپاکەی بوەستێت بە گورجی لە کوشتار ڕزگاری کردو
لەڕاپەوە دیاربەکر. سەرداری بویەهی ئەیویست سوپای کورد نەحەوێتەوە بەخۆیا،
بۆیە لەشکرەکەی کرد بە دووقۆڵ و ناردی بۆسەر دیاربەکر. صمصام الدولە خۆیشی
هاتە موسڵ لەگەڵ سعد الدولەی حەمەدانی حاکمی حەڵەب ڕێککەوت کە ئەویش
بەلەشکرەوە بچێ و دیاربەکر بۆ خۆی بگرێت، بەم تەرحە لە سێ لاوە سێ لەشکر
ڕوویکردووەتە پایتەختی دەوڵەتی شامباز. بەڵام هیچیان پێنەکرا. فیداکاری ڕۆڵەی
کورد دوژمنی ترساندووە. حاکمەکەی حەڵەب فیدایی نارد کە شامباز بکوژێت. ئەم
داپاکە لە دەسیسەیەکا شای مەردان (باز)ی ئازای برینداركردووە، بەڵام دوژمن لەمە
هیچی دەس نەکەوتووەو لەلایەکی تریشەوە درێژەکردنی جەنگ دوژمنی بێتاقەت
کردووەو لە ڕێککەوتن بەولاوە چارەیەکی تریان نەماوە، لەسەرئەوە (زیار) سوڵحی
لەگەڵ (باز)دا کردووە، هێڵێ زوور (زاخۆ - نەسیبین) دانراوە بە سنوور بۆ هەردوولا.
ئەمجار صمصام الدولە لەشکرێکی ئەستووری لە موسڵ بەجێهێشت‌و خۆی
گەڕاوەتەوە بەغدا. شای کوردان لەدوای ئەم کارەساتانەش لە بیری خۆی هیچ
لاینەداوەو ویستوویە خەیاڵە کۆنەکەی خۆی هەر بباتە سەر، ئاشتییەکی بەتەمای
گردەواری شەڕ قەبووڵکردبوو بۆیە لە ٣٧٢هـ ٩٨٧م دا لەگەڵ لەشکرێکی زۆردا چووەتە
سەر موسڵ. سەرداری بۆیهی (أبو النصر خوشازە)ی تەنگەتاو کرد خێڵی (بنی
عقیل)و (بنی نمیر)یش هاتن بە هاواری (خوشازە) وە ئەمانە هەموو بوونەتە
هۆردوویەکی گەورە، ئەمجا بەرەنگاری قۆڵە لەشکری برای (شامباز) بوون. ئەم قۆڵە
لەشکرە شکاو برای شامباز کوژرا. لەسەرئەمە لەشکری کورد لە دەوری موسڵ
کشاوەتەوە. لە دوای ئەمانە حەمدانییەکان کەوتوونە بزوتن و بۆیەهییەکان
ڕوویانکردووەتە کزی. شامبازیش لەم هەلە نەگەڕا بۆیە دەستدرێژییەکانی پەیدا
بووەوە تا دەوری موسڵ قۆڵ قۆڵ نومایشی ئەکرد. بەڵام وا دیارە کاربەدەستانی
موسڵ‌و بەغدا لە پەیدابوونی دەوڵەتێکی گەورەی کورد سڵەمیونەوە، بۆیە کەوتوونە
تەدبیرو ڕای یەکگرتن لەناوخۆیانا. لە ساڵی ٣٧٩هـ دا سەرەکەکانی بەنی عوقەیل و بن

ئەمیرو حەمدانی و موسڵاوییەکان گشتیان ڕێککەوتوون کە ناوچەی موسڵ بۆ حەمدانییەکان و توورڕەی جەزیرە بۆعەشیرەتەکان بێت. لەسەر ئەمە لەشکرێکی ئەستووریان کۆکردەوەو دەسیانکرد بە تێکۆشان. لەشکری شاەبازیش لای موسڵ بەرەنگاریان بووە. هەوەڵ کۆ حەمدانییەکان شکاوون، بەڵام موسڵاوییەکان لەگەڵ سوپای بەنی عوقەیل و بن ئەمیر لە پشتەوە هەڵمەتیان بردووەتە سەر سوپای کورد. ئەم کاتە شەڕێکی خوێنین لە بەینی هەردوولادا روویداوە. لەگەرمی شەڕا (شاەباز) شای کوردان لە ئەسپەکەی گلاوەو شەهیدبووە. ئەم فەلاکەتە بووەتە هۆی بێ سەرداری سوپای کورد. لەسەرئەوە لەشکری بێسەردار مەیدانی شەڕی بەجێهێشتووە، ڕوەو کەژو کێوی نیشتمانەکەی گەڕاوەتەوە بۆ لای دیاربەکر ۳۸۰ هـ ۹۹۰م.

٢- دەوری مەروانی: لەدوای جەنگی (موسڵ) لەشکری شکاو بە سەرداری حسن کوڕی مروان کوڕی دۆستەك کە برازای شاەباز بوو گەڕاوەتەوە بۆ دیاربەکر، سەردارحسن خێرا ئامۆژنەکەی خۆی مارەکرد کە لە قەڵای (حسن کیف) بوو. ئەمەشی بۆ ئەوە کرد کە بە مردنی مامی وڵات نەپەشۆکێ‌و دەوڵەتەکە لەناو نەچێت. بەڕاستی ئەم (میر ابو علی حسن)ە زیرەکیی و داناییەکی بێهاوتای نواندو. هەموو سەردارو ماقووڵانی دەوڵەتەکەی کۆکردەوە کە مەلیکێك دانێن بۆخۆیان. ئەوانیش بەیەك زمان ئەویانکرد بە شای دەوڵەتی دۆستەك. ئەوەندە هەیە باوکی ناوی مەروان بووە ئەگەرچی ناوەکە عەرەبیشە بەڵام لای کوردەواری ناوێکی ئاینی و موبارەکە. لەبەرئەوە لەمەولا بووەتە عینوانی حکومەتەکەو بەو تەحرە چووەتە مێژووی کوردەوە. بۆیە لە (أبو علی حسن)ەوە ناوی حکومەتی دۆستەك نەماوە لە جیاتی ئەو ناوی (مەروانیی) باوی سەندووە. ئینجا بەوپێیە لە مێژوودا بووەتە لکی دووەمی دەوڵەتی دۆستەك. کوڕی (حەمدانی) لەدوای سەرکەوتنیان لە هەرای موسڵ ویستیان گشت وڵاتەکانی دۆستەك داگیربکەن و ئەم دەوڵەتی کوردە لەناوبەرن. لەبەرئەوە بە سوپایەکی زۆرەوە چوونەتە سەر دیاربەکر. ئەیانزانی ابو علی حسن بۆ هەرایەکی وەها سوپاکەی ئامادەکردووە لەگەڵ تەدبیری جوانی ترا چارەی شکاندنی بۆ سوپای حەمدانییەکان ڕێکخستووە لەسەرێکی تریشەوە ئەهالی لەبەر زوڵم‌وزۆری حەمدانییەکان لێیان بێزاربوون، بۆیە کەهەردوو لەشکر پێکاهاتن لەدوای شەڕێکی قورس حەمدانییەکان شکان و زۆریان لێکوژراو (ابو عبداللە)ی حەمدانی بە دیلگیرا. بەڵام بەهیوای قازانجکردنێکی سیاسی سەردارانی کورد ئەم دیلەیان بەرەڵاکرد کەچی وا دەرنەچوو، چونکە حەمدانییەکان لەسەرشەڕ هەر ڕۆیشتن. ئەمجارە لەشکری

بەنی عوقەیل)و (بەنی نەمیر)یسیان لەت خویانخستبوو. لەسەرئەنجام لە بەینی
.یاربەکرو موسڵدا هەردوو لەشکر تووشی یەکبوون‌و شەڕێکی خوێنڕێژانەیان کرد لە
۳۸۰هـ دا تالعی شەڕ ئەمجارەش بەسەرکەوتنی کوردان ئەنجامیهێناوە. بەرەی
حەمدانییەکان دووبارە زۆر شکاون و پەرێشانبوون. ابو طاهری حەمدانی کە بە
شکاوی گەڕاوەتەوە (نەسیبین). ئەمیری (بەنی عوقەیل) خۆی و دەست و پێوەندی
گرتن و هەموویانی کوشت و چووە سەر موسڵ ئەویشی گرت، کەچی ابو علی حسن
شاه بەهەڵە چوو، لەسەر دوژمن نەڕۆیشت تا بە تەواوی لەناوی بەرێت و پاشەڕۆژی
حکومەتەکەی لەسەر پتەویی دابڕێژێت. بۆیە موسڵ بە ناحەزیی حکومەتی مەروانی
هەرمایەوە. ابو علی حسن شاه لەمەولا دەستیکرد بە هەڵسووڕاندنی تەدبیرو
کردەوەی بەرێز. گەلێك فەرمانی ئاوا کردنەوەی هێنایەدی. بەڕووخۆشیی و
دادبەخشی حوکمڕانیی کرد. وردە وردە سنووری قەڵەمڕەوەکەشی گەورە کردووە.
ناوچەی (نۆرفە)ی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆم زەوتکردووەو هەموو شارەکانی باکووری
گۆمی (وان)یشی داگیرکردووە. ئەمجا خەلیفەی بەغداد عینوانی (فخر الدولة)ی
داوەتێ. ئەوەندە هەیە ئەم پادشا باشەش لەناو وڵاتیا بێ ناحەز نەبووە، چەند
ناپەسەندێك لە دیاربەکر تەدبیریان لێکردو لەناکاو کوشتوویانە لە ۳۸۷هـ دا.

### ابو سعید منصور ( ممهد الدوله )[۱۲]:

لەدوای کارەساتی موسڵ کە (شاەباز)ی تیا لەناوچوو (ابو سعید منصور مهد الدوله) گەڕاوەتەوە ناوچەی شاری (میافارقین)و کە (ابو علی حسن شاه)ی برای کرا بە شاه لەسەر حکومەتی مەروانی ئەمیش بەڵێنی ئیطاعەتی داو تاکوشتنی ابو علی حسن شاه بە حاکمی ئەو ناوچەیە ماوەتەوە کە خەبەری کوشتنی کاکی بۆهات چووەتە شاری (میافارقین) لەوێ سەردارو ماقووڵانی حکومەت کردیان بە پادشای دەوڵەتی (مەروانی). شۆرەت وایە ئەم پادشایە تا ٤٠٢ هـ حوکمیکردووە. لەو ساڵەدا بە تەدبیری هەندێك بەدبەخت ئەمیش بە کوشتن لەناوچووە. لەبابەت هەواڵی کاتی حوکمی ئەم حوکمدارەوە زانیاری زۆرکەمە. بەپێی مێژووی امین زکی بەگ، جزمی دووەم، حکوماتی کورد (لا ٧٦) ئەم پادشایە بەناوی خۆیەوە سکەی بووەو خوتبەشیان بەناویەوە خوێندوەتەوە.

---

[۱۲] ئەم جۆرە عینوانانە لەلایەن خەلیفەی بەغداوە ئەدرا بەوانەی لە دەوڵەتی عەبباسیدا دەستەڵاتیان ئەنواند.

## عادل شاه ناصر الدوله احمد:

لەکاتی کوشتنی ابو سعید منصوردا (ناصر الدولة احمد)ی برای حاکمی (سعرد) بوو، لەبەرنەوەی کە حەزی لێنەنەکرد کاکی دووریخستبووە. کە خەبەری کوشتنی براکەی بیست هاتە شاری (ئەرزن) لەوێ مەجلیسی ماقوولان کردیان بە پادشا. ئەم مەلیکی کوردە لە ٤٠٢هـ وە تا ٤٥٣هـ (١٠٦١م) حوکمیکردووە. لە هەموو ڕوویەکەوە ئەم مەلیکە بە ناوبانگترین و باشترین (شای)ی مەروانییەکان بووە. لە مێژوودا ناوی بە (عادل - دادگەر) دەرکردووە. لەدوای ئەوە بووەتە شا وڵاتەکانی (مەروانی) هەموویان یەکە یەکە سەری فەرمانی ڕەواییان بۆ دانەواندووە. لە دوای ئەوە ئەمیش دەستیکردووە بە ڕێکخستنی ئیشوکاری وڵاتەکان، فیتنەگێڕەکانی لەناوبرد. فەرەحی و دڵسۆزی بەناو خەڵقا بڵاوکردەوە لە ساڵی٤١٠ هـ دا بۆ ئەستەمووڵ و میسرو بەغداد باڵیۆزی ناردو میرسولەیمانی کوڕی کرد بەجێنشینی خۆی و ئەمجا کردی بە حاکمی (جزیرە)و (بۆتان). شاری (میافارقین)ی رسماً کرد بە پایتەخت، بەڵام گەلێك جاریش لە (دیاربەکر) ڕاینەبواردو جارو بار بەوڵاتەکانا ئەگەڕا، شارەکانی زیارەت ئەکرد، لەحاڵی مسکێنی ئەپرسییەوە (القادر بالله)ی خەلیفەی عەبباسی لە ساڵی ٤٠٨ هـ. دا عینوانی (ناصر الدولە)ی داوەتێ. لەسەر ساغکردنەوەی شاری (ڕەها- ئۆرفە) بۆلایەکیان سەردارانی مەروانیی کوردو سەرەکەکانی (بەنی نەمیر)و دەوڵەتی (بێزانس) گەلێك شەڕو هەرایانکردوە. لە ئەنجامدا ٤١٨ هـ دا عادل شاە وازی لەم شارە هێناوە. بەبێگومان ئەمجۆرە کەمتەرخەمییە لەسەر ماڵ و مەسلەحەتی دەوڵەت لە مێژوودا هەمیشەش دوژمنایەتی و دەستدرێژی هێناوەتە سەردەوڵەت. جا (بدران)ی سەرۆك عەشیرەتی (عوقەیل) لەڕووی ئەمەوە کەوتە سەر سەودای داگیرکردنی ناوچەی (نەسیبین)یش. ئەم (بدران)ە لەگەڵ (قرداش)ی برایا کە حاکمی موسڵ بوو لە دژی (عادل شاە) یەکیگرتووە بە لەشکری زۆرەوە هاتووەتە سەر (جەزیرە)و (نەسیبین). بەرەکەتدا هیچیان پێنەکرا. ئەمجا بایانداوەتەوە بە تکاو پاڕانەوە نەسیبیان لە عادل شاە سەندووە، بەڵام لە ٤٢٢هـ دا ئەمجا لەشکری ڕۆم هاتووتە سەر (ڕەها)و داگیریکردووەتەوە. بە کورتی پادشای مەروانیی دڵ نەرم و بێتین بوو، دوا

ڕۆژی لێکنەداوەتەوە، هەر لەبەرئەوەی خوێن نەڕژێت. کەچی لەم نەرم و نیانییە دوژمن کەلکی وەرنەگرت جا مەلیك بەمجۆرە پاشەڕۆژی دەوڵەتەکەی بەستبوو بە بەخشندەییەوە. بەرەکەتدا مەترسی لە ڕۆمەکان کە دوژمنی هەموو ئیسلام بوون کوردو عەرەبی یەکخستبوو، بۆیە بەسەرداری یەکێك لە ئەمیرەکانی مەروان سوپای هەردوولا هەڵی کوتاوەتە سەر ڕەها پێچاپان و گرتوویانە ٤٢٧ هـ ١٠٢٥م. وەك لە باسی حکومەتی (ڕوادی)دا دیمان میللەتی (غەز) لەم کاتەدا داویە بەسەر کیشوەری ئێران و ئازەربایجانا وێرانیکردووە. لە ٤٣٣ هـ دا لێشاوی ئەم خێڵە لەوێوە هاتووەتە ناو خاکی (کوردستان)ی مەروانییشەوە. خێڵەکانی کوردی (هازبەنی) زۆر جەنگیان لەگەڵ داون بەڵام کەلکی نەبووە هازبەنییەکان قۆڵ قۆڵ ئەکشانە ولاتی ئاوای کوردەوارییەوە ژن و منالْ پەنایبردووە بۆ کەژو کێو، هەرچی ئێرینە هەیە چەك بەدەستەوە لە مەیدانا بوون، هاژە کەوتووەتە کوردستانەوە. لە دوای شەڕەکان بەشەوو بەڕۆژ (غەز)ەکان شکاون. کوشتاری بێدایان لێکراوە. گەلێك گەورە پیاوو سەردارایان بەدیل گیراو هەرچی مالْ و تالانێك کە بە دەستیانەوە بوو لێیان سەندرایەوەو تەفرو توونا کران. ئەمە لە باکوردا. بەلام لە باشوردا هەندێك تیرەی تر لە (غەز)ەکان کە موسڵی گرتبوو، ڕوویکردووەتە خاکی مەروانییەوەو دەمیان تێژەندووە. شاە زادەی جێنشین ئەمیر سولەیمان بە لەشکرەوە بەرەنگاریان بووە دەربەندو کێوەکانی لێگرتوون و بەربەستیکردوون ئەمجا لەگەڵ لەشکری (قرواش)ی حاکمی (موسڵ)یشا یەکیانگرتووەو لەگەڵ غەزەکانا کەوتوونەتە شەڕو شکاندوویانن. کەچی قۆڵی (نەصیبین)یان خۆی گەیاندوەتە دیاربەکر شارە بەدبەختەکەیان تالان و وێرانکردووە. بەلام کە سوپای کورد بۆ یارمەتی هاتن، ئەمانە گەڕاونەتەوە بە پاشد ئەم جارە (سنجار)و (نەصیبین)و (موسڵ)یان ساف لە ساف تالانکرد. بەمجۆرە هەرچەنە ولاتی کوردستانی مەروانیی لە فیتنەی (غەز) ڕزگار بوو. بەلام لە ساڵی ٤٤٠هـ ١٠٤٨م دا هەرایەکی تازە کەوتووەتە ناو خێڵەکانی کوردستانەوە. عەشایری کوردی (هەموودی - حەمیدی) کە لە مەڵبەندی (عەقرە - ئاکرێ)دا دانیشتبوون بەدەسیسەی قرواش حاکمی موسڵ لەگەڵ خێڵە گەورەکەی (هازبەنی)کە لە ناوچەی

هەولێردا دانیشتبوو کردیانــە دوو بـەرەکی. (ابـو الحسن کوڕی موسـك) نـاو سـەرداری هەزبەنی کە حاکمی هەولێر بوو ناحەزییەکەی نیدارە نەکرد. ئـەمجا قـرواش لەگـەڵ هەزبەنییەکانا یەکیانگرت و ویستیان وڵاتی (ئاکرێ) بگرن. لەسەر ئەمە (احمد شا)ی مەروانیی یارمەتی ئاکرێییەکانی دا. بەوەی چاکبوو لەم بەینەدا هۆزی قـرواش لـەناو خۆیانـا تێکچوو بوون. احمـد شـاە لای موخـالیفی گـرت و یارمـەتی بـۆ نـاردن، نزیـك شاری موسڵ هەردوو لەشـکر شـەڕێکی قورسیانکرد. قـرواش بـەدیلگیراو لەشکرەکەی زۆر خـراپ شکا. (ابـو الحـرب امـیر سـلیمان) سـەرداری لەشـکری کـورد قـرواشـی دا بـە (زعیم الدولە)ی برای قرواش کە ناحەزی یـەکبوون بـۆ ئـەوەی لەناویبـەرێت. کـەچی (زعیم الدولە) لە ترسی دەستپەیدا کردنـی نەتـەوەی کوردو لـەناوچوونی حکومـەتی عـەرەبی موسـڵ قرواشـی بـەرەڵا کــردو هـەردوولا ئاشــتبوونەوە. ئەوسـا (مـیر سولەیمان)یش لە سیاسەتە ناقۆڵاکەی خـۆی تەریقبووەتـەوەو بـەرەو وڵاتەکـەی خـۆی گەڕایەوە. جا لەمناوەدا خوێنی سەربازە کوژراوەکانی کورد بـە خۆڕایـی ڕژاوە ٤٤١ هـ.
لـەم بەینـەدا سوڵـتان طغرل سـەلجووقی کـە دەوڵـەتی عەبباسـی لـە ژێـر دەسـتا بـوو خەبـەری نـارد بـۆ نـاصر الدولة احمـد شـای مـەروانی کـە لـە خوتبـەدا نـاوی ئـەو بخوێنرێتــەوە ئــەویش قــەبووڵیکرد. واتــە کوردســتانی مــەروانی ئیــتر کەوتــە ژێردەســتەڵاتی سـەلجووقیەکانەوە. لەمــەولا (احمــد شــاە) لــە لایەکــەوە لەگــەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای بیزانس دۆستایەتی گرت. لەلایەکی تریشەوە بەڕەوشتی جـوان و کـردەوەی ڕاست، سوڵتان طوغـرولی منــەتبار کـردووە. ڕۆمـەکان بـۆ ڕەزامـەندی ئەحمـەد شاە مزگـەوتی ئـەیوبییان لـە ئەستەمۆڵ ئـاوەدان کردەوەتـەوە. ٤٤٦هـ. (ابـو الحرب میر سولەیمان)ی جێنشینی احمد شاە کە حاکمی جزیـرە بـوو لـە ڕووی تونـدو تیـژی خوڵقییـەوە لەتـەك هـەندێ مـاقووڵانی خزمـی خۆیانـا ناخۆشـی کەوتووەتـە ناویانـەوە. مـیر سـولەیمان هـەندێك لــەم ماقووڵانــەی بـەفێڵ گرتــووەو کوشــتوونی. کەسوکاری کوژراوەکانیش ئەویان کوشتووە. بەم تەرحە لەوڵاتا ئاژاوەی نـاوخۆ پـەیدا بووە کە ئەمە بۆ پاشە ڕۆژی دەوڵەتەکەی شتێکی زۆر خـراپ بـووە (قورەیشی کـوڕی بـەدران)ی حـاکمی موسـڵ ئـەم پشێوییەی بەهـەلزانی لەگـەڵ (بختێتــە)و (بشـنۆیە)ی

کورددا که دلشکاو بوون لە ئیدارەی احمد شاەدا یەکیانگرتو بە لەشکریکی زۆرەوە چوونەتە سەر جەزیرە، لەگەڵ شازادە (میر نەسرەت)دا کە باوکی تازە کردبووی بە حاکمی ئەوناوە لە جێی میر سولەیمانی برای شەڕێکی قورسیان کرد، هەردوولا فرەیان لێکوژرا، بەلام لە ئەنجامی کارا دەستەی حاکمی موسڵ شکاو قورمیش بە برینداری گەڕایەوە. جا ئەم ئاژاوەیە کە لەڕووی تەبیات خراپی میر سولەیمانەوە پەیدا بوو نشوستی نایەوە بۆ دوا ڕۆژی حکومەتەکە (٤٤٧هـ ١٠٥٥م). لە ٤٥٢م دا ناصر الدولە احمد شاە لە تەمەنی ٨٠ ساڵەدا مردووە. ئەم پادشایە ٥٢ ساڵ بە شان و بەشەرەف حکومەتی کردووە. خەلیفەی عەبباسی (القادر باللە) عینوانی (ناصر الدولە)ی دا بوویە. لە کۆشك و سەراکانی (میارفاروقین)و (دیاربەکر)ا شاهانە ڕای بواردووە، کیشوەری مەروانیی لەدەستدرێژی دوژمن پاراستووە. لەناو شاهانی هاودەوری خۆیا پایەی مەزن بووە بەزم و ڕەزمی بارەگای بەناوبانگبووە، چێشتکەری ئەنارده میسر تا فێری چێشتلێنانی سەرای میسر ببن. چەند کچە پادشایەك ژنی بوون. ابو القالسم مەغریبی و فخر الدولە کوڕی جوهێر وەزیری بوون. گەلێك شاعیرو زانا (عولەما) لەدەوری کۆبوونەوە. (ابو عبداللەی کارزۆنی) کە مەزهەبی شافیعی لە کوردستانا بلاوکردووەتەوە یەکێکە لەو زانا گەورانەی کە لە سایەی ئەما ژیاوە. (احمد شاە) لەگەڵ زاناو حوکەمادا حەزی لە ڕابواردن ئەکرد. (ابو عبداللە کوڕی مروان) شێخ الاسلامی بوو بۆ ڕاگرتنی ڕژێمی حکومەت گەلێك کاربەدەستو فەرمانبەری داناوە. بەکورتی لە (میافارقین)دا شوێنەواری بەجێهێشتووە. باخی شاهانەی هەبووە، ئەهالی بە خۆشی تیا ڕابواردووە، قەلا، ئەخۆش خانە، وە کتێب خانەی دروستکردووە. بەڕاستی دەوڵەتی مەروانیی کوردان لە کاتی حوکمڕانی ئەما لە دەوڵەتە بەهێزە شارستانییەکان ئەچوو.

**قاسم ابو ناصر:**

لەدوای باوکی قاسم شای کوڕی بووەتە فەرمانڕەوا، لە ٤٥٢ وەڕتا ٤٧٢هـ حوکمڕانی کردووە. لەگەڵ میرسعیدی برایا سەردەمێك بەناخۆشی ڕاییبواردووە. بەلام لەدوایید

میرسەعیدی کرد بـە حـاکمی دیاربـەکرو ڕێککـەوتن. لـەکاتی حوکمـی ئـەما لـە ٤٥٧هــ ١٠٦٤دا حەڕران‌و سومیداء زەوتکراوە. لەقەبی (نظام الدولە)ی هەبووە.

**منصور شاە کوڕی میر سەعید:**

لەدوای مامی و باوکی شازادە منصور بوومتـە شـای مەملەکـەتی مـەروانی. شۆرەت وایە خوتبەی بەناوی خۆی وخەلیفەی فاطیمی میسرەوە خوێندوومتـەوە. لەبەرئـەوە خەلیفەی عەبباسـی لـێی دوودڵ بـووە. لەبـەر ئەوەشــە (ملکشـاە)ی سـەلجووقی کـە پشـتیوانی تـەختی عەبباسـی بـوو لـێی ڕەنجـاوە. واڕێکـەوت (فخـر الدولـە ی کـوڕی جوهێر) کە کۆنە وەزیری مەلیك ناسربوو لە خانەدانی مەروانییەکان تۆرا بوو. ئـەم سپڵەی مەنفەعـەت پەرستە بـە تـەمای دەســتکەوتنی حوکـم فریـوی مــەلیك شـای سەلجووقی خواردو سوپایەکی زۆری لێسەند هاتە سەر خاکی مەروانییـەکان. لـەدوای گەلێك شـەڕو خوێنڕشـتن کیشـوەرەکەی داگـیرکرد. شـارانی (دیاربــەکر - ئامــەد) و (میافارقین)ی جیاجیا پێچاو زەوتیکرد. منصور شاە خۆی گەیاندووەتە جەزیرە لەوێ جێگیربوو. چەند قەڵایەکی ئەو ناوەو ناوچەی (بۆتان) کۆمـەکیان کـرد، بـەڵام کـوڕی جوهێری ناچیزە، بۆئەوەی حوکم بەدەست خۆیەوە بمێنێت نەیویست نـاوو نیشانی حکومەتی مەروانی نەهێڵـێ. بۆیـە وازی لـە ئـاخری حوکمـداری کۆنـە وەڵی نیعمـەتی نەهێنا لەشکری کردە سەر. جەزیرەیان پێچا، لـە ڕێگایـەکی پەنهانـەوە شـەو لـەناکاو چوونە قەڵاکەوە داگیریانکردو منصور شای بەدبەختیان بەدیلگرت. بەمـە حکومـەتی مەروانی کە لکی دووەمـی دەوڵەتی دۆسـتەکی کـورد بـوو لـەناوچوو. ئـەوەندە هەیـە زۆری نەخایاند کوڕە ناجسنەکەی جوهێریش بە پاداشتی خەیانـەتی خـۆی گەیشت، (ئاتق) ناو سەرداری لەشـکری مەلیکشاە حوکمی لەدەسـت سـەندو دەریکـردە موسڵ. لەوێ بەفەقیری‌و پەرێشانی مرد ٤٧٨هــ ١٠٨٥م.

**٣- حکومەتی بەرزیکانی:**

ئـەم حکومەتـە کـوردە لـە ٣٣٠هــ ٩٤١م دا لەلایـەن میرحوسـەین ئـاو ســەرداری عەشیرەتی (بەرزیکانی)یەوە لە شارەزوور بناغـەی دانـراوە. تـاکو ٣٥٠هیجری خـۆی و براکـانی لـە (هەمـەدان)و (نـەهاوەند)ەوە تـا سنووری ئازەربایجان هەموو مەڵبـەندی

کوردستانی ئێرانیان خستووەتە ژێرچنگی خۆیانەوە. ئەم توڕرە گەورەیە لە دواییا بە میراتیی بۆ حوسنەوی کوڕی میر حوسەین بەجێماوە، لەکاتی حوکمی میرحوسەیندا حکومەت شکڵی ڕەسمی وەرنەگرتبوو. کە حوسنەوی بووەتە حوکمدار ئەوسا وێنەی سەربەخۆیی ئەم حکومەتی کوردە بە تەواوی دیاریداوە. حوسنەوی: شایەکی سیاسی زۆرزان بووە، نەیویستووە لە سەرەتای پەیدا بووندا دەوڵەتەکەی تووشی هەراو شەڕی قورس بکا. لەبەرئەوە لەگەڵ حوکمدارەکانی (بۆیەهی) دا تێکەڵیی پەیداکردووە، لەمکاتەدا خانەدانی حوکمداری (ڕوادی)ی کورد لە ئازەربایجان لەناوخۆیانا شەرو شۆڕیان ئەکرد کە مەسڵەحەتی هەردوولایان پێویستی وەها بوو کە یەکبگرن و بەرامبەر بۆیەهییەکان بوەستن. کەچی وادیارە حوسنەوی بەتەمای ئەوە نەبووە بۆیە هەوەڵ دۆستی (ركن الدوله) مەلیکی بۆیەهی لە(ڕەی )لە پاشا لەگەڵ (معز الدولة)ی برای (ركن الدولة) شا پەیوەندی ئاشتیی بەستووە. لەسەر ئەوەش (شا)ی بەرزیکانی لە دڵا ویستوویەتی سنووری حکومەتەکەی گەورە بکات. لەبەرئەوە بەسەر هەڵەوە ئەرۆیشتووە. کە تەماشای کرد بۆیەهییەکان بوون بەناحەزی یەك چووە بەگژ بەختیاری کوڕی (معز الدوله) لە ٣٥٦هـ داو ناوچەی هەولێری لێسەندووە. زێی گەورە بووەتە سنوور لە بەینیانا. ئەمجا لەگەڵ بەختیار ئاشتبووەتەوەو لە شەڕی (تغلبی حمدانی)دا یارمەتی بەختیاریداوە. بەڵام لەسەرئەمانە (ركن الدولة)ی لێ زویربووە. ئاخرییەکی چون بەگژیەکاو لەشکری دەیلەمی هاتوەتە سەر میر حوسنەوی. ئەمجا سوپای بەرزیکانی ڕوویکردووەتە ئەم لەشکرە و چواردەوری گرتووەو وازیان لێنەهێناون تاکو خۆیان چەکیان تەسلیمی سوپای بەرزیکانی بوون لەسەر ئەمەشا حوسنەوی لای ئاشتی گرتووەو لەگەڵ ركن الدوله شا ڕێککەوتووەتەوە لەم بەینەدا (عضد الدوله)و (بەختیار)ی بۆیەهی کە ئامۆزای یەکتری بوون، بەر سەندنی تەخت و تاج تێکهەڵچوون لە ٣٦٣هـ - ٩٧٣مدا. حوسنەوی سڵی لە عضد الدوله ئەکرد. لەبەرئەوە یارمەتی بەختیاریدا. هەرچەندە بەشەڕەکەیانا نەگەیشت دیسان بە کوڕەکانیا قۆڵە سوپایەکی بچووکی بە یارمەتی بۆ بەختیار نارد، کەچی لەوەدوا دەرکەوت کە بەختیار ناتوانێت ڕوو بەڕووی عضد الدولة هەڵوەستێت لەبەرئەوە (بەختیار) وازی لە دەعوای خۆی هێنا لەسەر ئەوە لەشکری بەرزیکانییش بەرەو وڵاتی خۆی گەڕاوەتەوە. لەدوای ئەم ڕووداوە حوسنەوی پادشایەکی بە نیدارەو دوور ئەندێش بووە. ڕەوشتێکی بەرزی هەبووە، بەشێکی گەورەی کوردستانی لا

ژێرحوكمدا بووه. زابی گەوره سنووری باكوری دەوڵەتەكەی بوو، شاری (سەرماج) پایتەختی بووه. دەوری حوكمڕانی ئەم خانەدانەدا ئەم شاره پەیدا بووه. دینەوەر، هەمەدان، نەهاوەند، هەولێر شارانی ناوداری ئەم دەوڵەته بوون.

## ناصر الدوله امیر بدر:

له دوای باوكی شازاده بدر بوومته حوكمداری بەرزیكانی. هەر ئەوساڵه له ڕۆژاوای هەولێردا ئەم پادشایه چەند قەڵایەكی زەوتكردووه. بۆیەهییەكان لە دەستەڵات زیادیی دەوڵەتی بەرزیكانی زۆر ئەسڵەمێنەوه. له هەموویان زیاتر عضد الدولة ویستی ئەم دەوڵـەتی كورده لەناوبەرێ. بۆیـه جارێ كەوتوومتـه تـەدبیری ڕێككـەوتن و یەكگرتن لەناوخۆیانا. كەچی بەرامبەر ئەم تەهلوكەیـه بـۆ بەدبـەختیی، كوڕانـی حوسـنەوی بـوون بەناحـەزی یـەكتری. ئەمانـه حـەوت بـرا بـوون، نەیانئـەزانی ناكۆكییەكـەیان خۆشـیان و حكومەتەكەشـیان لەناوئـەبات. جـا عضـد الدولـه ئـەم ناكۆكیـەی بەهەل دانـا. لەشـكرێكی گەورەی نـارده سەریان. ئـەم سوپایه هەمـەدانی گرت. بەشێك له لەشكری بەرزیكانی جیابووەوه تێكەڵ سوپای عضد الدوله بووه. ئـەو حەله بەناسانی نەهاوەندو (سەرماج) یشیان داگیركرد. بەرەكەتدا ئەمیر بەدر خودی خۆی دۆستی عضد الدولة بووه عضد الدوله ئەیویست حكومـەتی بـەرزیكانی بەدەست ئـەمیر بـەدرەوه بێت. لەبەرئـەوه دوای ڕووداوەكانی لای سەروو بـه ئـەمرێكی عضـد الدوله ئەمیر بەدر كرایەوه به سەرداری بەرزیكانی و خەڵاتیشی كرد. ئـەمجا ئەوانـەی هاو فكری (بەدر) نەبوون له كوڕانی حوسنەوی و ئەو سەردارانه كه به دیل گیرابوون لەوه پێش هەموو كوژران. بەم تەرحه حكومەتی بـەرزیكانی بـەجارێك سـەربەخۆیی ئەما كەوته ژێر حوكمی بێگانه له ڕووی ئاژاوەی ناوخۆیانەوه.

میر بەدر تا عضد الدوله ژیاوه هیچ سەرپێچیی نـەكردووه، وه لـه شـەڕو داوادا بـه كۆمەكییەوه چووەو خەرجییشی بۆ ناردووه. بەڵام كه عضد الدوله مرد ئەمجا بوو به ژێردەستی فخر الدولەی برای عضد الدوله. چونكه ئەیویست ئیدارەی دەوڵەتـەكەی بگێڕێـتەوه دەستخۆی لەسـەر ئەمـه شرف الدولـەی كـوڕی عضـد الدولـه لەشـكرێكی

قورسی ناردوومته سەر لەشكری كورد بەسەرداری ئەمیر بەدر لای (قرەمسین - كرماشان) لەگەڵ دوژمنا كەوتووەتە شەڕ. بەدر بە فێڵێكی مەردانە لە كاتی حەسانەوەدا هەڵمەتی بردوومته سەر لەشكری شرف الدولە زۆر خراپ شكاندوویەتی لە ٣٧٧هـ ٩٧٨م دا. ئەم سەركەوتنە بوومته هۆی ژیانەوەی شەوكەت و شانی حكومەتی بەرزیكانی. میر بەدر لەمەولا دەستیكردووە بە داگیركردنی وڵاتەكانی كوردستان. ئەم ئەمیرە عاقڵە لە شەڕو هەرای سەردارەكانی بۆیەهی، زانیبووی كە ئەبێت لەم هەڵمەد بێبەش نەبێت. لەبەرئەوە لە هەموولایەكەو دەستیكردووە بە داگیركردنی سەرزەمینەكانی چواردەوری خۆی. لە باشورەوە سنووری حكومەتەكەی گەیاندە سەر ڕووباری (گەرخا)و شاری (خوڕڕەم ئاباد)ی گرت. هەموو وڵاتی كرماشان و شارەزووری هێنایەوە ژێر چنگی خۆی. ئەمیرەكانی بۆیەهی خوا خوایان بوو ئەمیر بەدر دۆستیان بێت. خەلیفەی عەبباسی لە ٣٨٠هـ ٩٩٠م دا عینوانی (ناصر الدولە و الدین)ی داوە پێی. بەڕاستی ئەمیر بەدر حوكمدارێكی زرنگو تێگەیشتوو بوو وەنەبێ هەر لەمەیدانی شەڕا بەكردو بزان بووبێت، بەڵكو لە بەجێهێنانی عەدالەت و خێرخواهی بۆ خەڵكو ئاوەدانكردنەوەی مەملەكەت و پێشخستنی ماڵی مسكێنیشەوە شۆرەتی بە هەموو لایەكا ڕۆیشتووە. مێژونووسەكان هەموویان مەدح و ثەنای ئەكەن ناصر الدولە بەدرشاە تاساڵی ٤٠٠هـ ١٠٠٩م بێ هەراو پشێوی، بەسەربەخۆییەكی تەواو حوكمڕانی كردوومو ئەمەش بوومتە هۆی خێرو بەرەكەت بۆ وڵات و خەڵك بەم هۆیەوە میلەتی بەرزیكانی بە تەواوی بە خۆیا هاتووە. بەڵام داخی گرانە ئەم خۆشییە لەم كاتە بەدواوە گۆڕاوە. (هیلال)ی كوڕی بەدر بەگژ باوكیا چووەو ئاژاوەی خستووەتە وڵاتەكەوە. بەدر شاە دوو كوڕی بووە (عیسی)و (هیلال) یان ناوبووە باوكیان عیسای خۆشتر ویستووە بۆیە هیلالی كرد بە حاكمی (سامغان)و لەخۆی دوورخستەوە. بەڵام هیلال لەوێ لەگەڵ حاكمی شارەزووردا تێكچووە. هەرچەند باوكی هەڕەشەی لێكرد كاری نەكردووە. ئاخری كار ئەمیر هیلال بە لەشكرەوە چووەتە سەر شارەزوورو داگیریكردووە. باوكی ئەم هەڵمەتەی بە یاخیگەریی دانا لەگەڵ هیلالدا كەوتە خراپە ئەو حەلە هیلالیش بە دزییەوە دەستیكرد بە تەفرەدان

و هاندانی ماقوولآنی بۆئەوەی باوکی نەناسن و بە پارەی زۆر ئاخرییەکەی تەفرەیداون. بەمە زۆرکەس لە باوکی تەکیوەتەوە. وایلێهات لەشکریان بەرامبەر یەك وەستان لە قاپیی دینەوەردا. تەنانەت گەلێك سەرکردە لەگەڵ تاقمەکەیا لەکاتی شەڕا چووەتە لای هیلال. ئەمجا سوپای هیلال هەڵمەتی بردووە، باوکیشی و لەشکرەکەشی پێچاوەو هەموویانی بەدیلگرتووە. بەڵام هیلال دەربارەی ئەم دیلە شەریفانە وەکو باوکی بێ دڵیی نەکردووە بەڵکو پیاوەتی نواند لەگەڵیان. لەسەرئەوە ئەمیربەدر چارەی نەما. حکومەتی بۆ هیلال تەرك و خۆی کەنارگیر کرد. تومەز میربەدر بەدڵێکی باش ئەمەی نەکردبوو، بەڵکو چاوەڕوانی هەل بوو کە تۆڵە بکاتەوە لە هیلال، بۆیە لە ژێرەوە کەوتە تەفرەدان و وەرگێڕانی سەرکردەکان تاکو ئاژاوەی خستە ناوچەکانەوە بەدر ئەوەندە قینی هەڵسابوو (بهاء الدولە)ی دەیلەمی مەلیکی عێراقیشی هاندا کە بێت ولآتەکە زەوت بکا. بەم تەرحە بێمروەتییە بێگانەشی هێنایە سەر نیشتمانەکەی کەیان دەوڵەتەکەی دا بەدەستیەوە. بەمجۆرە لەشکری بێگانە هاتە سەر ولآتەکەو شەڕ هەلگیرسا. لە ئەنجامی ئەم ڕووداوەدا واقعا میر هیلال بە دیلگیراو خرایە بەندیخانەی بهاء الدولە. بەڵام باوکیشی هەموو گەنج و جەواهێری دەوڵەتەکەی لە کیسچوو شارەزووریشی لێسەندرا. جا میربەدر بەم چەشنە بووەتەوە بەسەرداری حکومەتی بەرزیکانی ڕەق و تەق. ناصر الدولە امیر بدر: تازە ئەبویست حکومەتە بەدبەختەکەی زیندوو بکاتەوەو بیژێنێتەوە. جا لە ٤٠٥هـ دا چووەتە سەر میرحوسەین کوڕی مەسعوود ناو سەرۆکی کورد لە قەڵای (کۆسجد). بەدرشاە ئەم قەڵایەی پێچاوە ئەو دەمەش زستان بووە لەبەر سەرماو سۆڵە لەشکرەکەی لێی یاخیبوون. لەوانە چەند سەربازێك هەڵمەتیان بردە سەر میر بەدرو کوشتیان.

## ڕەوشت و ئیدارەی میر بەدر

ئەم حوکمداری کوردە ٣٠ ساڵێك پتر بەسەربەخۆیی کیشوەری بەرزیکانی ئیدارەکردووە. بە ئاشکرا پیشەو خولق و ڕەوشتی باشی بووە. زۆرخێرەومەند بووە. هەموو ساڵێك کۆمەڵێك پارەی لەڕێی حەجدا خەرجکردووە. بۆ ئیدارەی دەولە

ەموو ساڵێك بە ئەمری ئەو میزانیە کراوە. واریدات و مەسرەفی حکومەتەکەی
ەسەر تەرتیبێکی ڕێکو پێك و عادلانە ڕێکخستووە. تا لەگەڵ هیلالی کوڕیا
ێکنەچووبوو، مەملەکەتەکەی زۆرجوان بەڕێوەبردووە. لە سیاسەتی ماڵو ئابووی و
یداری وڵاتەکە مەلیکێکی دانابووە. لەبەرئەوە خوارو ژووری وڵات ئاواو خەڵك
ەساوەو تێرو تەسەل بووە. تاخەزێنەکەی بە تاڵان نەچووبوو هەمیشە (یەغدانی
.موڵەت) پڕ لە زێڕوزیو بووە، بەتایبەتی لە نوموووری کشتوکاڵی وڵاتەکانی
ەپرسییەوە. بۆ پێشخستنی کشتوکاڵ و سەربەستیی جوتیار هەوڵی نەدا. ئەوی
ەمتەرخەمی ئەکرد سزا ئەدرا. سەردارێکی ئازاو ڕەزم ئارا بووەو لە شەڕا بەتارەك و
ە تەرتیب بووە. ئەوەندە هەیە لە ڕووداوەکەی هیلالی کوڕیا هەموو ئەم شتە
اشانەی بەبا داوە. هەر بۆ خاتری تۆڵە لەو کوڕە ئازایەی بکاتەوە هۆشی سیاسەت و
یری دەوڵەتپارێزیی لە سەرا نەماوە! لەبەرئەوە لە دوای خۆی شەوکەت و ناوبانگی
حکومەتی بەرزیکانی ڕوویکردووەتە نشوستییەکی ئەوتۆ لەکاتی مردنیا ئەم
حکومەتە سامدارە لە فەلاقەت کەوتووە، ببووە ئەمارەتێکی ناڕەحەت و پڕئاژاوە.

**هەواڵی دوایی**

لەدوای کوشتنی (ناصر الدولە امیر بدر) ئاژاوە کەوتە کیشوەری بەرزیکانییەوە.
عەشیرەتەکانی تەرەبوون و خۆیان خستووەتە پەنای ئومەرای دەیلەمییەکانەوە.
هەرچەندە (طاهر) کوڕی میر هیلال کەوتووەتە داوا گەری تەخت و تاج و چووە بەگژ
(شمس الدولە)ی بۆیەهیدا. بەڵام لەشەڕا شکاو بەدیلگراو خرایە بەندیخانەی
هەمەدانەوەو بەمە بەشی زۆری خاکی بەرزیکانی کەوتووەتە دەست شمس الدولە وە،
ئەگەرچی لەسەر ئەمە (سلطان الدولە) کوڕی بهاء الدولەی مەلیکی بۆیەهی عێراق لە
قینی شمس الدولە میر هیلال لە بەندیخانە بەردا کە بچێت سەرزەمینەکانی
بەرزیکانی داگیربکاتەوە. بەڵام ئەو بیرە کەڵکی نەمابوو، چونکە لە شەڕا هیلال
کوژراو لەشکرەکەی پەرش و بڵاوبووەتەوە (٤٠٥هـ). لەدوای ئەمانە (شمس الدولە) بەو
مەرجە لە پاشانا سەرکێشیی تیا نەکرێت هات میرطاهیری کوڕی هیلالی لە بەند
بەرداو ناردیەوە سەر وڵاتی بەرزیکانی. ئەم سەردارە لە دوای ئەم ڕزگارییە

خەریکبوو شتێکی تازە پێکەوە بنێت، بۆ ئەم مەبەستە چووە بە گژ (ابو شوق) ناو سەرۆکی عەشرەتی (عناز)ی کوردا، کەوا لە ناوچەی شارەزووردا ئەمارەتێکی کوردی پێکەوە نابوو. (میر طاهر) نەبوو شەوقی لە شەڕا شکاندو ئەو مەڵبەندەی داگیرکردووەو لە پاشا بوو بەزاوای ئەبوو شەوق و لە گەڵیا ئاشتبوومەتەوە. کەچی لە دوای ئەم ئاشتییە ئەبوو شەوق میر طاهیری کوشتووە. جا بەم ڕووداوە خانەدانی حوسنەوی دوایی هاتووەو سەرزەمینەکانی بەرزیکانی دابەشکراو بەشێکی لەگەڵ شارەزووردا بەئەمارەتی (عەناز)ی کورد براوە ئەگەرچی ئەمیر دەیسم کوڕی (ابو الغنائم) ناو برازای حوسنەوی کەدوا پیاوی خانەدانەکە بوو لەناوچەی زەهاودا خەریکبوو لە قەڵای (کاسان)دا خۆی بگرێت، بەڵام هیچی پێنەکراوە. ئەویش لەناوچووە لە ٤٠٦ هـ دا[١٢].

### ٤- حکومەتی ئەیوبی:

بنیاتی ئەم حکومەتە نەتەوەی (کورد) لە کیشوەری میسر دایناوە. لە دواییدا وڵاتانی (یەمەن)و (سوریە)و (فەلەستین)و بەشی باشوری خۆرهەڵات لە کوردستانی ئەنادۆڵیشی خراوەتە سەرو بووەتە یەکەمین دەوڵەتی گەورەی ئەوکاتە. مایەو جەوهەری دەوڵەتەکە ئیسلامەتی و پشتیوانیش کوردو عەرەب بووە. کە فەرتەنەی ئەهلی صەلیب لە ئەوروپا ڕوویدا ئەمانە وەك هار ڕوویانکردووەتە خۆرهەڵات، سوریەو فەلەستینیان پلیشاندەوە. وا ڕێکەوت لەو کاتەدا کوردەکان ئەم حکومەتەیان پێکەوە نا. لە ئیسلامەکانا کوردەکان بەرامبەر ئەم دوژمنە دڕندەیە وەستاون کەوتنە بزووتن. سەردارو ماقووڵانی کورد داوێنی مەردایەتییان کردووە بەلاداو ئیسلامەتییان زیندووکردووەتەوە، ئەگینا لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە هەر ئەوکاتە کەیانی ئیسلامییەت لەناو ئەبرا. چونکە (ئەهلی صەلیب) کوتوپڕ کە دەستیان وەشاند خەلیفەی ئیسلامی (قاهیرە)ش و عەبباسی بەغداش کە پشت و پەنای

---

[١٢] تەماشای بەرگی دووەمی مێژووی کوردو کوردستانی امین زکی بکرێت.

ئیسلامیەت بوون دەستەوستان دانیشتبوون، هیچ ڕێدوویەبییەکیان نەبواند. بەبدو هەر ئەتابوکی زەنگیی موسڵ و کوردەکان بەرامبەر ئەم دەستدرێژییە خۆیاز نەگرتووەو بازووی مەردانەیان لێهەڵماڵیوەو پرِیان داوەتە صەلیبییەکان تەفرو توونایان کردوون و نەیانهێشتوون جێگیر ببن. جا ئەو سەردارە بێ هاوتایە کە بەرنگاری ئەم ڕووداوە بووە، سوڵتان (سەلاحەدینی ئەیوبی)ی کوردە، کە بناغەی دەوڵەتی ئەیووبیی داناوەو لە مێژووی میللەتانی خۆرهەڵات و خۆراوادا بە بزورگیی ناوی نوسراوە.

## سەرگوزەشتەی پەیدابوونی ئەم دەوڵەتە

باپیرەی سەلاحەدین (شادی) کوڕی (مروان)ی ناوە. یەکێك بووە لە ماقووڵانی خێڵی ڕوادی کە لکێکی گەورەی ئێلی (هازبەنی) یە لە ناوچەی هەولێردا دانیشتووی شاری (دوێن) بووە. وا دیارە پیاوماقووڵی ئەوناوە خەیاڵی گەورەییان لەسەرا هەبووە، چونکە ناوبانگی حکومەتی (شەددادی)ی کورد کە لەو ناوەدا پەیدابیوو هێشتا لەبیرنەچووبووەوە. وازانراوە کە (شادی) لە بنەڕەتا خەڵکی گوندی (ئەجدانکان) بووە، لە دواییدا لەگەڵ (ایوب)و (شێرکۆ)ی کوڕانیا هاتوونەتە شاری (دوێن)، لەوێ بوومتە دۆستی (بهروز)ی ڕۆمی ناو پیاوماقووڵێکی سەلجووقییان. لە دواییدا ئەم کابرایە چووەتە بەغدا لەوێ دەستەڵاتی پەیداکردووە، ئەوسا (شادی)ی بانگکردووەتە لای خۆی و کردوویە بەسەرکارو ناردوویەتە (تەکریت) کە بۆی ئیدارە بکات. لە دوای بەینێك شادی لەوێ مردووە، ئەمجا (نجم الدین ایوب)ی کوڕی دانراوە لە جێی. لەو بەینەدا (عماد الدین زنگی) ئەتابەگی موسڵ چووە بەگژ پادشای سەلجووقیداو (نجم الدین ایوب) کە میوانداری عماد الدینی کردووە حکومەتی بەغدای لێ زوێر بووە لەسەرئەمە بە خاووخێزانەوە تکریتیان بەجێهێشتووەو چوونەتە موسڵ. ئەڵێن (سەلاحەدین) لەمکاتەدا لەدایکبووە (٥٣٢هـ - ١١٣٧م). عماد الدین بەرامبەر ئەم دوو برایە وێڵیی نواندوە لەلای خۆی دایمەزراندوون و فەرمانی گەورەی پێسپاردوون. جە (جەنگی صەلیب) کاتێك لەمەوپێش هەڵگیرساوە لە ١٠٩٥ م دا، هێرشی لەشکری ئەورووپیی مەسیحی بەناو خوێن و وێرانەدا خۆی گەیاندبووە خۆرهەڵات. سوریەو

فەلەستینی عەرەبی داگیرکردووە. لەوێ لەسەر لاشەی موسوڵمانەکان چەند حکومەتێکی بچووکیان پێکەوەناوە. ملوك و ئومەرای عەرەب نەهێزیان تیا بوو نەزیندوویەتی. لەناو ئیسلاما کوردەکان و عەرەبی موسڵ کەوتبوونە تەقەلای تۆڵەکردنەوە لە ئەهلی صەلیب و دەرکردنیان لە وڵاتی ئیسلام. عما الدینی زەنگی ئەتابەگی موسڵ کە (لە لە)ی شاهزادەکانی سەلجووق و بەرەگەز تورك بوو لە باکوری عێراقا حکومەتێکی بەهێزی پێکەوەنابوو، بووە سەرداری ئەم بیرە بەرێزە یەعنی صەلیبییەکان بخرێنە بەحرەوە. جا ئەم شاسواری بەنرخە بەپێو شوێنی ئەم خەیاڵەدا بە لەشکری کوردو عەرەبەوە ڕوویکردوەتە سوریە، شاری بەعلەبەکی داگیرکردووە. نجم الدین ایوبی کردووە بە حاکمی ئەوێ (٥٣٤هـ). بەڵام کە عمادالدین مرد پشێوی کەوتە ناو کوڕەکانیانەوە، ئەوسا (دیمەشق) ییەکان ویستیان بەعلەبەك بسێننەوە، لەسەرئەمە نجم الدین ایوب بەسەلیقەی سیاسیی خۆی لەگەڵ دیمەشقییەکان ڕێکەوت و چووە شام، لەوێ بووەتە سەرکردەی سوپاکەیان. شێرکۆی براشی کە لە موسڵدا مابووەوە بە سایەی زرنگیی و زیرەکیی خۆیەوە لەوێ بووەتە سەرداری سوپای سوڵتان (نورالدین)ی کوڕی عماد الدین کە ببووە جێنشینی باوکی. جا ئەم سوڵتان نورالدینە لە باوکیەوە بیری بەگژ ئەهلی صەلیباچوونی بە میرات بۆ بەجێمابوو. لە شەڕی دووەمی ئەهلی صەلیبدا نجم الدین ایوب زۆر بە مەردی شاری شامی لە هەڵمەتی لەشکری صەلیب پاراستووە، ئەم سەرداره ماقووڵە ئەیزانی تا شام و موسڵ یەکنەگرن هێزێکی وەها پەیدا نابێت بتوانێت بەرامبەری لەشکری صەلیب بوەستێت. لەبەرئەوە لەگەڵ سوڵتان نورالدیندا بیریان یەکیگرتەوە. توڕەی شام خراوەتە سەر حیمایەی نورالدینەوە. نجم الدین خۆیشی بووە بە حاکمی دیمەشق و (شێرکۆ)ی برایشی بووەتە سەرداری سوپای ئەوێ.

## پێگەیشتنی میر سەلاحەدین

سەلاحەدین بە منداڵیی لە خزمەت باوکیا گەورە بووە. تەمەنی هەرزەکاری لە بەعلەبەك و لە شام بەخوێندن و سواریگەریی ڕابواردووە. باوکی مامۆستای تایبەتی لە زانایانی وەخت بۆ ڕاگرتووە، قورئان، صەرف ونەحو، عیلمی حەدیث، مێژوو و وێژەو ئینشای پێفێرکراوە. زانینی فەقێیەتیشی خوێندووە. هەرمتی جەهێڵێتی لە

شاما ڕابواردووه. زیرەکیی و زرنگیی و پرسی بیرو هۆشی سەر [illegible]
سەلاحەدین ئەچووه بارەگای سولتان نورالدین، ناوبانگی زیرەکیی و ئەدەب و دینداریتیی بلاو بووبووەوه. جوانیکی هۆشیاربووه. زۆرجار سولتان نورالدین یاری (گۆیین)ی لەگەڵا ئەکرد. لە خزمەتی باوك و مامیا زۆرجار چووەتە جەنگ و شەڕ سوارچاکیکی ئازاو لە بیری لەشکرگێڕییدا سەر ئەفراز بووه سولتان نورالدین حەیرانی زیرەکیی و بیرجوانیی ئەم قارەمانە بوو. لەمکاتەدا حکومەتی فاطیمی میسر ئیجگار کز ببوو. دوو بەرەکیی و ناکۆکیی پیاوماقوولانی حکومەتەکەی خستبووه گێژی لە ناوچوون. سولتان نورالدین ئاگاداری ئەم کارەساتانە بوو. نجم الدین ایوب وەزیری نورالدین، اسدالدین شێرکۆش سەرداری سوپاکەی بوو. ئەمانە لە نورالدینیان گەیاندبوو ئەگەر میسر بکەوێتە ژێر دەستەلاتیان و حکومەتیکی بەهێزی تیا دانێ ئەوسا ئەتوانن حکومەتەکانی ئەهلی صەلیبی سوریە بپێچن و لەناویانبەرن. جا کە(شاور) وەزیری خەلیفەی میسر داوای کۆمەکی لە سولتان نورالدین کرد، زانییان ئەو هەلەی کە ئەیانویست بۆیان هەڵکەوت. نورالدین خێر شێرکۆی بە لەشکرەوه نارد بۆ میسر لە (٥٦٠هـ ١١٦٤م) دا. ئەمیر (سەلاحەدین)یش بەسەرکردەیی قۆڵە سوپایەك لەم لەشکرەدا لە خزمەت مامیا بووه، چونکە مامی لە تێبینیی و تەدبیرو ڕای برازاکەی زۆر ئەمین بوو. تومەز (شاور) ئەم کۆمەکەی بۆ ئەوه ئەویست کە (ضەرغام)ی ناحەزی لەناوبەرێت. جا شێرکۆ گەیشتە میسر، لە شەڕا ضەرغام کوژراو لەشکرەکەی شکاو قاهیرە زەوتکرا. لەدوای ئەمانە ئینجا شاور بۆ لەناو بردنی (شێرکۆ) کەوتووەتە تەقەلاو موئامەرەکردن. ئەمیر (سەلاحەدین لەسەر فەرموودەی مامی هەندێك شاری میسری گرت. لەسەر ئەمە بەرەزامەندی هەردوولا وەها ڕێککەوتوون کە هیچ کامێکیان سوپا ئەنێرن بۆ سەر میسر. لەسە ئەم بڕیارە لەشکری شێرکۆ میسری بەجێهێشت و گەڕایەوه شام. کەچی شاوری فێڵباز لە ژێرەوه لەگەڵ قەڕاڵی قودسدا ڕێککەوت کە بە دزییەوه سوپایەکی بچووك بنێرێت بۆ میسر . ئەم سایەبانێتی (حمایە)ی سوپای صەلیبە لەسەر میسر بۆ حکومەتی شام زۆر خراپ بوو. لەبەرئەوه سولتان نورالدین لەگەڵ شێرکۆ بڕیاریاندا کە میسر بگرن و ڕەزامەندی خەلیفەی عەبباسی بەغداشیان جێبەجێکرد. ئەوسا شێرکۆ سەلاحەدین بە لەشکری تازەوه چوونە سەر میسر. لەگەڵ سوپای صەلیبی قەڕاڵ قودسدا کەوتنە موبارەزەی جەنگ. لەسایەی ئیدارەو تەدبیرە جوانەکانی سەلاحەدین و ئازاییەکانییەوه لەشکری صەلیب زۆرخراپ شکا. لەدوای ئەم سەرکەوتنە لەشکر شێرکۆ ئەمجارە (ئەسکەندەرییە)شی داگیرکرد. شێرکۆ، سەلاحەدینی کرد بـ

فەرمانڕەوای ئەم قەڵا گەورەیە. ئەمە سفتاحی حوکمڕانی سەلاحەدین بوو. لەشکری قودس بەیارمەتی شاور هێزی تازەی بۆ هات، ئەمجا چوونە سەر ئەسکەندەرییەو پێچاپانەوەو لە دەریاشەوە ئەستۆلیان بۆ هات. ئەمجا جەنگ قورس بوو. لەم شەڕانەدا ئەمیر سەلاحەدین قارەمانێتی نواندو ئەسکەندەرییەی پاراست. نازایی و هۆشیارییەکی بێهاوتای نواند. شێرکۆ بە جیا تاویداوەتە سەر قاهیرە. بەمانە ترس کەوتە دڵی دوژمنەوە، لە تاوانا داوای رێککەوتنیان کرد. ئەنجامی کار هەردوولا بە ئاشتیی لە میسر چوونە دەرەوە. کەچی ئەم ئاشتییەش درۆزنانە بوو. قەڕاڵی قودس لەگەڵ لەشکرا هاتەوە سەر میسرو شاری بەلبیسی گرت، کوشتارێکی زۆری لە خەلکی شارەکە کرد. ئەمجا خەلیفەی فاطیمی پرچی ئافرەتی خۆی بەهاوار نامەیەکەوە نارد بۆ سوڵتان نورالدین، تکای یارمەتی لێکردووە. لەسەرئەمە سێیەم جار لەشکری نورالدین بە سەرداری شێرکۆو سەلاحەدین هاتووەتە میسر. بڕیاری ئەمجارەیان بەتەواوی زەوتکردنی میسر بوو. قەڕاڵی قودس (ئەملەریك) کە ئەم هەڵمەتە کوتوپڕەی دی و زانی کە میسرییەکانیش دۆست و سوێندخواریانن، نەیتوانی بوەستێت بە سوپاکەیەوە گەڕایەوە قودس (١١٦٩م ٥٦٤هـ).

ئەوسا میسرییەکان لەگەڵ خەلیفەدا هاتن بەپیر لەشکری شامەوە شاوری دوو دڵیشیان لەگەڵ بوو. کەچی لەدوای ئەمە شاور لە ژێرەوە خەریکبوو بە فێڵێکی ناپاکانە سەردارانی کورد لەناوبەرێت. هەموو کەس دڵپیسیی شاوری زانیبوو لەبەرئەوە بەفەرمانی (سەلاحەدین) لە کاتی ڕاوا گرتیان و ناردیان بۆ خەلیفەی (عاضد)، ئەویش فەرمانیدا کوشتیان. بەم تەرحە ئەم ناپاکە لەناوبرا کەلەپێناوی ڕقەبەرییدا ئەیویست میسر بدات بە فەرەنگەکان. لەدوای ئەمە خەلیفە عاضد اسدالدین شێرکۆی کرد بە وەزیرو خەڵاتی کردو ناوی نا مەلیك مەنصوور (ئەمیری سوپا)، کەچی زۆری پێنەچوو شێرکۆ ئەمری خوای کرد لە (٥٦٤هـ ١١٦٨م).

### وەزارەتی امیر سەلاحەدین

لەدوای مردنی مامی، ئەمیر سەلاحەدین لەجێی ئەو، کرا بەوەزیر، چونکە لەناو سەردارەکانا کەسی تر نەبوو ئەو شوێنە پڕبکاتەوە. خەلیفە ناوی (الملك الناصر المظفر صلاح الدین یوسف ابن ایوب). سوڵتان (نورالدین )یش کردی بە سوپا سالاری میسرو. مەلیك ناصر ئەوکاتە لە تەمەنی ٣٢ ساڵییدا بوو. لە دوای نواندنی کارامەیی سیاسی و لەشکرگێڕی گەیشتووەتە ئەم پایە بەرزە. ئینجا لە دوای ئەوە ناردی بە

**ئەماراتی ئەیوبی:**

لەناو خاکی حکومەتی ئەیوبیدا هەندێك وردە ئومەرا هەبوون هەتا بۆیان لواوە سەربەخۆ بوون. ئەمان وەك برین وابوون بەلەشی حکومەتەکەوە هەمیشە جێگای ئازار بوون و لە هێزیان خستوون. بەڕاستی ئەمانە بۆ ئەوە ناشێن کە حکومەتیان پێبلێین، بەڵکو وەها ئەگونجێت هەر بە ئەمارەتیان دانێین لەبەرئەوە وا لێرەدا زۆر بە کورتی ناویان ئەبەین.

**ئەمارەتی حەڵەب:** لە ٥٧٩ی هیجرییەوە تا ٦٥٨ی هیجری پایەدار بوو. بناغەی ئەم ئەمارەتە مەلیك **ظاهری** کوڕی سەلاحەدینی ئەیوبی دایناوە لە حەڵەب، واتە باوکی لەوێ دایناوە. ئەم ئەمارەتە لە ژوور خۆیەوە هاو سنووری دەوڵەتی سەلجووقی ڕۆم بووەو زۆر شەڕو داوایان لە بەینا پەیدابووە، وە لە ٦٣٨ی هیجری بەدواوە لە گەڵ حکومەتی ئەیوبی میسردا کەوتووتە ڕقەبەریی و دوژمنایەتی و لەمبەینەدا دوچاری هێرشی خوارەزمییان بووە کە ئەمانەش مەغۆلەکان ڕادوویان نابوون. دوایی جار (هۆلاکۆ) نێرەی داگیرکردو ئەمارەتەکەی لەناوبرد.

**ئەمارەتی شام:** ئەم ئەمارەتە هەمیشە دەستاوە دەست ئومەرای ئەیوبی کەوتووەو گەلێك شەڕو هەرای دیوە. لەدواییدا بەینێکیش چووەتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەمارەتی حەڵەب تاکو هۆلاکۆ هەردوو ئەمارەتەکەی لەناو بردووە.

**ئەمارەتی حەما:** ئەم ئەمارەتە زۆر بچووکە بەدەست برازاکانی سوڵتان سەلاحەدین، واتە کوڕانی مەلیك مظفەرەوە بووە. بە پێچەوانەی ئەوانیتر، سەردارەکانی ئەم ئەمارەتە هەمیشە ویستوویانە لە میسر لانەدەن و ئاسوودە بژین. لە دوای هۆلاکۆ بە جارێك بووەتە ژێر دەستەی حکومەتی کۆڵەمەنی میسر، ئەو سا خانەدانەکەش لەناوچووە.

**ئەمارەتی حومص:** ئەم ئەمارەتە بەدەست نەتەوەی (شێرکۆ)ی مامی سەلاحەدینەوە بووەو بەهاتنی هۆلاکۆ لە ٦٦١ی هـ لەناوچووە.

**ئەمارەتی یەمەن:** لە ٥٦٩هـ دا یەمەن دەست سوڵتان سەلاحەدین کەوتووە هەتا ٦١٩هـ بەدەست ئومەرای ئەیوبییەوە ماوە. لەوە دوا دەست خانەدانی (ڕەسوولی) کەوتووە کە تورکمان بوون. گەلێك هۆزی کورد، واتە خانەدان، بەهۆی ئیدارەی ئەیوبییەکانەوە لە یەمەندا جێگیر بووە.

**ئەمارەتی جزیرە:** وڵاتی جەزیرە سوڵتان سەلاحەدین داگیریکردووە، تاکو ٦٤٣هـ، بەدەست ئومەرای ئەیوبییەوە ماوەو بە میسرەوە بەستراوە. شاری میافارقین جێنشینی ئەمیرەکانی بووە. ئەمیش مەغۆلەکان لەناویانبردووە. بەڵام لە هەندێك

شاری جزیرەو کوردستانا وردە ئومەرای ئەیوبی تا سەدەی دەیـەمی هیجری (کۆچی) ماوە.

## خزمەتەکانی دەوڵەتی ئەیوبی

فـەرمانڕەوایی دەوڵـەتی ئـەیوبی کـە جڵەوەکـەی بەدەسـت خانـەدانێکی کـوردەوە بووەو لەسەر میراتیی خولەفای (فاطمی) و ئەتابەکەکان دامەزراوە. لەگەڵ ئەو هەموو هێرشە قورسانەی ئەهلی صەلیبیشا بـە شـەوکەتێکی تـەواوەو ٨٤ سـاڵ پایـەدار بـووە. ئەمانـە لـەو کاتـە تـەنگو چەلەمەیـەدا کـە یانیعالـەمی ئیسـلامیان پاراسـتووە. لـەو دەورەدا هـەموو حکومەتـەکانی سـەرزەمین بەدەسـت ڕژێمـی بۆگـەنی دەرەبەگییـەوە شـپرزە بـوون. هـێزی فـەرمانڕەوایی لـەناوەڕۆکی حکومـەتدا نـەمابوو. بەگـەکان دەستەڵاتی پادشاکانیان نەهێشتبوو. لەسەر ئەمانەشا توانای حکومەتی کورد ئەوەندە بەبڕشت بوو لەگەڵ ئـەو هـەموو شـەڕو هـەرای ئـەهلی صـەلیب و یـاخی گـەری نـاو خۆیەدا تـا ٦٤٨هـ ئـەم دەوڵەتـە گـەورەیی و دەسـتەڵاتی نـاو خۆیـی ڕاگرتـووە. ئەگـەر تەبیات توندی تورانشا نەبوایە کە بووەتە هۆی یاخێگەری لەشکرەکەی و بـە ئـەنجام لەناوچوونی خۆیو دەوڵەتەکەی، بێگومان ئەم حکومەتە گەلێک کاتی تریـش پایـەدار نەبوو. پادشاکانی ئـەیوبی تـەنیا بـۆ سـەرکەوتن لـە مـەیدانی شـەڕا هـەوڵیان نـەداوە، بەڵکو لە مەیدانی زانستیو ئـاوەدانیو ئابوورییشا بـۆ بەرزکردنـەوەی بارستی ژیـانی ئەهالی تەقەلای زۆریان داوە. کشتوکاڵیان پێشخستووە، جۆگای گەورەیان هەڵبەستووە، برەویـان داوە بـە فـەرمانی تەنـدروسـتی، لەگـەڵ دەوڵەتـەکانی ئـەورووپادا پـەیمانی بازرگانییـان بەسـتووە. سوپای دەوڵـەتی ئـەیوبی دووبەشـبووە، یـەکێکیان لەشـکری تایبەتی دەوڵەتەکە بوو کە لە (کۆڵەمەن)ەکان دروستکرا بوون. ئەویتر تیپە لەشـکری ئومـەرای دەرەبـەگ بـوو. لـەو دەورەدا ئـەم جۆرە چـەك هـەڵگرتن و چەشـنە سـوپای ڕێکخستنە باو بووە. لەشکری کۆڵەمەن لە تاقمە جەهێلی تـورك و چەرکـەزو میلەتـە بێگانەکانی تر کە بەپارە لەناو بازاڕ ئەکڕران دروست ئەکرا کە کۆڵەمەنی تورك وەیا بەحریـیان ناوئابوون و لە منداڵییەوە لەسەر تەربییەی عەسکەری پێئەگەیـەنران. جا ئەمانـە لـە پێشـا وەکـو لەشـکری تورکـی عەبباسـی و (بـەنی چـەری) عوسمـانی و (صقالبە)کانی ئەندەلوسی، زۆرباش و بەکەڵك بوون خزمەتی دەوڵەتەکەی خۆیانکرد، بەڵام لە دواییدا کە حکومەت کزبـوو، ئـەمانیش خولقیـان گۆڕاو بـوون بـە میقرۆبـی کوشندەی ئەوتۆ کە بونیەی حکومەتەکەیان تووشی ئەخۆشی لەناوبردن کرد. دەوری

فەرمانڕەوایی (سەڵـطەنەت)ی ئەیوبییەکان بناغەیەکی بەهێزی پێشکەوتنی بەخشیوە بە عالەمی ئیسلام. لە هەموو لایەکەوە زاناو مرۆڤی بەهونەر (فنان)ی ئەوکاتە ڕوویکردووەتە کۆشك و سەرای پادشاکانی ئەیوبی. ئەمانە قەدریان گیراوەو مووچەیان بۆ دانراوەو کردوویانن بەمامۆستای زانیاریو ئاوەدانیی کیشوەرەکە. لەلایەکی تریشەوە لە شارەکانا ئاوەدانییان خستووەتەوە، کۆشك و سەراو قەڵای گەورەیان دروستکردووە، وەستای بەهونەریان لەم فەرمانە گەورانەدا بەکارهێناوە. جۆری ئیدارەو کۆکردنەوەی باج و خەراجی حکومەتییان هێناوەتە ژێر قاعیدەوە، هەڵسانو دانیشتنی کۆشك و تەلاری پادشاکانو سەرای حوکمەتەکەیان خستوەتە ژێر ڕژێمەوە. بارەگای پادشاکانی ئەیوبی هەمیشە پڕبووە لە نومەرای ئەهلی صەلیب. ئەمانە ڕەوشتی ئیسلامەکانی ئەوکاتە فێربوون کە چوونەتەوە بۆ ئەورووپا لەوێ بڵاویانکردووەتەوە. تەنانەت وێنەی دروشمی خانەدانی ئەیوبییەکانیان وەرگرتووەو بردوویانەتەوە ئەورووپا لەگەڵ خۆیان.

## حکومەتە وردەڵەکانی کورد

تا ئێرە چوار حکومەتی ناودارمان نووسی. لە سەرەتای ئەم جزمی دووەمەدا وتمان باسی هەموو حکومەتە وردەکان و ئەمارەتە بچکۆلەکانی کورد لەم کتێبەدا نانووسین، بەڵکو هەر باسەو هەواڵی حکومەتە ناودارەکان ئەنووسین، جا وا لایخوارەوە قائیمەیەکی حکومەتە ناودارەکانی کوردمان نووسی، ئەوی لە حکومەت نەچووبێت نەماننوسیوە، وە لەناو قائیمەکەدا هەندێك حکومەتی بە ناوبانگیش هەیە هەواڵیان ئەنووسراو بەرەو دوا ئەوانیش ئەنووسین:

## قائیمەی حکومەت و ئەمارەتەکانی کورد

| حکومەت | جێگاو مەڵبەندیان | پایتەختیان | تەئریخی ژیانیان |
|---|---|---|---|
| ڕوادی | ئازەربایجان | تەورێز | لە ٢٣٢ هـ تا ٦٢٠ هـ ١٢٢٣م |
| دۆستەکی | ناوچەی | دیاربەکرو | ٣٨١هـ تا ٤٨٩هـ ١٠٩٥م |

| مەروانی | دیاربەکرو بیتلیس | میارفارقین | (دەوری مەروانی) |
| --- | --- | --- | --- |
| بەرزیکانی | کوردستانی عێراق و ئێران | سرماج | ٣٣٠هـ تا ٤٠٦هـ ١٠١٥م |
| ئەیبوبی . | میسر، سوریە، فەلەستین، یەمەن، جزیرە | قاهیرە، دیمەشق | بەڵگەکانیەوە لە ٥٦٧هـ تا ٦٨٥ هـ ١٧٨٦م |
| زەند | خواروی ئێران کوردستانی ئێران | شیراز سنە | ١١٦٠هـ تا ١٢٠١هـ ١٧٥٢م تا ١٧٩٤م ٦١٧هـ تا ١٢٨٤هـ ١٨١٧م[١٤] |

## حکومەتی وردەڵە ومیا ئەمارەت

| حکومەت | جێگەو مەڵبەندیان | پایتەختیان | تەئریخی ژیانیان |
| --- | --- | --- | --- |
| شەدادییە | ناوچەی ئەریوان | گەنجە | ٣٤٠هـ تا ٥٩٥هـ ١١٩٨م |
| لوڕی گەورە (فضاویە) | لوڕستان | ئیزاح سووس | ٥٥٠هـ تا ٨٣٧ هـ ١٤٣٢م |
| لوڕی بچووك (خورشیدی) | لوڕی بچووك | خوڕەم ئاباد | لە ٥٧٠هـ تا ١٠٠٨هـ ١٥٩٩م |
| برا خوویی | بلووچستان | کیلات | ١٢٤٥هـ تا ١٢٨٣ هـ ١٥٩٩م |
| جزیرە (ئازیزان) | جزیرەو گورگیل | جزیرە | ٦٤٥هـ ١٢٤٧م تا ٩٢١هـ ١٥١٥م |

[١٤] هەواڵی ئەم دوو حکومەتە لە مەولا نەنووسرێت.

| حکومەت | جێگەو مەڵبەندیان | پایتەختیان | تەئریخی ژیانیان |
| --- | --- | --- | --- |
| خیزان | هەرێمی خیزان | خیزان | ٦٤٥هـ - ٢٤٧ ١٥١٥م |
| شیروان | ناوچەی بتلیس | کفره | ٩٢١هـ ١٥١٥م |
| بتلیس | ڕۆژاوای وان | بتلیس | ٦٢٧هـ تا ١٠٦٦هـ ١٦٥٥م |
| ساسۆن | ناوچەی مووش | بتلیس | ٦٢٧هـ تا ١٠٦٦هـ ١٦٥٥م |
| سوێدی | چەباقچوور | گەنج | ٦٢٧هـ تا ١٠٦٦هـ ١٦٥٥م |
| پازۆك | خنس | مەلازگرد | ٦٢٧هـ ١٠٦٦هـ ١٦٥٥م |
| میردەستی | باکوری دیاربەکر | ئاگیل | ٦٢٧هـ تاکو ٩٥٠هـ ١٥٤٢م |
| چەمشکزك | ناوچەی دێرسم | چەمشکزك | ٥٩٦هـ تا ١٠٠٠هـ ١٥٩١م |
| حسن کێف | خۆر هەڵاتی دیاربەکر (لەسەر دیجلە) | حسن کێف | ٧٣٦هـ تا ٩٢١هـ ١٥١٥م |
| سلێمانی | قولپ (ناوچەی گەنج) | قوڵپ | ٧٣٦هـ تا ٩٢١هـ ١٥١٥م |
| زاراکی | ناوچەی ماردێن | ماردێن | ٧٣٦هـ تا ١٠١٦هـ ١٦٠٧م |

| حکومەت | جێگەو مەڵبەندیان | پایتەختیان | تەئریخی ژیانیان |
| --- | --- | --- | --- |
| کلیس | ناوچەی حەڵەب | گلیس | ٧٣٦هـ تا ١٠٠٥هـ ١٥٩٦م |
| حەکاری | حەکاری | باش قەلا (جولە مێرگ) | |
| دنبلی | ناوچەی خوو (سەلماس) | خووی | ٣٥٠هـ تا ٨٨٠هـ ١٤٧٥م |
| برادۆست | تەرگەوەڕ | صۆمای | ٩٠٠هـ تا ١٠١٧ هـ ١٦٠٨م |

| موكرى | موكرى | مەراغە | ٨٥٠هـ تا ١٠٥٠هـ ١٦٤٠م |
|---|---|---|---|
| بادينان | بادينان | زاخۆ | ٧٠٠هـ تا ١٢٥٩ هـ ١٨٤٣م |
| سۆران | ناوچەی هەولێر | دوێن ، حەریر، رەواندوز | ٧٠٠هـ تا ١٢٦٠هـ ١٥٠٠هـ تا ١٨٤٤م[15] |
| بابان | ولاّتی سلێمانی | قەلاّ چوالان | ٩٠٠هـ تا ١٢٦٧هـ ١٨٥٠م [16] |
| بانە | ناوچەی بانە | بانە | ٩٠٠هـ تا ١٣٣٣هـ ١٩١٥م |
| شوانكارە | فارس و كرمان | بەردەستێر، كرمان | لە ٤١٦هـ تا ٧٥٦هـ ١٣٥٥م [17] |

**٥- حكومەتی زەند ١٧٥٣هـ ١٧٩٤م:**

ئەم حكومەتی كوردە لە باشوری ئێراناو لە سەدەی( ١٨ )ی زاینیدا پەیدابووە. شەڕی دوورو درێژی عوسمانییەكان و حكومەتی سەفەوی زۆر كزكردووەو لە سەدەی (١٨) دا وایلێهاتووە لە خۆرهەلاّتیشەوە ئەفغانەكان دەستیانكردووە بە داگیركردنی كیشوەری ئێران. جا لەم كاتی پەرێشانیی و كزییەدا (نادرشاە) پەیدابووە. ئەگەرچی ئەم سەردارە ئازایە بە خوێنڕشتن و بە زۆرداریی لە ئێراندا ئیمپەراتۆریەتێكی بەهێزی پێكەوەناوە، بەلاّم چونكە دەم و دەست نادرشاە كوژراوە، ماوە نەبوو ئێران كۆبكاتەوە. لەبەرئەوە ئێران دیسان ڕوویكردووەتە كزیی. ئەوسا نوومەراكانی خاكی ئێران دووبارە دەستیانكردووەتەوە بە تەقەلای سەربەخۆیی پێكهێنانی حكومەت بەناوی خانەدانی خۆیانەوە. لەناو ئەمانەدا سەردارانی كورد لە هەموویان زیاتر بۆ ئەم مەبەستە هەوڵیانداوە. جا یەكێك لەوانە (كەریم خانی زەند) بووە. وەنەبێ

[15] هەواڵی ئەم دوو ئەمارەتە لەمەولا ئەنوسرێت.

[16] هەواڵی ئەم دوو ئەمارەتە لەمەولا ئەنوسرێت.

[17] هەرچەندە گەلێك ئەمارەتی كوردیی تریش هەن، بەلاّم چونكە شتێكی وەها نەبوون ئێمەش نەماننووسین.

کەریم خان سەردارعەشرەت بووبێت، بەڵام متمانەی بە خۆی هەبوو کە حکومەتیکی کوردیی سەربەخۆ پێکەوە بنێت، چونکە خوڵق و تەبیاتیشی جوان بوو و ئازاو مەردو دادپەروەربوو، بە هەموو لایەکا ناوبانگی ڕۆیشتبوو. جا بەم بۆنەیەوە کەریم خان لای ئەسفەهان بناغەی حکومەتێکی میللی ئێرانی داناوە. هەر لەو کاتەشا لە باکوری ئێرانا محەممەد حسن خان کوڕی فتح علی خان ناو سەردار عەشرەتی قاجاری تورکی خەریکی پێکهێنانی حکومەتێك بوو بەناوی خۆیەوە لە ١١٦٦ھ ١٧٥٢ م دا. جا کەریم خان لە عەشیرەتی زەند. ئەویش تیرەیەکە لە عێلی لەك ئێستا لە هەرێمی (پشتکێو) دا ئەژین.

## کەریم خان:

پیاوێکی بیرو خەیاڵ جوان و دڵپاك و لێبوردوو بووە لە ئیشوکارا. بە بزورگەواریی و خوڵق جوانیی هەموو کەسی منەتباری خۆی کردووە. سەردارەکان بۆ سەرکەوتن یارمەتییانداوە. پیاوێکی ئازاو تێگەیشتوویەکی وەها بووە خێرا هەموو ئەهالی ئەو ناوەی کردووە بە دەستەو دائیرەی خۆی. کەریم خان بەتەمای هەموو ئێران بوو، ئەیویست بیکا بە کیشوەرێکی یەك حکومەتیی کوردو ئاریی. بۆ خاتری بەجێهێنانی ئەم بیرە بەرزە پێویستبوو دوو دوژمنی بەهێز لەناوبەرێت لە باکوری ئێراندا، چونکە ئەمانەش هەر یەکە لەناوچەیەکدا خەریکی پێکەوەنانی حکومەت بوون بۆخۆیان. جا کەریم خان و دوو سەردارەکەی تر هەریەکە ئەیویست ئێران ساغبکاتەوە بۆ خۆی، ئەو دوو سەردارەی تر یەکێکیان (ئەسەد خانی ئەفغانی). ئەویتریان (محەممەد حسن خان)ی قاجاریی بوو. کەریم خان لە پێشا ڕووی کردوومتە ئەسەدخان لای قەزوێن بەرەنگاری بووە. بەڵام لەدوای شەڕێکی خوێنین کەریم خان خۆی شکاوە، لەبەرئەوە ئەسفەهانی بەجێهێشت و کشایەوە ناو چیاکانی شیراز لە باشوری ئێراندا، ئەمجا کوردەکانی ئەوناوە بۆ یارمەتی لیی کۆبوونەوە. بێینەوە سەر (ئەسەدخان). ئەویش بە شوێن کەریم خانا هاتومتە ئەوناوە، لەوێ لە دوو جەنگد لەشکری ئەسەدخان زۆر خراپ شکاوە. لە دوای ئەوە کەریم خان هاتوومتە شیراز وەها ڕێکەوتووە ئەسەدخان بەرامبەر محەممەد حسین خانی قاجارییش شکاوە. ئەوسـ ئەسەدخان ڕایکردوومتە بەغداد، بەڵام لەوێ کەس بە دەنگیەوە نەچووە. لەبەرئەو بەناچاریی گەڕاوەتەوە ئێران خۆی هاویشتوومتە پەنای کەریم خان. ئەوسا کەری خان دۆستانە قەبووڵیکردو تەنانەت وەك کەسی خۆی تەماشی ئەکرد. دوژمنی هەر

بەهێزی کەریم خان مابوەوە سەر محەمەدحسین خانی قاجار. سەرکەوتنی دوایی بەسترا بوو بە لەناوچوونی ئەم حسین خانەوە. ئەم هۆزی قاجاری تورکە لە کاتی تەیمووری لەنگدا لە سوریە هێنرابوونە ئێران. ئەمانە عێلێکی ئەستوور بوون یەکێك بوون لەو عەشرەتانە کە شاە ئیسماعیلی صەفەوییان هێنابووە سەر تەختی ئێران. کەریم خان لە پاش ئشوستهێنانی ئەسەدخان، بە ئەسفەهان و عێراقی عەجەمەوە بەشی ئێرانی باشوری بۆ ساغبووەوە. جا لەم کاتەدا محەمەد حسین خانی قاجاریی پەلاماری( کەریم خان)یداوە. لەشکری قاجار ئێجگار زۆربوو، کەریم خان خۆی نەگرت بە لەشکرەکەیەوە کشایەوە هەتا شیراز، بریاری وادابوو کە لەوێدا دوژمن بەربەست بکا. کە حەسەن خان بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە شیراز، شارەکەی پێچا (١٧٥٦م). لەمکاتەدا شێخ علی خان ناو سەرکردەیەکی ئازاو (زەند) هەڵێ کوتایە سەربارو بارخانەی لەشکری قاجارو داگیرکرد. خەڵکی ئەوناوە بە عێلجاریی هاتن بۆ یارمەتی کەریم خان. لە هەموو لایەکەوە دەستیانکرد بە کوشتار لە سوپای قاجار. لەلایەکەوە لەبەر برسییەتیی و درێژکردنی پێچانی شاری شیراز، لەلایەکی تریشەوە هەڵمەت و ئازایی سوپای کەریم خان کە لە دەرو ژووری شیرازدا خۆیان ئەدا بە لەشکرەکەی قاجاردا دوژمنی تەنگەتاو کردبوو. بێجگە لەمانە ئەم لەشکری قاجارە چونکە هەرە مەبوو گشتیان دڵسۆزی حسین خان نەبوون. جا لەرووی ئەمانەوە لەشکری قاجار شیرازەی تێکچوو بوو، دەستیکردبوو بە بڵاوبوونەوە. ئەوسا حسین خانیش هیچی بۆ ئەماوەتەوە لەگەڵ لەشکرەکەیدا بەرەو باکور شکستیداوەو گەڕاوەتەوە، تەنانەت ئەسفەهانیشی بەجێهێشتووەو خۆی گەیاندووەتەوە مازیندەران. جا لەوێ دەرکەوت کە زوربەی سوپاکەی بڵاومیکردووە. لەدوای ئەم سەرکەوتنە کەریم خان گەڕایەوە ئەسفەهان. لەوێ ئەهالی بە پیریەوە چوون و پێی شادبوون (١١٧٠هـ - ١٧٥٦م). بەمجۆرە زۆری پێنەچووە هەموو وڵاتەکانی جاران هاتووەتە ژێر فەرمانی پادشای کوردان جا کەریم خان بەمجۆرە بە یەکەم پلەی ئاواتی خۆی گەیشتووەو حکومەتی سەربەخۆی دروستکردووە. لەپاش ئەم ڕووداوانە وردە وردە ئیدارەی جێگیربووە، ئەگەرچی هەندێکجاریش خراپی بۆ هاتووە، بەڵام لە دڵی خەڵکا ئەوەندە خۆشەویست بوو، ئیدارەکەی بەم تۆزە ئەهاتییانە تێك نەئەچوو. لەدوای ڕێکخستنی ئیشوکاری فەڵەمڕەویی، کەریم خان بە بیری تیژی سیاسیی خۆی زۆرچاك زانیبووی کە هەتا بەسەر محەمەد حسین خانی قاجاردا زاڵ نەبێت پاشەڕۆژی دەوڵەتەکەی قایم نابێت. لەبەرئەوە بەسەرداریی (شێخ علی خان) ناو سەرۆکی ئازای عەشیرەتی زەند سوپای ناردووەتە سەر مازیندەران. بەهۆی تەدبیرە

جوانەکانی کەریم خان کە خۆی ئەیکردو ئازایی ئەم لەشکرە، ئازاوە دەوبوەبە ناو هۆزەکانی عێلی قاجارەوە. ئینجا لە دوای ئەمە شێخ علی خان هەڵیکوتاوەتەسەر محەممەد حسین خان. ئەمە لەشکری قاجاری خواهی نەخواهی تووشی شەڕکردووەو لە دوای شەڕێکی خوێناویی شکاوەو محەممەدحسن خان بەدیلگیراوە. ئەم سەرکەوتنە بۆ کەریم خان زۆر گرنگ و بەنرخ بووە. گەیلان و ئازەربایجان کەوتوونەتە ژێر حوکمی کەریم خانەوە. لە دوای ئەمە لە شەڕی (قەرەچیمەن)دا فتح علی خانی ڕەئیسی عەشیرەتی هەوشاریش شکاوەو ئەم سەردارەش بەدیلگیراوە (۱۱۷٤هـ ۱۷٦۰م)، لەم شەڕانەدا عەشیرەتە عەرەبەکانی خەلیج یارمەتی کەریم خانیان داوە. لەم دیلییەدا فتح علی خان گەلێك حورمەتی گیرا، کەچی لە دوایدا دەرکەوت کە ئەم کابرایە لەگەڵ هەندێك سەرداری ترا خەریکی موئامەرە کردن بوون کە کەریم خان لەناوبەرن. لەبەرئەمانە هەموو کوژراون. لەدوای ئەم هەموو سەرکەوتنانە ئیتر دەستەڵاتی حوکمی کەریم خان لەئێرانا بەتەواوی جێگیربووە. تەختی پادشایەتی بۆ ساغبووەتەوە. کەریم خان ئەیویست فەرمانڕەوایەکی (داد پەروەر) بێت، زوڵم و زۆر لە ئیدارەکەیا نەبێت. هەرچەندە جاروبار هەندێك لە ئومەراو سەردارەکانی یاخیبوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشا زوڵمی لێنەکردوون. ئەوی زۆر پیاوخراپ نەبووبێت لەناوی نەبردووە. جا بەمجۆرە حوکم و ئیدارە جوانە ئێران وای پێهات لە یاخیگەریی پاك بووەتەوە. بەم تەرحە دەوری دوایی پادشایەتی کەریم خان بێ هەراو بێدەنگ ڕۆیشتووە.. ئەم بێدەنگییە بەشی زکی خانی برای کەریم خانی تێدایە، چونکە لە ترسی توندو تیژییەکەی ئەم، کەس نەیوێرا یاخی گەریی بکات کەریم خان خۆی ناونەناوە (شاە)، بەڵکو خۆی داناوە بە (وەکیلی شاە). لەوە پێشر (علی مردان خان)ی سەرداری عەشیرەتی بەختیاری منداڵێکی صەفەوی بەناوی (شاە ئیسماعیل)ەوە خستبووە سەر تەختی شای ئێران. جا کەریم خان دەستی لەم (شاە) بێ دەستەڵاتە نەداوەو خۆشی بە (شاە) بانگ نەکردووە. کەریم خان لەمەوا (شیراز)ی کردووەتە پایتەخت و لەسەر داد و ڕاستیی دەستیکردووە بە ئیدارەی کیشوەری ئێران. لەشکرێکی پڕچەك و پڕ مەشقی پێکەوەناوە زوربەی ئەم لەشکرە کوڕە کوڕەی عێلاتی کوردەواری بووە، تیپە سوارەو پیادەی عەرەبیشی تیا بووە چونکە هەموو کەس ئەیویست خزمەتی کەریم خان بکات و یارمەتی بدات. صادق خانی برای کەریم خان سەرداری گشتی ئەم سوپایە بووە. لەشکری کەریم خان بەهێنێك چووەتە شاری (بەسرە)و پێچاویەتی، وە لە ۱۷۷٦م دا شارەکە تەسلیم بووە لەشکری عوسمانییەکان هیچی پێنەکراوە. کەریم خان ئەیویست عیراق داگیربکات

چونکە شارە پیرۆزەکانی شیعە لە عێراقدا بـوو، بـەڵام هـەلی بۆ هەڵنەکەوتووە ئەمـە بەجێ بێت.

### خزمەتی کەریم خان بۆ ئاوەدانی:

لەکاتی کەریم خاندا بازرگانیی و کشتوکاڵ لە ئێرانا ڕەواجی سـەندووە، وە لەپاشا ئـەم ڕەواجـە بـۆ ئـەوروپاش پـەیدابووە کە ئـەمینی و ئاسایش لـە سـایەی ئیـدارەی ڕێکوپێکی کەریم خانەوە دروستبوو، چونکە لـەوەپێش لەبەرچـەردە کـەس نەیـەوێرا بە ئێرانا بڕوات. جا بەم خزمەتانە ئێران ئاوەدان بووەتەوە، خەڵك دەوڵەمەند بووەو خۆشیی کەوتووەتە وڵاتەوە. شاری (شیراز) زۆر پێشکەوتووە. بووەتە شـارێکی ڕازاوەی پـڕ بـاخ و بێستان و بـە کۆشك و سـەراکانی بووەتـە بەهەشت. لـەکاتی کـەریم خانـا هەموو شارەکانی ئێران پێشکەوتووە، بـەڵام هیچیـان وەکو شیراز بـەخۆیا نـەهاتووە. مێژوونووسێکی ئـێرانی بـۆ ئـەم مەبەستە شتێکی جوانی نوسـیوەو ئەڵـێ: ڕەنگـی ئاوەدانییـەکان هـەموو ئـێرانی گرتووەتـەوە، بـەڵام ڕۆشـنایی ئـەو ڕوناکییانـە لـە هەموویان زیاتر بەر شیراز کەوتووە. کەریم خان لە تەمـەنی ٨٠ ساڵییدا کۆچی ئـەم دنیایەی کردووە ساڵی (١١٩١هـ ١٧٧٩م) یەعنی ٢٨ ساڵێك فەرمانڕەوا بووە.

### ڕەوشت و تەبیاتی کەریم خان:

کەریم خان فەرمانڕەوایەکی گەورەو ناودارە لە مێژوودا. خزمەتی ئینسانییەت و ئاوەدانیی و کۆمەڵایەتیی کردووە. شایەکی دادپـەروەرو دیموکـرات تـەبیات بـووە، بـۆ ڕاگرتنی ڕژێمی کۆمەڵایەتیی هەرچی پێویست بـووە بەجێیـهێناوە. فەرمانڕەوایـەکی دوور ئەندێش بووەو بیرتیژو گیان سـووك و ئـازا.. سـەردارێکی سـوارچاك و عەسـکەر تەبیات بوو، وەکو سەربازێك لەناو سـوپاکەیا ژیـاوە، خـۆی لـێیان جیانەکردووەتـەوە. عەشرەتی زەندو هەمووتیرەکانی تری عێلی (لەك) هێشتا کۆچەریی بوون، خوێنـدن و نوسـین لـەناویانا باونـەبووە. لەبەرئـەوە کەریم خـانیش نـەخوێندەوار بـووە. لەسـەر ئەوەشا چونکە خوێندواریی زۆر بەنرخ بووە لەلای مەجلیسەکانی هەمیشـە بـە زانـاو خوێندەوارو شاعیر ڕازاوەتەوە. گۆڕی (حافظی شیرازی)و (سعدی شیرازی) بـە ئـەمری کـەریم خـان سـەرلەنوێ هەڵبەسـتراوەتەوە. بـەکورتی: مێـژوو نـاوی کـەریم خـانی بـە حورمەتەوە نوسیوەو خەڵکی ئێران لەدوای مردنی زۆر بۆی بە پەرۆشبووە.

### دەوری لطف علی خان:

لەدوای مـردنی کەریم خان هەرا لەسەر تـەخت و تاج دەستیپێکردووەو حکومـەتی زەنـد ئـاژاوەی تێکەوتووە. هەرایـەکی خوێنینـی ئـەوتۆ کەوتووەتـە نـاو کـوڕو بـراو

برازاکانیەوە جارێکی تر ئارامیی و بێدەنگیی نەهاتوەتەوە بەرووی ئەم حکومەتە گەورەیەی کورددا. حکومەتی زەند هەمووی ٤١ ساڵێك بەردەوام بووە. ئەویش ٢٨ ساڵی کاتی فەرمانڕەوایی کەریم خان خۆیەتی ١٣ ساڵەکەی دوایی بە ئاژاوەو هەراو هوریا ڕابواردوەو لە ئەنجاما حکومەتەکەی لەناوچووە. کەریم خان چوارکوڕی بەجێهێشتووە. لە بەدبەختی حکومەتی زەندا ئەمانە هیچیان کەڵکی فەرمانڕەواییان نەبووە. بەجارێ یەك لەدوای یەك یەکتریان هەڵکوڵیوە بۆئەوەی تەخت و تاج بۆ خۆیان بمێنێتەوە، ئەمجا یەکتریان لەناوبردووە. لەدوای کەریم خان (فتح علی خان) بەناو لە جێی باوکی بووەتە شای ئێران، بەڵام بەڕاستی حکومەت بەدەستی زکی خانی زڕبراو ئامۆزای باوکییەوە بووە. صادق خانی مامیان کە مردنی کەریم خانی بیست لە بەسرەوە هاتوەتە (شیراز) ویستوویەتی شارەکە بگرێت. بەڵام بۆینەچووەتە سەر، ئەمجا ڕایکردووەتە کرمان، یەکێك لە بەدبەختیی حکومەتی زەند ئەوە بووە (ئاغا محەمەد خان)ی سەرداری عەشرەتی قاجار کە لە شیراز دەست بەسەربوو، لەدوای مردنی کەریم خان بۆی دەرچوو خۆی گەیاندەوە (مازیندەران) ئەوەبوو لە دوایدا ئەم حکومەتەی لەناوبرد، علی مراد خانی خوشکەزای زەکی خان کە بە لەشکرەوە شوێن ئاغا محەمەدخان کەوتبوو دەم و دەست لە خاڵی وەرگەڕاو بە ئیدیعای دانانی کوڕانی کەریم خان لەجێی باوکیانا کەوتە تەقەلا، لەم هەرایەدا زکی خان لەلایەن پیاوەکانی خۆیەوە کوژراوە ئەمجارەش (فتح علی خان) بە شای ئێران ئیعلان کرایەوە (١٧٨٠م). لەسەر ئەمە صادق خان بە ئاشتیی هاتەوە شیراز، بەڵام زۆری پێنەچوو چاوی بڕییە تەختی حکومەت. لەبێدەستەڵاتی فتح علی خان بەمەرامی خۆی گەیشت و ئەم شازادە بەدبەختەی لە تەخت دابەزاند و چاویشی کوێرکرد. ئەوسا بانگی شایەتی ئێرانی بۆ خۆیدا. لەولاوە علی مراد خانیش کە ئەمەی بیست لە تارانا بانگیدا کە خۆی شای ئێرانە. لەدوای ئەوە بە سوپایەکی زۆرەوە ڕوویکردە ئەسفەهان، لای هەمەدان لەشکری صادق خانی شکاندو چووە سەر شیراز، وە دەوری شارەکەیدا، وازی لێنەهێنا هەتا زەوتیکردو صادق خانی لەگەڵ سێ کوڕەکەیدا کوشت (١٧٨١م). لەدوای ئەم علی مراد خان بوو بە شای ئێران. حوکمداری

تـازە ئەسـفەهانی کـردە پایتـەخت. ئـەمجا ئـەختێك ئاسـایش پـەیدابووە. بـەڵام مەسئەلەی قاجارەکان هەروا مایەوە علی مراد خان ئەیویست لە ئێرانا لەخۆی زیـاتر کـەس نـەمێنێت بەربـەرەکانێی لەگـەڵا بکـات. لەبەرئــەوە لەشـکری نــاردە ســەر مـازیندەران و داگیرپکرد، کەچی لەسەری ئـەڕۆیی وەضعەکەی سـاغنەکردەوە هـەتا لەشکرەکەی بێتاقەت بوو. ئینجا لەو کاتەدا تووشی شەڕبوو لەشکرەکەی شکاو هاتەوە تـاران. لەمکاتـەدا (جعفــر خـان)ی کـوڕی صـادق خـان یـاخیبووەو چووەتـە سـەر ئەصفەهان. بەمجۆرە قاجارەکان کە دوژمنی گیانی کوردان بوون ماوەیـان دەسـتکەوت و زۆرچاك بووژانەوە. علی مراد خان لە سەرئەمە بە سوپاوەو بەدەم ئەخۆشییەوە گەڕاوەتەوە بۆ سەر جعفرخان. لەڕێگا ئەخۆشییەکەی و سەرمای زستانیشی هاتەسەر و کوشـتی (١٧٨٥م). لـەولاوە جعفرخـان گەیشـتە ئەسـفەهان خـێرا بـانگی شـاهێتییان بۆداو بەهەموو ئێرانا بڵاوکرایەوە. شەڕی دوورو درێـژ (وڵاتـەکانی) شـپرزە کردبـوو. خەڵق هەمووی ماندوو ناڕەزاو بەتەمای نـارام و ئاسایش بـوو. خۆخۆریـی و پشـێویی هێزی لە حکومەتی زەندا ئەهێشتبوو. لەبەرئەم کارەساتانە (ئاغا محەمـەد خـان)ی قاجار بێ ترس ولـەرز لـە مـازیندەران هاتـە خـوارەوە چووە تـاران و هـەموو بـاکوری ئـێرانی داگیرکرد. ئـەمجا ڕوویکردووەتـە ئەسـفەهان، لەشـکرەکەی ئـەوەندە زۆربـوو جعفرخان بەرامبەری پێنەکرا لەبەرئەوە ئەسفەهانی بەجێهێشت. سەرەڕای ئەمە لـە ناوچــەی شیرازیشــا یاخیگــەریی دەســتیپێکردووە. خواوراســتان لەمکاتــەدا ئاغــا محەمەدخان تووشی هەرای بەختیارییـەکان بـووەو هیچـی تـری پێنـەکراوە بەوانـەوە خەریکبووەو گەڕاوەتەوە تاران. لەملاشەوە حکومەتەکەی (جعفر خـان) هـەر روو لـە کزیی بـوو، وە لـە هـەرای نـاوخۆ هـەرگیز ڕزگـاری نەئـەبوو. هـەتا پیاو ماقووڵـەکانی خـۆی لەپـەناوە موئامـەرەیان دەربـارە کـردو بـە فێـڵ کوشـتیان (١٧٨٩م). لــەدوای جعفرخان ئاژاوەیەکی قورستر کەوتە حکومەتی زەندەوە، پاشـا گەردانییـەکی سـەخت بە کیشوەرەکەدا ڕوویداوە. کاربەدەستو مـاقووڵان بـۆ نـاگربڕیی (لطف علی خـان)ی کوڕی جعفرخانیان دانا بە شای ئێرانو هێنایانە سەر تەخت.

### هەرا لەسەر تەخت و تاج:

شای تازە لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا بووە کە چووەتە سەر تەخت. جوانێکی کاریگەری ئازاو نەبەز، لاوچاکێکی عەسکەر تەبیات و خوڵق جوان و باڵا بەرزو سوارچاك و چالاك وەك ئاگری قودرەت بووە، کە چووەتە سەر تەخت. کەچی ئەم هەڵکێشان و خوڵقە جوانانەی لوطف علی خان لەگەڵ حیلمو سەلیقەو کردگاریا لەسەر ئیش یەکی نەگرت و بەجەهێڵێکی سەرچڵ و بێرەحم دەرچوو، وەك هیوا ئەکرا وا دەرنەچوو خوڵقە جوانەکانی گەلێکی بەلای خراپییدا گۆڕا، وایلێهاتووە ئەوانەی هێنابوویانە سەر تەخت ئەوانیش پەشیمان ببوونەوە. لطف علی خان لەدوای هاتنە سەر تەخت لەگەڵ ئاغا محەمەد خانی قاجارییدا کەوتووەتە شەڕ سوپای قاجار هاتووەتە سەر شیراز، بەڵام هیچی پێنەکراوەو گەڕاوەتەوە. لە دوای ئەمە لە باتی ئیدارەی حکومەتەکە ڕوو بکاتە چاك بوون و ڕێککەوتن کەچی تە ئەهات بەلای خراپییدا ئەڕۆیشت. دووبەرەکیی و خەیانەت و دڵپیسیی و فیتنە ئەنگیزی کەوتە ناو سەردارو کاربەدەستانەوە. لطف علی خان لەگەڵ حاجی ئیبراهیمی وەزیریا لە دڵا ناکۆك بوو، ئەیویست لەناوی بەرێت. بەڵام چونکە وەزیرەکە دەستەڵاتدار بوو (شاه) سڵی لێئەکرد، بەرامبەر ئەمە حاجی ئیبراهیمی وەزیریش هەمیشە لە مەترسییدا بوو. لە ئەنجاما بڕیاریدا کە وڵاتی شیرازبدات بە ئاغا محەمەد خانی قاجارو دەوڵەتی (زەند) لەناوبەرێت. بەمجۆرە ڕقەبەریی حوکمدارێکی نەفامو وەزیرێکی تەماعکار چووەتە خوێنی دەوڵەتێکی گەورەی کوردو بە ئەنجام لە ناویانبرد. حاجی ئیبراهیمی وەزیر لە ژێرەوە لەگەڵ ئاغا محەمەد خانی قاجارا قسەی کرد بەیەك. کەسەکانی خۆی کە بەلەشکرەوە لەگەڵ لطف علی خان چووبوون بۆ سەر ئەسفەهان، ڕاسپاردو تەفرمیدان کە شەو لە ناکاوێك بیکەنە هەڵداو ببنە شکستەو بگەڕێنەوە بۆ شیراز، یەعنی لەشکرەکە بڵاوبکەنەوە. لەدوای ئەم تەدبیرە خۆشی ئەو سەرکردانەی کە لە شاردا مابوونەوە و سەر بە (شاه) بوون ئەوانیشی بە فێڵ گرتو شارەکەی خستە ژێرچنگی خۆیەوە. بەڕاستی ئەم پیلان و

فێڵانــه هــهمووی ســهریگرت. لهشــکرهکهی لطـف علـی خـان لای ئهســفههان شــهو لهناکاوێك تهقهی تێکهوت. شاهی زهند ئهوهندهی پێکرا لهگهڵ چهند سوارێکا خۆی گهیاندهوه شیراز، کهچی تهماشایکرد شارهکه قبوڵی ناکات. لهســهرئهمه ناچار هــهڕای کردو چــووه (ئــهبوو شــههر) لــهوێش جێینــهبووهوه. ئــهمجا پــهنای بــرده (بــهندهر)ێك لهوێ گیرسایهوه (١٧٩١م). ئهم پادشای کوردی کڵۆڵه ئهوهنده ئازاو بهجهرگ بــوو لــهم ئاوارهبوونــه هیــوای نــهبڕی، بــۆ ســهندنهوهی تــهختو تاجهکــهی کهوتــه تهقــهلادانی قارهمانانه.، لهشکرێکی بچووکی پێکهوه ناو ئهبوو شههری گرت و هاتــه سهر شــیرازو پێچای، بــهڵام لــه تــالعی ئــهما ناحهزهکــهی ئهمــهنده وریــاو لهسهرخۆ و زیــرهك بــوو بهرامبهر ئازایی و ئهبهزیی ئهم پادشــاهه قارهمانــه، (یــهعنی حــاجی ئیبراهیم خــانی وهزیر) هیچ ئهشڵهژاو تهدبیری بهیدهستکردنی شاهی زهنـدی بـۆ ههڵسووڕا لهشکره پاخییهکهی لهمهڕ لطف علی خان به پهرێشانیی که هاتووهتهوه شیراز لهلایهن حاجی ئیبراهیمــهوه بــه تــهدبیرێکی زیرانــه چــهك و سیلاحیان لــێسهنـدراوه. لهبهرئــهوه لــه ههڵمــهتی ئــهمجارهیا لطف علــی خــان هیچی بــۆ نــهکرا. ســهرهڕای ئهمــه لهشــکرێکی قاجاریش لهوکاتهدا گهیشتووهته ئهوێ هاتووه به کۆمهکی حاجی ئیبراهیمــهوه بــهڵام قارهمانی کورد پهلاماری لهشکرهکهی داوهو شکاندوویهتی. که ئهو دهنگه گهیشتووهته ســهرداری قاجــار ئــهوجاره سوپایهکی گــهورهتری ناردووهتــهوه ئهمانــه کــه هــاتوونو چوونه شیرازو لهگهڵ سوپای حاجی ئیبراهیمی ئاپاکا بوون بهیــهك و پــهلاماری تــۆزه لهشکرهکهی لطف علی خانیاندا، کهچی پادشای زهنـد بــه هونــهرێکی سهردارانه ئــهم جهنگــهی وهها گێڕاوه لــه ئــهنجاما دوژمــن شکاو کوشــتارێکی زۆری لــێکراو گــهلێك پیاوماقووڵ و ســهرداری قاجــاریش بــهدیلگیراوه. ئــهم دهنگــه ناخۆشــه کــه گهیشــتهوه سهرداری قاجار زانی که ئهگهر دهم و دهست تــهدبیری بهیدهستکردنی ئــهم قارهمــانی کورده نــهکا هــهموو ئــێرانی لــێداگیردهکاتهوه. لهســهرئهمه بههــهموو هێزێکیــهوه کــه مابووی ڕوویکردووهته شیراز. جا ئهم سوپایه ســهدچهندانهی لهشکرهکهی لطف علی خــان بــوو. هــهردوو لهشــکر نزیــك (ئیستــهخر) بــهرهنگاری یــهکبووه، بــێ پــهروایی و قارهمانیی شای زهند ئهوهنده کاری کردبووه سهر سهرداری قاجار زۆر بهترس و لهرز

ئەبروایەوە. لطف علی خان زۆر [illegible]

(هەرچی بادا باد). هەڵمەت نەبات تەخت و تاجەکەی لەم کابرا بێگانەیە ڕزگار ناکات. لەبەرئەوە بە جۆرێکی شێرانە عامبازی لەشکری قاجار بوو. بەم هەڵمەتە پێشداری دوژمن شکاو بەرەو پاش توور درا بە سەربەشی گەورەی سوپاکەیانا ئەوانیشی شڵەژاندو شکان. جا لەمکاتەدا شەو بەسەرا هاتووە سوپای کوردی دلاوەر کە گەیشتووەتە هۆردووگای قاجار لەوێ وەستاوە نەیزانیوە ئەگەر شەویش بێت ئەبێ لەسەر دوژمنی شکستە بڕوات. جا بەم وەستانە دوژمن هۆشی هاتەوە بەرخۆی، خۆیگرتووەتەوە نیتر نەشکاوە. بەڕاستی ڕۆژی دوایی کە خۆرهەڵاتووە دیویانە دوژمن ڕیزی بەستووەو بۆ جەنگ ئامادەبووە. ئەوسا دەرکەوت کە شکستی ڕۆژی پێشووی دوژمن هەلکەوتنێك بووەو لەکیسچووە، جارێکیتر ئەو هەلە هەڵناکەوێتەوە، لەبەرئەوە لە خۆ ڕزگارکردن بەولاوە بۆ لطف علی خان چارەیەکیتر نەماوە. جا لطف علی خانیش ئەوەی بەجێهێناوە.

## دوایی حکومەتی زەند

وەك لطف علی خان شایستەی سەرکەوتن بوو، ئاغا محەمەد خانیش بەختی باش بوو. لەو ڕۆژەدا تەخت و تاجی ئێرانی بۆ ساغبووەوە، چونکە ئەم حوکمدارە بەختبەرزە لە پەشۆکاویی ڕۆژی پێشووی لەشکرەکەیا خۆی هیچ نەشڵەژا بوو، وە قەرارگاهەکەشی بەجێنەهێشتووە. لەدوای ئاشکرا بوونی قووەت کەمیی لطف علی خان، ئیتر ئەم پادشا بەخت ئاوەژووە خۆی ڕاگیر نەکردووە، مەیدانی شەڕی بەجێهێشتووە هەتا (کرمان) ڕانەوەستاوە. لەوێ ئێستێکی کردووە بە سوپاه. کۆکردنەوە. بەڵام دوژمن بە چالاکی گەیشتووەتە سەری. لەبەرئەوە لەوێیش خۆی نەگرتووەتەوە ڕوویکردووەتە خوراسان، لەوێ دەم و دەست هێزێکی بچووکی پێکەوەناوە، ئەمجا ڕوویکردووەتە یەزدو چەند دەستێکی وەشاندو هێزەکەی پەرەیسەند. بەڵام لەمکاتەدا بەرەنگاری هێزێکی قورسی حاجی براهیمی وەزیر بووەو خۆی پێنەگیراوەو ڕایکردووە بۆ لای سنووری ئەفغان. خانی (نەرمانشێر) هەندێك لەشکری بۆ پێکەوە ناوە لطف علی خان لەگەڵ ئەم ئەختە لەشکرەدا ڕوویکردە

کرمان وەك پڵنگ عامبازی لەشکری نەوناوەی دوژمن بووە سەری لێتێکدان و شکاندنی و کرمانی گرت (١٢٠٩هـ - ١٧٩٤م) خێرا وێنەی شاهێتی داوەتەوە بەخۆی و (سکە)ی لێداوە نەیویست ناوبانگێك دەرکاتەوەو دەستوورێکی سیاسی بخاتە کایەوە. بەڵام داخی گرانم قەیرانی لەناوچوونی دەوڵەتی زەند هاتبوو، چارەی ژیانی نەمابوو. چونکە لەشکرێکی گرانی ئاغا محەمەد خان لەوێ هاتە سەر کرمان و چوون بەگژیەکا. ئەمجارەش گەلێك ئازایی نواند، بەڵام لەناو لەشکرەکەی خوێدا کە خەیانەت دەرکەوت و چەند بورجێکی شارەکەیاندا بە دوژمن. ئیتر شاهزادە وەك پڵنگ هەڵمەتیبرد کە بورجەکان بسێنێتەوە. بەڵام دوژمن زۆر بوو کارترازابوو. لەبەرئەوە بۆی نەسەندرایەوە. ئەمجا زۆر تەنگەتاو بوو تا ئێوارە شەڕی لەگەڵ کردن. کە دیی زوربەی کەڵەمێردەکانی بەردەستی کوژراوەو ڕاوەستان کەڵکی نەماوە، لە تاریکی شەوا خۆی و چەند پیاوێکی قۆچاخ کە مابوونەوە پەلاماری دوژمنیاندا، ڕیزی لەشکری دوژمنیان دڕی و بۆی دەرچوون. شەهریار بەدبەخت ئەمجارە ڕوویکردووەتە (نەرمانشیر)و چووە لای جیهانگیرخانی کۆنە دۆستی. کەچی ئەم سەردارە بێ مەروەتە ئەمجارە پیاوەتی لەگەڵا نەکرد، بەڵکو بۆ کارچاکیی خۆی لای ئاغا محەمەد خان بڕیاری گرتنی( لطف علی خان )یداوە چەند پیاوێکی پڕچەکی ناردە سەر. ئەو سا لطف علی خان تێگەیشت کە هەموو شتێك بڕاوەتەوە، ئەمجا بۆ خۆی بڕیاریدا کە بەمەردی بکوژرێت باشترە نەك بە حیزی و زیندوێتی دەست دوژمن بکەوێ. ئەوکاتە دەستی دایە شیرو پەلاماری دوژمنەکانیدا، شەڕێکی مەردانەی لە گەلاکردن و گەلێکی لێخستن. بەڵام خۆشی لە دوو جێگەوە بریندارببووەو کەوتووەتە زەوی. بەوجۆرە گرتیان و بردیانە لای ئاغا محەمەدخان. شاهی قاجار باری نامەردی گرت. دوژمنە نازاکەی ئەتك کرد. پەلپەل بەدەستی خۆی هەردوو چاوی هەڵکۆڵی، ئەمجا ناردی بۆ تاران لەوێ بەجۆرێکی زۆر نا ئینسانانە کوشتیان (١٢٠٩ هـ - ١٧٩٤م). ئەم پادشاهە کلۆڵە لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا جوانەمەرگ بووە. ئەگەرچی لە شێرو لە پڵنگ ئازاتربوو، وە کردەوەی زۆر بێباکانەی هەبوو، بەڵام لە ئیدارەی وڵات بەڕێوە بردنی فەرمانڕەوایدا ئەم جوانە مەرگە هیچ دوور ئەندێشیی نەبووەو زۆر بەخۆی نازیوە.

به کوشتنی لطف علی خان حکومەتی زەند دوایی هاتووە. جا ئەم حکومەتە زۆر زوو لەناوچووە. بەو بۆنەیەوە:

وا سەبارەت بەکۆستی لەناوچوونی (حکومەتی زەند) لای خوارەوە نووسرا حوکمدارانی زەند نزیکەی چل پەنجا سالێك بەسەر بەشی زۆری ئێرانا فەرمانڕەوا بوون بەڵام ڕاستییەکەی ئەوی بیناغەی حکومەتەکەی دانا، تەنیا هەر حوکمی ئەو ڕەواجی تەواویبووە. ئەوانیتر لەبەر زرمەزلی و ناکۆکیی ناو خۆیان فەرمانڕەواییان بۆ ساغنەبووەتەوە لەبەرئەوە ئاغا محەمەد خانی دوژمنیان کە هەمیشە لە پارێزیانا بوو، بە خوێن ساردیی و هێمنیی لە ئەنجاما بەسەریانا زاڵبووە و حکومەتەکەیانی لەناوبردوە. سەبارەتێکیتر بۆ تەمەن کورتیی ئەم حکومەتە ئەوەیە کە عەشیرەتی زەند تیرەیەکی بچووك بووە نەیتوانیوە ئەم حکومەتە گەورەیە بپارێزێت. هەر لەبەرئەمەش بوو کە کەریم خان هەندێ عەشرەتی کوردی بردوو بۆ ناوچەی شێراز دایمەزراندوون تاکو لە ئیدارەی حکومەتەکەیا پشتیان پێببەستێ. عەشرەتی زەند وەکو کەم هێز بوو لە کەریم خان زیاتر سەرۆکی زیرەك کارناشنایان لێهەڵنەکەوتبوو. بەڵکو هەموو شەڕانیو فیتنە بەرپاکەر بوون. حاجی ئیبراهیمی سپلە یەکێك بووە لەوانە. ئەوەبوو ئەم کابرایە لەگەڵ قاجارەکانا بە لەناوبردنی لطف علی خان پەیمانی بەست و بە موئامەرەیەك سوپای حکومەتەکەی بێچەك کردو گیانی لە حکومەتی زەنددا نەهێشت. بەرەکەتدا حاجی ئیبراهیم خانی دوا براویش بێسزا نەمایەوە تووشی ئەو ئەنجامە بووە کە خۆی دەربارەی خانەدانی زەند ڕەوای بینیوە، یەعنی لەدوای محەمەد خان بەفەرمانی فتح علی شاهی قاجار چاوی خۆی و کوڕی و کچی هەڵکۆڵراوە، ئەمجا دەربەدەرکراون بۆ شاری قەزوێن لەوێ سەرگەردان و ماڵوێران بە ناسۆرەوە مردوون.

٦-حکومەتی ئەردەلان ١١٢٠م - ١٧٦٨م

لەلایەن هاتنە سەر مەسرەحی دەوری ئەم حکومەتە کوردەوە وتاری مێژوو نووسەکان یەکناگرێت. بەواتە واتەی ئەردەلانییەکان ئەم حکومەتە زۆر کۆنە شەرەفنامەو مێژووی چوارسەد ساڵی دوایی عێراقیش ئەڵێن: لەناوچەکانی

(ئەردەڵان)دا لەکۆنەوە دەوڵەتێکی بەهێز پەیدابووە، بەڵام باس و هەواڵی ونە. مێژوونووس (مێجەر لۆنگریك) و (دوکتۆر فریچیش) ئەڵێن ئەم حکومەتە بێ شەڕو شۆڕ سەری بۆ جێنگیزخان دانەواندووە. ئەوکاتەش ئاخریی و نۆخریی خەلافەتی عەبباسی ئەگرێتەوە. کەواتە ئەگونجێ مێژووی (٦١٧ ساڵی کۆچی) دانێین بە سەرەتای پەیدابوونی ئەم حکومەتە. یەعنی کە هێرشی سوپای جەنگیزخان دەرکەوتووە وەك دەرەبەگەکانی تر فەرمانڕەوایی ئەردەڵانیش چووەتە لای خاقانی موغوول، سەری بۆ نەواندووە. ئەویش بەپێی یاسای ئەو دەورەی لە ژێرسایەداری ئیمپەراتووریەتی مەغۆلدا حکومەتی ئەردەڵانی ناسیوە. جەنگیزخان لە ساڵی ٦١٧ی کۆچیی دا ئێرانی داگیرکردووە کە ١٢٢٠ ی زایینی ئەگرێتەوە. جا لەم تەئریخەوە حکومەتی ئەردەڵان گاە بەسەربەخۆیی و هەندێجاریش لە ڕەنگی تابیع دا شەش سەد ساڵێك ژیاوە، چونکە لە ساڵی ١٢٨٤ ی کۆچییدا لەناوچووە کە ١٧٦٧ی زایینی ئەگرێتەوە. هەر بەمجۆرە ئەم حکومەتە دامەزرانەکەشی لە مێژووەکانا ئاڵۆزکاوە. مێژووناسەکان هەریەکە جۆرێکیان وتووە: (شەرەفنامە) ئەڵێت لە هۆزی میرئەحمەدی مەڕوانیی کە حکومەتی مەڕوانیی کوردی لە کوردستانی ناوەندیدا پێکەوەنا (بابا ئەردەڵان) ناوێك هەڵکەوتووە چووەتە ناو عەشایری گۆران لە ئێران، لەوێ ناوبانگی ڕۆیشتووە. کە جەنگیزخان ئێرانی داگیرکرد. ئەم ئەمیرە چووەتەلای و خۆی بە (خاقانی مەغۆل) ناساندووە، ئەویش کردوویەتی بە حاکمی شارەزوور. مێژووی (چوار سەدەی دوایی عێراق)یش بۆ دامەزراندنی ئەم حکومەتە شتێکی وەك نووسراوەکەی لای سەرووی وتووە، ئەڵێت: خاقانی مەغۆل بابا ئەردەڵانی کردووە بە حاکمی شارەزوورو هەورامان. بەڵام دوکتۆر ڕیچی ئینگلیزیی ئەڵێت: بابا ئەردەڵان سەرکردەیەك بووە لە عەشرەتی (گۆران) بە ماریفەتی خۆی بووەتە گەورەیەك لەوناوەدا حکومەتێکی پێکەوەناوە. مێجەر لۆنگریکیش ئەڵێت: (کەڵۆڵ بەگ)ی کوڕی بابا ئەردەڵان کە بووەتە حاکم هەولێرشی ناوەتە ژێرحوکمی خۆیەوە ئەوسا حکومەتی تازەی ئەردەڵان بەهێزتربووەو هەتا مەغۆلەکان کزتربوون ئەمان گەشەیان کردووە. لەسەدەی هەشتەمی کۆچییدا لە عێراق لە حکومەتی (جەلایری)ی مەغۆل پەیدا بوو وا ڕێکەوت سەردارەکانی ئەردەڵان ئەوەندە ئازاو هونەرمەند نەبوون بۆیە لە باکور و ڕۆژاوای وڵاتەکەیانا هەندێك ناوچەیان لە کیسچووە. ئەم حکومەتی جەلایری مەغۆلە زۆر ناحەزی حکومەتی ئەردەڵان بوو بۆ لەناوبردنیان هەمیشە تەقەلایداوە. بەڵام سەرداری تازەو ئازاو ئەبەزی ئەردەڵان حەسەن بەگی خدر بەگ

بەربەست کرد. لەسەدەی پانزەمینی زایینی لە دەوری میر مەئموون خانی حاکمی ئەردەڵاندا حکومەتەکە زیاتر هێزی سەندووە. لەشکری ئەردەڵان ناوچەکەی لای سەرەوەی لە جەلایرییەکان سەندەوە. ئەم میرمەئموون خانە تا مێژووی نۆسەدی کۆچی حوکمی پایەداربووە. لە باکورەوە سنووری حکومەتەکە گەیشتووەتە (زێی بادینان) واتە (زای گەورە) تەنانەت لە ڕەواندزدا حکومەتی ئەردەڵان سوپای داناوە لەو دەورەدا لە ئەردەڵان ئەوکاتە، کوتوومت ئەتەوەو عەشایرەکانی ئیستە بوون عەشایری (زەنگەنە) و (جاف)و (هەمەوەند )هێشتا لە ئێرانەوە نەهاتبوونە عێراق بەدیار چاومانەوە جۆری کۆمەڵایەتی ئەقوام ڕۆژ بەڕۆژ لە گۆڕاندایە ڕژێمی عەشایری ئەوسا خەریکە نامێنێت. شارستانیەتیی لە برەودایە، خەریکە برە ئەسێنێت. ئەوسا: کۆیە، هەریر، ڕەواندوز، عەقرە (ئاکرێ)، قەڵادزە هەر یەک حکومەتێکی بچکۆلەی قەڵاییینی بوون. ئەوکاتە چەك شیرو تیر بوو. ناوچەکانی باکوری عێراق وەکو ئاکرێ، دێر هەریر، زاخۆ، دهۆك لە ژێر دەستەڵاتی ئامیدی (عمادیە)دا هەر یەکە ئەمارەتێك بوون. ئەمانە لە سەدەی دوانزەمینەوە تا سەدەی چواردەمین، یەعنی دوو سەد ساڵێك لەسەر جۆرە ڕژێمێکی (فیدراڵی)دا لە ژێر حوکمی ئەردەڵاندا بوون. دوای ئەم مێژووە چوونە ژێر حوکمی جەلایرییەکانەو وڵاتی موکریانی ئێرانیش لە ژێر دەستەڵاتی ئەردەڵاندا بووە. کە مەئموون بەگ مرد سێ کوڕی هەبوو، گەورەکەیان (بێگە بەگ) بووەتە جێنشینی باوکی. داخم ئاچم ئەمانە یەکیەتی حکومەتەکەیان ڕانەگرت، بەڵکو هەر یەکە ناوچەیەکی بۆ خۆی برد. ئیتر لێکهەڵوەشان. وا دیارە لەمکاتەدا یاوز سوڵتان سەلیمی پادشای تورکیا پەیدابووە چونکە مێجەر لۆنگریك ئەڵێ: لە دوای ڕووداوی (چاڵدیران) ئەردەڵانیش لەگەڵ ئەمارەتە کوردەکانی ترا بوونە تابیعی. دەوڵەتی عوسمانی. لە دوای بێگە بەگ مەئموون بەگی کوڕی بێگە بێگ چووەتە سەر تەختی ئەمارەتی باوکی. ئەو کاتە سوڵتان سولەیمانی قانوونی پادشای عوسمانی بوو. لە مێژووی (٩٢٦ - ٩٧٤)ی کۆچی حوکمداری ئەردەڵان مەئموونی دووەم بەپێی بەرژەوەندی سیاسی لەگەڵ صەفەوییەکانا بوو وە ئەمیرێکی بەکاربوو ئەردەڵانی بەرزکردبووەوە. جا دەستداری ئەردەڵانییەکان بە کەڵکی عوسمانییەکان ئەئەهات. لەبەرئەوە بە بیانووی ئەمین کردنەوەی ڕێگاوبانی بەغداوە لە (٩٤٥هـ) یەعنی ١٥٣٨ زایینییدا سوپایان ناردە سەر مەئموون بەگ. بەشی زۆری ئەم سوپایە پیادەو سوارەی کورد بوو بە خۆیان

سەرۆکیانەوە هاتبوون. یەکێك لەوانە سوڵتان حسین ناو ئەمیری عەمادیە بوو. ئەم لەشکرە بۆ داگیرکردنی مەریوان و سنە نێررا بوو. ئەگەر ئەوە سەری نەگرت هیچ نەبێ شارەزوور داگیربکرێت. مەئموون بەگ بەرامبەر ئەم لەشکرە مەردانە خۆی ڕاگرت، لە دواییدا کشایەوە قەڵای (زەڵم). عوسمانییەکان قەڵاکەیان پێچا. مەئموونی دلێر تێگەیشت کە دەرەقەت نایە. لەبەرئەوە خۆی گەیاندە ئەستانبووڵ. بەڵام لەوێ خرایە بەندیخانەوە. لەولاوە سوپای عوسمانی وڵاتی شارەزووری بێژاو تاڵانکرد. ئەمجا سورخاب بەگی مامی مەئموون بەگ هاتە کایەوە. ئەم بەگزادە دلێرە لەگەڵ تەهماسیب شای ئێران پەیمانی تازەکردەوە موڵکی برازاکەشی داگیرکرد. کە سولەیمانی قانوونی ئەمەی بیست مەئموون بەگی لە بەندیخانەی ئەستانبووڵ دەرهێناو کردی بە والی (حیللە) براکەشی کرد بە حاکمی (سرووچك). بەڵام بەرامبەر سورخاب بەگ ئەمانە هیچیان پێنەکرا. لەولاوە برای شاە تەهماسبی ئێران لەبەر قەباحەتێك کە کردبووی ڕایکردبووە لای سورخاب بەگ بۆ ئەوەی پەنای بدات. بەڵام لەشکری قزڵباشی ئێران هاتە سەریان و لە قەڵاکەی (مەریوان) ئەمانەی پێچا. دوایی جار سورخاب بەگ چارەی نەما کابراکەی دایە دەستەوەو وڵاتەکەی لە شەڕو شۆڕی قزڵباشەکان پاراست. لەسەر ئەم ڕووداوانە ئەستانبوڵ واتە (بابی عالی)( بالطەچی محەمەد پاشا)ناو والییەکی تازەی نارد بۆ عێراق لە (١٥٤٩م – ٩٥٦م) دا ئەم والییە لەشکرێکی زۆری بە تۆپخانەوە لەگەڵ تیپە سوپای عەشایری کوردا ناردە سەر شارەزوور ئەم لەشکرە لە زەڵم دا سورخاب بەگی پێچا. ئەم پێچانە زۆر درێژەی کێشا. والی بەغداد باڵطەچی پاشا ناچار خۆی هات شەڕەکەی بەڕێوە برد، سیاسەتێکی وەهای کرد بێ جەنگ لەگەڵ سورخاب بەگدا ڕێککەوت. سورخاب بەگ قەڵاکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت. بەمجۆرە قەڵای زەڵم کەوتە دەست باڵطەچی بەڵام بەم ئەنجامە سورخاب بەگ و حکومەتەکەی لەناو نەچووە، بەڵکو بە یارمەتی حکومەتی ئێران لە شارەزوورو ئەردەڵاندا دووبارە جێگیربوومتەوەو لە خزمەتی شاهی ئێرانا زۆر بەنرخ و جێگادار بووە. دوکتۆر فریج لە نوسراوی (کوردلەر)دا (لاپەرە ١٢٣)دا ئەڵێت؛ سورخاب بەگ لە دوای بەینێك دەستی پەیدا کردووەتەوە. ئەمجا سەربەخۆ حکومەتەکەی ئەگێڕا. کاتێکی باش بێ شەڕوهەرا هەر بەوجۆرە ڕایبوارد. ئەم سەردارە مەردە گەورەترین حوکمداری ئەم خانەدانەیە. (شەرەفنامە)ش مەدح و ثەنای ئەکات ئەڵێت؛ وڵاتەکەی بە ڕێك و پێکی بەڕێوە بردووە. میللەت لەکاتی ئەما خۆشی ڕابوارد. سورخاب بەگ لەگەڵ ئێرانا هەمیشە یەك قەول و یەك دڵ بووە،

چونکه بەرژەوەندی هەردوو لەوەدا بووە، بەرە هەموو ناوچەکانی سولەیمانی ئێستا
له قەڵەمڕەوی حکومەتەکەیا بووە. دەوڵەتی عوسمانی لەم هێزو دەستەڵاتە مەترسی پەیداکرد. لەبەرئەو هۆیە سەرداری ئەعظەمی عوسمانی لەگەڵ میرو سەردارەکانی کوردستانا بە ئەیروویەکی قورسەوە بەرەو شارەزوور کەوتنە ڕێ لە بەغدادەوە. ئەمانە بەتەمابوون هەموو ئەردەڵان بگرن. قەڵای (زەڵم) یان پێچا. ئەردەڵانییەکان مەردانە تێئەکۆشان. ئەم ڕەزمی بەرقەڵایە دووساڵ درێژەی کێشا. عوسمانییەکان لە تاوانا وازیان لە قەڵاکە هێنا. (تاماسیب) شای ئێران بۆ پایەداریی قەڵاکە یارمەتیی ئەدا. سورخاب بەگ لە ئەردەڵانەوە هەمیشە بەیەکیەتی لەگەڵ ئێرانا ئەم ڕووداوانەی بەڕێوە بردووە. لەمکاتەدا سورخاب بەگ مردو سوڵتان عەلی کوڕی بوو بەجێنشینی باوکی ئەویش مرد. ئینجا لە نێوان (بسات)ی برای و(تەیمورخان) ی کوڕیدا هەراو زەنای حوکمداری دەستپێکرد. لە ئەنجامدا بە یارمەتی حکومەتی عوسمانی تەیمورخان حوکمڕانیتی ئەردەڵانی خستە ژێرچنگی خۆیەوە. سوڵتان مرادی سێهەم پادشای عوسمانی شارەزووریشی بۆ خستەسەرو کردی بە پادشای ئەوناوە لە (٩٨٨هـ – ١٥٨٠م)دا. دوکتۆر فریح لەم تەیمور پاشایە زۆر خراپ ئەدوێ ئەڵێت: تەریدەو پیاوکوژ بووە، حەزی لە ماڵی تاڵانیی کردووە. دەوری حوکمڕانییەکەی بوومتە مەینەتی بۆ کوردستان هەتا لە شەڕێکا کوژرا (٩٦٨هـ). لە دوای تەیموور پاشا (هەڵۆخان)ی برای بوومتە ئەمیری ئەردەڵان. ئەم خانە فەرمانڕەوایەکی خولق باشبووە. لە فەرمانی حکومەتی عوسمانی دەرنەچووە. لەمکاتەدا لە وڵاتی ئەردەڵان تێکچوون (ئینقیلاب)ێك ڕوویداوە. لە دوای هەڵۆخان حاکمیەتی ئەردەڵان کەوتوومتە دەست (خان ئەحمەد خان) ناو لە (١٠١٤هـ – ١٦٠٥م) ئەم حوکمدارە لەگەڵ (شاه عباس)ی ئێرانا ڕێك کەوت و ئەردەڵانی کرد بە تابیعی ئێران. لای وابوو شاهەنشای ئێران بۆ بەرژەوەندی کورد لە عوسمانییەکان زۆر باشترە. بەو بۆنەیەوە شانازیی ئەکرد، تەنانەت دەستیکرد بە جەنگ هاویشتن بۆ سەر عەشایری کوردو ئەمارەتەکانی کوردستانی عوسمانی. یەکەمجار تاوی دایە سەر موکریان، ڕەواندز، عەمادیە، کۆیەو حەریریشی داگیرکردو پیاوی خۆی لەسەر ئەم شارانە دانا، هەرچەندە ئەم حوکمڕەوابیە درێژ نەبومتەوە، بەڵام لە پڕێکا ئەم دەست درێژو هێزدارییە کە (خان احمد خان) حاکمی ئەردەڵان نواندی شەرەفێکی گەورەی بۆ مێژووی حکومەتی ئەردەڵانی کورد دروستکرد. بەوهۆیەوە بەرەکەت و خۆشی کەوتە کوردستانەوە. سەردەمێك بەمجۆرە وڵاتەکانی ئەردەڵانی کۆنی ژیاندەوە

بەکارامەیی و تێگەیشتنی بەجێ و جوانی خۆی شاە عەباسیش لێی مەمنوون بوو. تەنانەت شاە کردی بە زاوای خۆی. خان ئەحمەد خان حاکمێکی زرنگ بوو. بە دووربینیی و فامیدەیی ئەجوولایەوە. دەستی بۆ ئەو وڵاتانە نەئەبرد کە ڕاستەوخۆ لە ئیدارەی عوسمانییەکانا بوون، بەڵکو لەگەڵ ئەمارەتە کوردەوارییەکانا خەریکبوو کە یەکیان پێبگرێت و ببن بە دەوڵەتێکی گەورەو لە ئیستیعماری بێگانە ڕزگار بن. ئەوەندە هەیە کە شاە عەباس لە (١٠٣٤هـ) دا چووە سەر بەغدا. خان ئەحمەد خانیش بەتیپە سوپای ئەردەڵانەوە لە تەکیا بوو وا ڕێکەوت بە(کەرکووك - کەرکوویە)دا ڕۆیشت. شارو قەڵاکە هەردووکی داگیرکردو لەگەڵ ئەمانەدا هەموو شارەزووریشی گرت. بەمجۆرە حوکم و دەستەڵاتی خان ئەحمەد خان لە عەمادیەوە تا سنووری کرماشان و هەمەدان و لە لوڕستانەوە تا دەریای ورمێ ئەچوو. ئەم دەوری بەرزی حکومەتی ئەردەڵانی کوردە لە دوای مردنی شاە عەباس ئیتر بەردەوام نەبوو، لە ساڵی ١٠٣٩هـ دا سەرەك وەزیر (صدری اعظم)ی عوسمانی بۆ سەندنەوەی وڵاتی بەغدا بەسوپایەکی قورسەوە هاتە سەر عێراق، ئامۆژگاریی نامەی بۆ ئومەراکانی کوردی ئەوناوە نارد، ئەمجارە ڕوویکردە هەرێمی ئەردەڵان. بەڵام خان ئەحمەد خان لە یەکیەتی ئێران جیا نەبووەوە بە ئاشکرا لەگەڵ ئێرانا بوو. تەنانەت هەندێك پیاوماقووڵ و سەرۆکەکانی لای خۆی هەبوون لایەنگری حکومەتی سوونی مەزهەبی عوسمانی بوون. کە لەشکری عوسمانی لەکەرکووك تێپەڕی ئەمانەو گەلێك ئومەرای ئەردەڵان و خانەکانی کوردستان هاتنە لای سەرداری عوسمانی دۆستایەتی خۆیان نواند، لە دوای ئەمانە ئەمجا سوپای عوسمانی چووە سەر شارەزوور، یەك دوو مانگێك لەوێ خۆی نواندو قەڵای گوڵ عەنبەری ئاواکردەوە. لە دوای ئەمە بوو لەشکرێکی عوسمانی چوو (میهرەبان - مەریوان)ی گرت. لەمکاتەدا (زینەڵ خان) بە لەشکرێکی گرانەوە بەرەو مەریوان هات لە هەمەدانەوە، لەوێ جەنگێکی گەورە ڕوویدا لە کاتی جەنگدا لەشکری عوسمانی لە شارەزوورەوە کوتووپڕ بە فریای ئەمانەدا گەیشت، ئەمجا شەڕەکە قورستر بوو. لە ئەنجاما لەشکری ئێران زۆر خراپ شکا. لەسەر ئەمەشاهی ئێران زینەڵ خانی کوشت، ئەوسا بە سوپایەکی تازەوە کشا بۆ سەر شارەزوور. سەرداری عوسمانی ئەمجارەش بە سوپا زۆرەکەیەوە ڕوویکردووەتە ناو جەرگەی ئەردەڵان، قەڵای (حەسەن ئاوا)ی کە پایتەختی خان احمد خان بوو لە دوای تاڵانکردن وێرانکردو لە ١٦٣٠م ١٠٤٠هـ دا گەیشتە بەردەمی هەمەدان. ئەم شارەو گەلێك جێگای تریشی گرت و پاش تاڵانکردنیان وێرانیکردن و گەلێکی کەیشی

ـێکوشتن. ئەمجا گەڕایەوە بە پاشا، ڕووی کردووەتە بەعدا، سێ چل ڕۆژێک سارەحەی پێچا. پاش ئەوە بەسەر موسڵ دا ڕۆیشتەوە بۆ ناو ئەنەدۆڵ (١٦٣١م) هێشتا سەرداری عوسمانی لە موسڵ دەرنەچووبوو کە خان احمد خان هەڵیکوتایە سەر شارەزوورو ڕەوتیکرد. لە دوای ئەم ڕووداوانە وا ڕێکەوت (شاە صفی خان)ی ئێرانی چاوی کوڕی خان احمد خانی هەڵکۆڵی. سەبارەت بەوە خان احمد خـان ڕووی لە ئێران وەرگێڕاو بەو بۆنەیەوە خۆی خستە پەنای حکومەتی عوسمانی. ئەوسا پادشای عوسمانی لە شاری موسڵ دایناـ لە دوای ئەمە سلێمان خان ناوێك لە زادەکانی ئەردەڵان بووەتە فەرمانڕەوای حکومەتی ئەردەڵان.

وا دیارە ئەم سلێمان خان ناوە ماوەیەکی زۆر حکومەتی ئەردەڵانی بەدەستەوە بووە. بەڵام حکومەتە کە بڕشتی جارانی نەماوە. لەبەرئەوە سولەیمان بەگی بەبە ئەمەی بەهەل داناو لە مێژووی ١٦٩٤م دا هەڵی کوتایە سەر ئەردەڵان و بەشێکی داگیرکردووە. بەڵام ساڵێك لە دوای ئەوە ئەردەڵانییەکان بەیارمەتی حکومەتی ئێران سلێمان بەگی بەبەیان شکاندو لە ئەردەڵان دەریانکرد. لەسەرئەوە لە ١١٤٣هـ دا والی عوسمانیی لە بەغدا (حسن پاشا) بە سوپایەکی گرانەوە هاتە سەر هەمەدان. ئەو دەمە علی قولی خان بە میراتی حاکمی ئەردەڵان بوو، بەبێ شەڕو هەرا لە خۆیەوە بوو بە تابیعی عوسمانی، چونکە ئێرانییەکان لە حاکمیەتیی عەزلیان کردبوو. جا بەم بۆنەیەوە بە فەرمانی حەسەن پاشا خانە پاشای بەبە چوو ئەردەڵانی داگیرکرد. علی قولی خان و هەندێك ئومەرای تری کورد بەمە ڕازیبوون. خانە پاشای بەبە لە ئەردەڵانا دەورێکی هەیە. لەشکری عوسمانیو سوپای اشرف خانی ئەفغانی لە ئێرانا لەم دەورەیەدا بەرەنگاری یەکبوون. عوسمانییەکان بە فێڵو فیشاڵی خانە پاشا بە هەڵە چوون وشکستیان خواردووەو لەسەرئەوە بە ناچاریی لە ئێران دەرچوون. ئینجا تا پەیدا بوونی (نادرشا)ی بەناوبانگ (خانە پاشا) لە ئەردەڵانا هەر حاکم بووە. لە دەوری (تاماسیب قولی خان)ی ئێرانیدا کە تورکەکانی لە ئێران دەرکرد، حاکمیەتی ئەردەڵانیشی دایەوە بە (سبحان ویردی خان)ی ئەردەڵانی. لەمەولا حاکمەکانی بەبە چاویان بڕیوەتە داگیرکردنی وڵاتی ئەردەڵان. سولەیمان پاشای حاکمی بەبە لە ١٧٩٣م دا بەشێکی ئەردەڵانی داگیرکرد، بەڵام زۆری پێنەچوو سوبحان ویردی خان گرتیەوە ئەمجا کەریم خانی زەند هاتە کایەوە، دەستی خستووەتە ئیشی ئەردەڵانەوە. بەیارمەتی کەریم خان، سولەیمان پاشا ئەمجاریش چووە سەر ئەردەڵان، ناوچەی (سنەی)ی داگیرکرد. بەمجۆرە بابانەکان بوون بەدەستەو دایەری (ئاغا محەمەد

خان)ی سەرداری قاجار، کە دوژمنی خوێنی کوردو خانەدانی زەند بوو. لەبەرئەمانە (ئەردەڵان) لە ژێـر دەسـت و پێـی لەشکردا پلیشاوەتەوە، وڵات و ئـەهالی لـەناوچوون. لەدوای سوبحان وێردی خان حاکمیەتی ئـەردەڵان کەوتـە دەسـت (خەسـرەو خـان) کـە پێییـان ئـەوت (خەسـرەو خـانی گـەورە). (١١٦٨- ١٢١٤). لـە سـاڵی ١١٩٠ هـ دا والی بـەغدا احمد پاشا لە کرماشانەوەو محەمەد پاشای بەبەش لە (سنە)وە لەشکریان برد. پاشای بەبە لە دوو شوێنا لەشکری ئەردەڵانی شکاند، بەڵام زۆری پێنەچوو لەشـکری کـەریم خانی زەند تـا دەوری کـەرکووك هات. لێرەدا کـەریم خـان ناحـەزی والی بـەغدا بـوو. بـەکورتی: لـە دەوری بەبـەدا ئـەردەڵان مـاڵوێران بـووە. کوردەکـان بـۆ بـەرژەوەندی (مصلحة)ی بێگانە لە هەردوولاوە خۆیان بە کوشتداوە. لـە دوای خەسـرەوخان (امـان الله خان)ی کوڕی هاتووەتە جێی. لە (١٢١٤هـ تا ١٢٤٠م) میللەت بەمیشی وتـووە گـەورە، چونکـە بەڕاسـتی فەرمانڕەوایـەکی وابـووە بـۆ ئـاوەدانیی و فـەرەحیی و زانسـتیی وڵاتەکـەی زۆر تێکۆشـاوە. شـاری (سـنە)ی ڕازاندووەتــەوە، بووەتــە ناوچـەی شـاعیرو خوێندەوار. (سێرجۆن مالکۆڵم) و (ڕیچ) میوانی ئەم حاکمە بـوون، مـەدح و ستایشی بەڕێوەبردنی ئیدارەی ئەکـەن. لـە دوای ئـەم خەسـرەو خـانی کـوڕی هاتووەتـە جێـی. (ماە شەرەف خانم)ی ژنی ئەم فەرمانڕەوایە شـاعیرێکی بـەناوبانگ بـووە (غـوڵام شـاە قوڵـی خـان)ی کـوڕی ئـەم بووەتـە حـاکم لـە جێـی بـاوکی، بـەگزادەکان لـەناوخۆیانا کەوتوونەتـە زرمـە زلـیێ و ناخۆشـیی. (امـان الله خـان)ی بـرای فـەرمانڕەوای دوایـی ئەردەڵان لە (١٢٦٥ – ١٢٨٤هـ )دا حوکمی کردووە. لەو کاتەدا (ناصر الدین شاە)ی ئێران کە لە بیانوو ئەگەڕا فەرهاد میرزای مـامی خـۆی دانـا بـە حـاکمی ئـەردەڵان. لـە دوای ئەمـە لــە ئــەردەڵانا حــاکمی کــورد دانەنراوەتــەوە. بــەمجۆرە حکومــەتی ئــەردەڵان دواییهاتووە. ئەگـەرچی هێشـتا لـەم خانەدانـە هـەندێك کـەس مـاوە، بـەڵام هیچیـان بەدەست نییە. حکومەتی ئەردەڵان یەکێکە لە حکومەتـە بـە دەستەڵاتەکانی کوردی ئێران. سەردەمێك بە تەواوی (سەربەخۆ) بووە، پارەی سـکە لێـدراوی خـۆی هـەبووە. فـەرمانڕەواکانیان خوتبـەیان بـەناوی خۆیانــەوە خوێندووەتــەوە. ئەمانــە لــەدوای حوکمڕانیی ئیلخانییـەکان ئـەم دەستەڵاتانەیان بووە. یـەعنی لـە سـەرەتای سـەدەی حەوتــەمی کۆچییــەوە دەسـتییپێکردووە تـا دەوری سـەفەوی کـە سـەدەی دەیــەمی کۆچییـە. واتـە ئــەم دەسـتدارییە دوو سـەد سـاڵێك درێژبووەتـەوە. دوای ئەمـە لـە تابیعیەتی سیاسی ئێران و هەندێکجار عوسمانیدا دیسان لەناوخۆیانا سـەربەخۆ بـوون

تا له ناوچوونی خان احمد خان. لەدوای ئەمە ئەمجا دەسـتەلاتی سیاسی ئـێران بەسەریانا زاڵبووە تا لە ١٢٨٤ی کۆچیدا بە تەواوی چووەتە گۆڕخانەی تەمریخەوە.

**٧-حکومەتی سۆران ١٨٤٧م (زایینی)**

لە مێژووی کورددا (سۆران) بـە ناوچەی نێوانـی هەردوو (زاب)بێـژراوەو بووەتـە ناوو نیشان بۆ کوردەکانی ئەوێ و ئەمارەتە سەربەخۆکان کە لەو ناوەدا پەیدابووە. مێژوو زانەکان ئەڵێن (کەولۆس) ناو پیاوێکی کورد لەسەدەی یازدەیەمینی زایینییدا هاتووەتە هەرێمی هەولێر لەناحیەی (ناوان)دا ناوی پەیداکردووەو دامەزراوە. لەدوای خۆی کوڕەکانی بوونەتـە پیاوماقووڵی ئەوناوە. گەورەکەیان کە عیسای ناوبووە لە هەرایەکا زۆر ناوبانگی سەندووە بووەتە سەردارو بەناوی جێگای شەڕەکەوە ناوبـانگی (سووران)ی بۆماوەتەوەو بە (میر عیسا)ی سۆران شۆرەتی ڕۆییوە.لە زاناکانا هەشە ئەڵـێت سورخاب بـەگی حوکمداری ئـەردەڵان بارام بـەگی کوڕی خۆی ناردووەتـەوە (ڕەواندز) کردوویە بەفەرمانڕەوای ئەوێ لە سەدەی دەیەمی کۆچیـدا. جا حکومـەتی سۆران ئـەم بەگزادەیە پێکەوەیناوەو لە دوای خۆی میرعیسا نـاوی کـوڕی بووەتـە جێنشینی. وە ئەم ڕووداوەش لە کـاتی فەرمانڕەوایی (شاه تەهماسب)دا دروستبووە. میرعیسا بـەمجۆرە کـە بووەتـە سـەردار بـە سـەربەخۆیی دەسـتیکردووە بـە حوکمڕانیکردن وە لە دوای مردنی خۆی (شاە علی بـەگ)ی کوڕی چووەتە جێـی ئـەمیش کـە مـردووە وڵاتەکـەی بەسـەر چـوار کوڕیـا دابەشـکردووەو پایتـەختی ئەمارەتەکەی ئەوسا حەریر بووە. ئەم دابەشبوونە بووەتـە هۆی کزبوون و بێهێزیی ئەمارەتەکە. لە مانە میر عیسا ناوێکیان تووشـی هەڵـمەتی (پیربۆداق بـەگ)ی بابانی دراوسێیان بووەو لە ناوچووە. لەسەر ئەمە ئینجا شا علی بـەگ ناوێکیـان هاتووەتـە کایەوەو بابانەکانی دەرکردووەو ئەمارەتەکەی یەکدگیرکردوەتـەوەو خستوویەتە ژێـر فەرمانڕەوایی خۆیـەوە. بـەم ڕەنگە بووەتـە مـیرێکی نـازاو بـە شـەوکەتو هـەموو ناوچەی هەولێرو موسڵ و کەرکووکی لـە قزڵباشـەکان سـەندووەتەوەو ئـەمارەتێکی بەناوبانگی پێکەوەناوە. ئەم حوکمدارەش مـردووە (مـیرعزالدین شێر)ی کوڕی جێـی گرتووەتەوەو هـەولێری کردووەتـە پایتـەختی حکومەتەکەی. ئینجا لەمکاتـەدا بـوو،

(سوڵتان سولەیمانی قانوونی) پادشاهی عوسمانیی بۆ داگیرکردنی بەغداد هاتووەتە ئەوناوە. وا دیارە میرعزالدین نەبووەتە مسکێنی پادشای عوسمانی. بەڵام داخەکەم ئەم بەخۆنازینەی بۆ نەچووەتەسەر. میر عزالدین گیراوەو کوشتوویانە لە (٩٤١هـ ـ ١٥٣٤م) دا. لەدوای ئەو ئەمارەتی سۆران کزبووەو زۆرداریی و دەستەڵات زیادیی حکومەتی عوسمانی لەمناوەدا برووزی سەندووە تاکو لە دوایدا (قول بەگ) ناو ئەمیرێکی ئەم خانەدانە بە ڕەزامەندێتی عوسمانییەکان حوکمی سۆرانی هێناوەتەوە ژێر دەستی خۆی. ئەوەندە هەیە ئەمارەتەکە تازە هێزی جارانی نەگرتووەتەوەو هەمیشە بە حکومەتی عوسمانی ژیاوە. پایتەختی ئەمارەت جارجار گۆڕاوە. گاە لە (دوێن)و گاە لە (حەریر) یا لە (کالیفانی) واتە (خەلیفان) و ڕەواندوز بووە. سەرەڕای ئەم نشوستانەی ئەمارەتەکە لەمەولا ئاژاوەو چەرمەسەریی ناخۆشی بووە. بە پێی دەستەڵات وەیا کەمدەستیی ئەمیرەکانیان، گاە ناوبانگی ئەمارەتەکە بەرز بووەتەوەو گیانێکی دەرخستووە. جارو باریش کزیی و بێهێزیی ڕووی تێکردوونەتەوە. لە سەدەی ١٨ ای زاینییدا ئەم ئەمارەتە لەگەڵ حکومەتی بابانی سلێمانیدا بەشەڕو هەرا ڕابواردووە. لەکاتی (سولەیمان بەگی کوڕی شەکەل بەگ) ناو حاکمی سۆراندا وڵات فەرەحیی و خۆشیی تێکەوتووە. زانست باڵای سەندووە. تەنانەت قەڵاو شتی دروستکراوی ئەم سەردەمە ماوە. (حەریر) پایتەختبووە. (خانزاد) ناو خوشکی ئەم ئەمیرە سەردەمێك ئەمارەتەکەی بەناوی کاکییەوە بەڕێوەبردووە، چونکە حکومەتی عوسمانی بەغداد لەناوبانگی سلێمان بەگ سڵەمیوەتەوە. بەفێڵ بانگیانکردووەتە بەغداد لەوێ گرتوویانەو لە بەندیخانەدا مردووە. کردەوەو چاکەی ئەم شاژنە بەجێماوە بەچیرۆك ئەیگێڕنەوە. لەدوای ئەمان علی بەگی سلێمان بەگ لەتاو دەستدرێژیی بەبەکان لە دەوری ڕەواندزدا قەڵای دروستکردوە. جا بەم بۆنەیەوە لە دوایدا ئەم شوێنە بەناوی (گەلی عەلی بەگ) ناوبانگی ڕۆیوە. لە (١٢٠١هـ ـ ١٧٨٧م) لەمکاتەدا ڕەواندز بووەتە پایتەختی ئەمارەت. لە کاتی میر مصطفی بەگدا لەگەڵ بەبەکان ئاشتبوونەوەو بوون بەخزمی یەکتری. ئینجا ئەم ئەمیرە وڵاتەکەی ڕێکخستووەو هێزێکی تازەی پێداوەتەوە (١٢٤٢هـ).

## حەمەد پاشا کوێرە:

حەمەد (محەمەد) پاشای ڕەواندزی ناودار کوڕی ئەم مصطفی بەگەیە. لەدوای مردنی باوکی بوومتە (ئەمیری سۆران) لە ١٨٢٦م دا. ئەم بەگزادە مەردە بەڕاستیی ئەمیری هەرە گەورەی سۆرانە. هەر لە منالییەوە بیری سەربەخۆیی چووەتە مێشکیەوە. ویستوویە دەستەلاتی حکومەتی عوسمانی لە ئەمارەتەکەیا نەهێڵێ و ئەمارەتەکەی بکا بە حکومەتێکی سەربەخۆو خۆشی ببێت بە پادشای ئەو حکومەتە. میر محەمەد پاشا هەوێنی پادشایەتیی تیا بوو. توندو نازاو بەکاربوو. ئەگەر دەورمکە کەلکی بگرتایە، وەیا سەرۆکەکانی کورد پاڵیان بدایەتە پاڵی و لە قسەی دەرنەچوونایە، بێگومان ئاواتەکەی ئەهێنایەدی. ئەم سەرداره هەڵکەوتووه چاوێکی کوێربووه. بۆیە پێیان وتووه (پاشا کوێرە). ئەم سالارە بیربەرزە کە بوومتە (میر) لەبەرئەوەی کە سەرکەشییان کردبوو، دوو مامی خۆی گرتوومو هەڵیواسیون، ئەمجا دەستیکردووه بە گەورەکردنی ماوەی ئەمارەتەکەی. عێلاتی شیروان و سوورچی و برادۆستی خستووەتە ژێردەستەلاتی خۆی. بابانەکانی لە حەریر دەرپەڕاندو شاری هەولێری داگیرکردووه. ئەمجا ناوچەکانی دزەیی و پردێ و ڕانیەی داگیرکرد. ڕووباری زێی بچووکی لە ناوەند سۆران و بابانا کردووە بە سنوورو لە( ١٨٣٠ م )دا تەپڵی سەربەخۆیی لێداوە. لەسەر ئەوە والی بەغدا کەوتووەتە مەترسییەوە. بەلا، بەرامبەر ئەم سەرداری کوردە کوتوپڕ هیچی پێنەکراوە، بەڵکو ڕووداوەکەی جاری بە شیرینی بڕیوەتەوە. پێشەکی دانی بەحکومەتەکەشا ناوەو مەرتەبەی (میری میران)یشی لە پادشای ئەستەمبووڵ بۆ سەندووه. میری سۆران لەشکرێکی ڕێکو پێکو پڕچەکی پێویستبوو، چونکە ئەیزانی بەبێ لەشکری ڕێکوپێک هیچی پێناکرێ لەبەرئەوە تا ساڵی ١٢٤٩ھ ١٨٣٣م لە کورە کورەی عێلاتی کورد سوپایەکی باشی پێکەوەناوە. ئەمجا ڕوویکردووەتە (بادینان) لە دوای چەند شەڕێك (عەمقرە عەمادیە، دهۆك و، زاخۆ)ی زەوتکردووەو بایداوەتەوە، یەزیدییەکانی باکوری موسڵیشی خستووەتە ژێردەستەلاتی خۆیەوە. لەدوای ئەمانە لە تەك سەرۆکەکانی

(جزیرەو ماردین و نوسەیبین)یشا پەیمانی یەکیەتی بەستووە. بەمجۆرە بۆ ئەوکاتە حوکمڕانییەکی فیدراڵی بۆ دروستبووە. جا میر محەمەد پاشا لەتوورەی ناوەندی هەردوو زاب و ئەرزەکانی خۆرهەلات و باکوری موسڵدا حکومەتێکی بەهێزی لە ماوەیەکی کەما پێکەوە نا. لەسەر ئەم پێشکەوتن و برووز سەندنەی حکومەتی سۆران تورکەکانی عوسمانی تەنگەتاو بوون. لەبەرئەوە خێرا کەوتوونەتە تەقەلای ئەهێشتنی ئەم هێزە. جا بە سەرداریی صەدری ئەعظەم لە ئەستەمووڵەوە لەشکرێکی تورك نێردراوە بۆ عێراق. ئەم سوپایە لەگەڵ لەشکرەکانی والی بەغداو موسڵ یەکانگیربووە بەرامبەر ئەم لەشکرنارایيە سەرداری کوردەواری بە باشیزانی کە بکشێتەوە بۆ ڕەواندز. تا لەناو چیاکانی ئەوێدا جەزرەبە (ضربە) یەك لە دوژمن بدات و بیشکێنێ. ئەگەرچی ئەم جۆرە دووربینی عەسکەرایەتییە زۆر بەجێبووە، بەڵام چ فائیدە؟ لە جێی عێلاتی کورد لەم تەنگانەیەدا بگەنە فریای سەردارەیان و خاکی کوردستان بپارێزن کەچی هاتوون بە کۆمەکی دوژمنەوەو لەشکری پادشای کوردانیان پێچاوە. میر محەمەد پاشا (گەلی عەلی بەگ)و ڕێبازەکانی تری بەردەمی ڕەواندزی گرتووە. دوژمنیش هاتووەتە حەریرو دیانە لەو دەشتانەدا هەڵیداوە. ئینجا لێرەدا صەدری ئەعظەم فڕو فێڵی خستووەتەکارو لە ڕێی (ئایین)ەوەو بە یارمەتی (مەلاکان) ویستوویەتی لەشکری میر محەمەد پاشان لەشەڕکردن ساردبکاتەوە. لەسەرئەمە جاڕدراوە کە بە گژ خەلیفەدا چوون و لەسەرئەوە خوێنی موسڵمان ڕشتن گوناهە. جا ئەم تەدبیرو فێڵە لە دڵی سەربازە نەخوێندەوارەکانی لەشکری سۆراندا خێرا کاریکردووەو محەمەد پاشا بەچاوی خۆی دیویە کە لەشکرەکەی بیری شەڕکردنی نەماوەو لای ئاشتی گرتووە بەوجۆرە بە ناچاریی تەسلیمی دوژمن بووە. ئەوانیش ناردوویانە بۆ ئەستەمبوڵ. لەوێ بەڕواڵەت عەفوکراوەو ناردویانەتەوە بۆ عێراق، بەڵام لە ڕێگا کوژراوە (١٢٥٣هـ ١٩٣٧م). بەمجۆرە هەوڵ و تەقەلای چەند ساڵەی ئەم سەردارە گەورەیە کە بە خوێنی ڕۆڵەی کوردی سۆران بەرهەمی هێنابوو، بە هۆی ناتەواویی بیری سیاسی میللەتەکەوە بەبادچووە. لەدوای میر محەمەد پاشا ئەمارەتی سۆران تینی تیانەماوە. ئەگەرچی هەر لەم خانەدانە چەند میرێك لەمەودوا بە پێی

دەستووری پێشوو بوونەتە حاکمی سۆران. بەڵام دەستەڵاتێکی ئەوتۆیان نیشان نەداوەو حکومەتی عوسمانییش هێزی پێنەهێشتوون. تەنانەت دەوڵەتی عوسمانیو هەربەوە وازی لێنەهێناوە. بەڵکو سوپای تازەشی بردووەتە سەریان و شەڕی پێفرۆشتوون. بەو بۆنەیەوە میری دواییان (ڕەسول پاشا)ی بەدبەخت تووشی چەند شەڕێك بووەو شکستی خواردووە. لە تاوانا وڵاتەکەی بەجێهێشتووەو چووەتە (شنۆ لە ئێران. بەمە حکومەتی سۆران لەناوچووە. (١٢٦٤هـ ١٨٤٧م). کتێبی مێژووی نوێ کە بەنیزنی وەزیری زانستی عێراق بۆ قوتابی پۆلی شەشەمی سەرەتایی لە چاپدراوە دەوری (محەممەد پاشای ڕەواندزی) وەها ئەگێڕێتەوە وەك لای خوارەوە نووسراوە[٨]:

## شۆڕشی محەمەد پاشای ڕەواندز:

لەسەرەتای چەرخی نۆزدەهەمدا محەمەد پاشا فەرمانڕەوای ئەمارەتی ڕەواندز بوو. پیاوێکی وریای ئاوات بەرزی بەکاربوو، ئەیویست کوردستان لە کۆتی عوسمانییەکان ڕزگاربکاو دەوڵەتێکی بە دەستەڵات و سەربەخۆ لە کورد دروست بکا جارێ سوپایەکی بەهێزی پێکەوەناو ئەمارەتە بچکۆلەکانی دراوسێی خستە ژێرچنگی خۆیەوە. لە پاشئەوە لە ساڵی ١٨٣٠م دا جارِی سەربەخۆییو جیابوونەوەیدا لە دەوڵەتی عوسمانیی. بەمرِەنگە بوو بە فەرمانڕەوای لیوای هەولێرو ناوچەی کوردەکانی موسڵ و هەندێك شوێن لە کوردستانی تورکیای ئەوساکە.

## دەستیکردووە بەڕێك خستن و چاککردن:

لەدوای ئەمە محەمەد پاشا خەریکی ڕێکخستنی فەرمانی دەوڵەتەکەی بووە. بە یارمەتی پیاوە زرنگەکانی ئەوساکەی وڵاتەکەی ڕێکخستووە. بەهەموو شوێنێکدا ئاسایشی بڵاوکردووەتەوە. بەڕەنگێك کە دانیشتوان دڵنیای سەروماڵیان بوون محەمەد پاشا لە فەرمانڕەواییدا پەیڕەوی ئاینی ئەکرد. دەستی دزیان ئەبڕی پیاوکوژیان ئەکوشتەوە. لەبەرئەم توندوتیژییە پیاو خراپان لە خراپەو بێدینی دوورئەکەوتنەوە.

---

[٨] کتێبی ڕەسمی مێژووی نوێ، بەندی شەشەم لاپەرە ١٤٦.

**جیهانگەڕێك هەواڵی لیوای هەولێری ئەوسا ئەگێڕێتەوە:**

جیهانگەڕێك کەلەمکاتەدا لە بەغداوە چووە بۆ ڕەواندز، ئەڵێت: وڵاتی ژێردەستی عوسمانییەکان بە ئاشکرا پەرێشانبووە. گوندەکان چۆڵ وەیان زۆر کەم دانیشتوویان تیابوو. زەوی هەمووی بەیاربوو. جوتیارەکان لە دەست پۆلیس و کاربەدەستان ڕایانئەکرد. بەڵام کە لە (پردێ - ئاڵتوون کۆپری) پەڕیوەتەوە چووەتە سنووری محەمەد پاشا، دیویەتی گوندەکان ئاوەدان و کشتوکاڵ لەگەشەدایەو دانیشتوان بە کۆمەڵ هاتوونەتە سەر ڕێگە بۆ بەخێرهاتنی خۆی و ئەو سەردارەی کە لەگەڵیابوومو لاوەکانیان گوڵیان کردبوو بەسەریانا، هەر لە(پردێ )وە تا هەولێر بەپانایی ئەو دەشتە هەمووی کشتوکاڵ و پاوان بوومو گوڵاڵە دایپۆشیبوو. گوندەکان پڕبوون لە دانیشتوانی پۆشتەو پەرداخ.

**عوسمانییەکان ئەمارەتەکەی محەمەد پاشا لەناونەبەن:**

عوسمانییـەکان هەستیان بـە تـەلزگـەی شۆڕشـەکەی محەمــەد پاشـا کـرد، ترسـاز بتەنێـتەوە بـە کوردسـتانا. بۆیــە خـێرا لــە بـەغداو موسـڵو دیاربـەکرەوە سـوپای گەورەیان نارد کە بەربەستی بکەن. بەرە بەرە دەستیانکرد بە داگیرکردنی ولاتـەکانی تا نزیکبوونەوە بە ڕەواندز. لەویّ تێگەیشتن کە ڕۆیشتن بە گەڵی عەلی بـەگدا شتێکو ئاسان نییـە. نوسـراوێکیان بـۆ محەمـەد پاشا نووسی و داوای ڕێککـەوتنیان لــێکرد، وتیان ئەگەر ژێر ڕکێفی عوسمانی قبوڵ بکات ئەبەخشرێت. محەمەد پاشا بـۆ ئـەوەی زیاتر خوێن نـەڕژێت، بـەو مەرجانـە ڕازیبـوو بـروای بـە بـەڵێنی سـەردارەکە کـرد، خۆیدا بە دەستەوە. لە پاشـەوە زۆر بـەڕێز بردیـان بـۆ ئەسـتەمبوڵ. لەدوای مـانگێ ئاینده ١٨٣٦م پادشای عوسمانی لێیخۆشبوو ڕێگەیدا بگەڕێتەوە جێگای خۆی. بەڵام لە گەڕانـەوەدا کوشـتیان. بـەم ڕەنگـە ڕوونـاکی ئـەو بڵێسـەیە کوژایـەوە کـە بەشـێکو کوردستانی ڕووناککردبوو، وە ئازادی و ئاسایشی تیا بڵاوکردبووەوە.

**٨- ئەمارەتی بابان ١٦٥٠م- ١٨٥١م**

حکومەتی کوردیی بابان لە ولاتی موکری و سلێمانی ئیستەدا پەیدابووە. سەرجەم سێسـەد سـاڵێك زیـاتر ژیـاوە. جاروبـار سـەربەخۆ بـووەو هـەندێجاریش یـا تـابیع (مسکێن)ی دەوڵەتی عوسمانی بووە یا هی ئێران. لە پێش بابانەکانا ولاتی سولەیمانی (کە پێشینان پێیانوتووە) لە ژێر فەرمانڕەوایی حکومەتی کوردی ئەردەڵاندا بووە کە پایتەختەکەی شاری سنە بـووە. بنچینـەی ئــەم ئەمارەتـە بـەگزادەکانی عەشـایری موکـری لـە تـوورەی موکریـان و پـژدەردا دایاننـاوە. وادیـارە عێلاتـی موکــری لـە زۆ زووەوە پەیوەندییان بـە شـارەزوورەوە بـووە. ئومـەراکانی بەبـە-(بابـان)ی سـولەیمانی خۆیان بە بەگزادەی تیرەیەکی عێلی کرمانج داناوە گوایا ناویان (بەبـە- بابـان) بـوو، بە کورتی مێژوو هێشـتا نـاوی (بەبـە)ی سـاغنەکردووەتەوە کـە لەچییـەوە داهـاتوو، کرمانج‌و موکری شتێکی جیاجیا نین ناوو نیشانەی یەکترین. وا دیارە ئـەمناوە یـا لە خانەدانی بەبەی پێشووی موکـری وەیـا ڕاسـتەوخۆ لـە (بابـە سـولەیمان) نـاو دانـەر خانـەدانی دواییەوە داهـاتووە. مێژوونووسـەکان لـە نووکـەوە تـا دوایـی بـەڕێکوپێک

باسی ئەدواری مێژووی بابانەکانمان بۆ ناکەن. بەڵام گشتیان نەڵێن ئەمیر (بۆداق بەبە) سەرداری یەکەمی بابانەکانە. گەرچی ناوی بۆداق تورکییەو بەوەدا گومان نەکرێ کە ئەم سەرداره نەبێ تورك بووبێ. بەڵام ڕاستییەکەی وەها نییە. بە مێژوو ساغبووەتەوە کە نەتەوە موسوڵمانەکان ئەم جۆرە فەرقەیان نەکردووەو تێکڕا ناوونیشانی یەکتریان بەکارهێناوە وەکو: لەوسەردەمەدا لەناو ئیسلامەکانا چونکە تورکەکان دەستەڵاتدار بوون نومەرای نەتەوەکانی تر ناوی ئەوانیان بە شانازییەوە بەکارهێناوە. لە مێژوودا دەنگ وەهایە بابانەکان سەرجەم پێنج خانەدان بوون، سەرەتای حوکمیان لە سەدەی نۆیەمی کۆچییەوە دەستپێکردووە. یەکەمین سەرۆك لە خانەدانی یەکەمە (میر بۆداق بەبە)ی کوڕی میرئەبدال بووە. ئەم بەگزادە سەرپشك و ئازایە لە موکریانا ناوی دەرکردووە. وڵاتی (لاجان)ی لە خێلاتی (زەرزا) و ناوچەی (سێوێ)ی لە ئەمارەتی سۆران و (سەڵدۆز)ی لە قزڵباشەکان سەندووەو لەگەڵ موکری و بانەدا ئەمارەتێکی بەهێزی پێکەوەناوە. لە دوای ئەمە شارباژێڕی لە ئەمارەتی ئەردەڵان و کەرکووکیشی لەحکومەتی بەغدا سەندووەو هەردوو حکومەتی تورك‌و ئێرانی خستووەتە مەترسییەوە. بەڵام بێباکانە لە وڵاتی سۆرانا کە خەریکی ڕاوکردن بووە تووشی بۆسەی بەگزادەی سۆران بووە کوژراوە. لەدوای ئەم (میر بۆداق)ی برازای چووەتە جێی، بەڵام زۆری پێنەچووە مردووەو بەمە یەکەم خانەدان کۆتایی هاتووە. خانەدانی دووەم لە (پیرنەزەر بارام) ناو ئەمیرێکەوە دەستپێئەکا. ئەم بەگزادەیە لە (پیر بۆداق) بووە. ناوچەی (کفری) لە حکومەتی بەغدا سەندووەو خستوویەتە سەرخاکی بەبە. بەمردنی پیرنەزەر خانەدانی دووەم دواییهاتووە. لەمەولا وڵاتی بەبە ئاژاوەی تێکەوتووە، نزیکەی ١٥٠ ساڵ زیاتر یەکێتی بەخۆیەوە نەدیوە لە ٩٢٦ ەوە تا ١١٠٠ ی کۆچی. لەم سەردەمەدا وڵات بەدەستی دوو ئاغاوە بووە. ئەم دوو ئاغایە کیشوەرەکەیان بەشکردووە. خانەدانی سێیەم و چوارەم لە بەری ئەم دوو ئاغایەن. ئەم دوو خانەدانە لەدوای نەختێك ڕێکیی ئیتر بەگژ یەکاچوون. هەرلا ویستوویە خاکی (بەبە) ساغبکاتەوە بۆخۆی جا لەبەرئەم هەراو پشێوییە وڵاتەکە شپرزەبووەو ئیدارەیەکی بنج بەستراو بۆ هیچیان پێکەوە نەنراوە، لەم ناکۆکییەش

حکومەتەکانی عوسمانی و ئێران خێریان نەدیوە، چونکە بەدرادەی ئەم دوو خانەوادانە پەنایان بردوەتەوە لای پادشاکانی عوسمانی و ئێرانو لەشکریان هێناوە بۆ سەر یەکتری. هەر کامێکیان سەرکەوتبێ ئەویتری دەرپەڕاندووە، بەڵام خۆشی بووەتە مسکێن، واتە تابیعی حکومەتە مەحمییەکەی. بەمجۆرە ئەم دووبەرەکیی و ناکۆکییانە وەکو بووەتە مەبەستی لەکیسچوونی سەربەخۆییان، ماڵوێرانییشی هێناوە بۆ حاکمەکانی و دواییش بەمیرات بەجێماوە، وەکو لە ئەنجامی کارا ئەمارەتەکەشی پێ لەناوچووە. ئەم هەراو هوریایە لە کاتی حوکمداری سولەیمانی قانوونی ناو پادشای عوسمانی و طەهماسیب شای ئێراندا دەستیپێکردووەو لەدوای ئەوانیش هەر بەردەوام بووە تاکو خانەدانی بەبەی سولەیمانی پەیدابووە.

## خانەدانی پێنجەم

## بابانی سولەیمانی

مێژووی بابانی سولەیمانی بەوێنەی چیرۆك لە (فەقێ ئەحمەدی دارشمانە) وە دەستپێئەکا. بنەچەی ئەم فەقێ ئەحمەدە بەتەواوی ساغنەبووەتەوە. بێگومان لە ئاغاواتی پژدەرەو لەبەری بەگزادەکانی موکرییە، کە مەرگەو پژدەریان لەژێرحوکمە بووە. فەقێ ئەحمەد لەوانە لە یەکێکیان بووە. لە پژدەرا قاو وەهایە باوکی ناوی کاکە شێخ بووە. ئەم فەقێ ئەحمەدە پیاوماقووڵێکی ئازاو زیرەكو بەکاربووە. لە شەڕێکا خزمەتێکی زۆری بۆ حکومەتی عوسمانی کردووە، ئەوانیش ناوچەی پژدەریان ئێجگاری داوەتێ. بەم تەرحە بناغەی خانەدانی پێنجەم کە (بابانی سولەیمانی) یە ئەم مرۆڤە ناوداره داینـاوە. ئەگونجێ ئەم ئەمارەتە لەسەردەمی پێشوودا لەژێرحوکمی (سۆران)دا بووبێت، چونکە شەڕو هەرای بابانەکان لەناوخۆیانا نەپساوەتەوە. بەوبۆنەیەوە کزییان هێناوە. بۆیە حاکمەکانی سۆرانی دراوسێیان بەسەریانا زاڵبوون. لەدوای فەقێ ئەحمەد (سولەیمان بەبە)ی کوڕی وەیا کوڕەزای هاتووەتە جێگەی. لەمکاتەدا جێ و شوێنی ئەمارەت (دارشمانە) بووە لە پژدەر وەك دەرئەکەوێ بناغەی ئەمارەتەکە بەڕاستیی ئەم (سولەیمان بەبە)یە داینـاوە لەدوای مێژووی (١٠٨٠هـ - ١٦٧٧م). ئەم بەگزادەیە لەو سەردەمەدا یەکەمین پیاوی هەڵکەوتووی ئەوناوە بووە. لە دوای ئەوەی بووەتە سەرداری (مەرگە) و (پژدەر دەستیکردووە بە گەورەکردنی سنووری قەڵەمڕەوەکەی. هەموو وڵاتی شارەزووری (کە گشت لیوای سلەیمانی ئێستایە)، داگیرکردووە. ئەمجا چاوی بڕیوەتە کەرکووك،

ئەویشی زەوتکردووە. دلاوەر پاشای موتەصەریفی کەرکووکی لەشەڕا کوشتووە ۱۱۰۲هـ ـ ۱٦۹۰م وە هەموو بـارگرانی لەشـکرەکەی بـەتالان بـردووە. لەسـەرئەوە لـە بـەغداو موسڵەوە لەشکرێکی زوربەی هاتووەتە سەر، بەلام هیچیان پێ نەکراوەو گەڕاونەتەوە.

## پایتەختی گواستووەتەوە بۆ قەلاچوالان

لەمەولا میرسولەیمان ئەختێك نارامیگرتووە، ئینجا دەستیکردووە بـە ڕێکخستنی فەرمانی ولاتەکانی. لـە دوای ئـەوە ڕووی کردووەتـە ولاتـی ئـەردەلان. بەڕاستیی ئـەم سـەرداره نیـازی بـووە حکومـەتێکی گـەورەی کورد پێکەوە بنـێ. لەبەرئـەوەش بـووە چاوی بڕیوەتە ئەردەلان کە ئـەم تـوڕرە گـەورەی کوردە بخاتـە ژێرحوکمـی خۆیـەوە. بەلام لە ئەنجامدا ئەم ئاواتەی سەرینەگرتووە. بەرامبەر لەشـکری ئـێران و ئـەردەلان کـە بـەگژ یـەکاچوون خـۆی شکاوەو گەڕاوەتـەوە. تومـەز عوسمانییـەکانیش چاوەڕێی هـەلێکی وابـوون کـە بۆیـان هەلکـەوێ. کـاتێك کـە دەنگـی ئـەم شکسـتەیان بیسـتووە سوپایەکی ئەسـتووریان ناردووەتـە سـەر ئـەمیری بەبـەو شـەڕێکی خوێنینیـان لەگـەڵ کـردووەو شـکاندویانە (۱۱۱۱هـ – ۱٦۹۹م). میرسـولەیمان بـەم ئشوسـتـە هـەموو شـتێکی لەکیسچووە. ئەوەندەی پێکراوە سەری خۆی هەلگرتووەو چووەتە ئەستانبوول. لـەوێ لە پاش بەینێك حکومەتی عوسمانی لێیبوردووەو ناردوویانەتەوە بۆ ولاتەکەی خۆی کـە ناویاننـابوو (سـنجاقی بابـان)و خستبوویانە سـەر ئیدارەکـەی کـەرکووك. لەمـەولا میرسولەیمان لە قەلاچوالان لە ژێر مسکێنایەتی حکومەتی عوسمانییا ئیـدارەی ولاتـی بەبـەی کـردووە. چـیرۆکی زۆر گـەرم و بـەناوبانگی ئـەم چەرخـە (دەور)ە هـەرای (ئەحمەد کولوان)ە کە لەوێ دوانزە سواری کەڵە مـێردی بابانـەکان لەشکرێکی چـەند هەزار کەسیی ئێرانی شکاندووە. لەناو کوردانی سولەیمانیدا بـەناوی (دوانـزە سوارەی مـەریوان)ە، وە ئیستەش ناوبـانگی ئـەم ڕووداوە مـاوە. لـەدوای ئشوستهێنانی سـوپای بەبـە، ئـەمیر سـولەیمان هاتووەتـەوە بـۆ قـەلاچوالان و لـەوێ مـردووە. لـەم کاتـە مەینەتییەدا هەندێ عەشرەت کەوتووەتە سەودای جیابوونەوە لە ئەمارەتەکە. خێلی زەنگەنـە یـەکێکبووە لـەو عەشـرەتانە. ئەمانـە هەلیانکوتاوەتـە سـەر کـەرکووك و

گیریانکردووە. کاری ڕاست بێت لەوکاتەدا بەکر بەگ ناو ئەمیرێکی ئازای بابان بە
ەدبیری جوان وبەجێ، هۆشێکی هێناوەتە بەر ئەمارەتەکەو ڕایگرتووە. بە ڕێکەوت
ەکاتەدا عوسمانییەکانیش گیرۆدەی ناوخۆیان بوون، هەر لەم چەرخەدا عێلی جاف
، ئێران کۆچی کردووەو خزاوەتە شارەزووورو لەسەر ڕژێمی کۆچەریی دامەزراوە.
ەپێی پەیمانی ئاشتی کە لەناوەند حکومەتی ئێران و عوسمانییدا بەستراوە لە ساڵی
١٠٤هـ - ١٦٣٩م دا، کوردستانی خوارو لە ناوەند شیعی و سوننیی دابەشکراوە،
ەرێمی ئەردەڵان و عێلانی کەڵوڕ بەتەواوی بەر ئێران کەوتووە. ناوچەی موکرییش
ووەتە دوو بەش. بەشی لای باشووریان کە شارەزوور بوو بەرعوسمانییەکان کەوتووە
ەمجا ئەمارەتی بابانی شارەزوور، واتە سولەیمانی ئیستە، کە لای سەرەوە باسکرا، لەم
ەردەمەدا بنیاتنراوە. بەڵام داخیگرانم لەبەر دووبەرەکیی و ناکۆکیی بەگزادەکانی
وای میرسولەیمان بەبە تەقەلای دامەزراندن و هێزسەندنی ئەم ئەمارەتە هیچ سەری
ەگرتووەو لە ناحەزیی ناوەندی ئێران و عوسمانییەکان قەت خێری نەدیوە.
ەگەرچی (بەکر بەگ)ی ناوبراو تینی ئەمارەتەکەی هێناوەتەوە قەوام و هەموو
سەرزەمینی شاخستانی خۆرهەلاتی ڕێگەی کفری - پردێی خستوەتە ژێرحوکمی
ئۆیەوە. جا پەلەی ئەوەی بووە کە کەرکووکیش داگیربکات. بەڵام کە چووە بەگژ والی
ەغدادا، لەشکرەکەی بەرگەی نەگرتووە، خۆی شکاوە (١١٢٦هـ ١٧١٤م) ئەمجارە بەتەمای
ێبووردن ڕوویکردووەتە بەغدا بەڵام کەڵکی نەگرتووە دەست و برد کوشتوویانە.
ەمە ئەمارەتەکەی سەرلەنوێ کزبووەتەوەو کەوتووەتە ژێر دەست حکومەتی
عوسمانی. تەنانەت سەردەمێك ئەمارەتەکە ئەمیریشی نەبووە. لەمکاتەدا
ەگزادەکانیش بێدەستەڵات بوون. لە دواییدا عوسمانییەکان بۆ ئیدارەی وڵاتەکە
چارەیان نەما لەگەڵ بابانەکان ئاشتبوونەوە. ئەمجا پلەی پاشایەتییان داهێنا بۆ
وەرای بابانەکان. ئەوەندە هەیە لە هەرای تازەی تورك و ئێرانا کە لە ئەسفەهان
ەشکریان پێکهەڵیژا تیپە سوپای بابان کە بۆ کۆمەکی عوسمانییەکان چووبوو،
ەگەرمەی شەڕا دەستی لەشەڕهەڵگرتووەو کشاوەتەوە. لەسەرنەوە سوپای
عوسمانییەکان شکاوە. بەمجۆرە خانە پاشای بەبە تۆڵەی خوێنی بەکربەگی مامی لە

حکومەتی عوسمانی کردووەتەوە. بەڵام ئەم خانە پاشایە ساڵی دوایی سەرلەنوێ چووەتەوە ژێر دەستەڵاتی عوسمانییەکان. گەلێك فەرمانی باشی لە ئازەربایجان بۆ بەجێهێناون. کەچی لەسەرئەمەشا والی بەغدا لە تەورێز بە کوشتی داوە. لەدوای بەینێك خالد پاشای برای خانە پاشا کراوە بە حاکمی بەبە. لەمکاتەدایە (نادرشا)ی ناودار لە ئێراندا پەیدابووە (١١٤٣ هـ ١٧٣٠م). خاکی بابان لەمەولا بووەتە سەرەڕێی سوپای (نادرشاه) هەمیشە بەڕێوەبووە بۆ سەرخاکی عوسمانی. هەندێك بەگزادەی بەبە هەبوون لەوکاتەدا ببوونە دەستەو دائیرەی نادرشاه. سەلیم پاشای کوڕی بەکر بەگ سەرکردەی ئەم دەستەیە بووەو لە قەڵاچوالانا جێگیرببوو. لەمەوە کۆمەلگیریکردنی ئێرانییەکان لەناو بەگزادەی باباندا پەیدابووە. بەم هۆیەوە لە ١١٦٧هـ ١٧٥٣م دا والی بەغدا بە لەشکرەوە هاتووەتە سەرخاکی بابان. لەشکری سەلیم پاشا لای کفری ڕێی لەم لەشکرە گرتووە. بەڵام چونکە دەرەقەتی نەهات خۆی شکاو ڕایکردە ئێران. ئەوسا والی بەغدا سلێمان پاشای کوڕی خالد پاشای داناوە بەحاکمی بەبە. لەدەوری ئەم سلێمان پادشایەدا ئەمارەتی بابان دیسان هێزی پەیاکردوەتەوە، سەلیم پاشا دووجار بەلەشکری ئێرانەوە هاتووەتە سەر خاکی بەبە. بەڵام هەردوو جارەکە خۆی شکاوە. ئەمجارە والی تازەی بەغداد لەباتی خەڵاتی بکا کەچی شەڕی بە سلێمان پاشا فرۆشتووە، چونکە لێینەترساوە. ئەوسا سوپای هەردوولا لای (قەشقە-شاخی حەمرین) بەگژیەکاچوون. کەچی لەشکری سلێمان پاشا شکاوەو خۆشی نەوەستاوە ڕایکردووەتە (ئێران). لەوێ شای ئێران و کوردان کەریم خانی زەند قەدری گرتووەو کردوویەتی بە حاکمی ئەردەڵان. بەڵام لەدوای بەینێك بەرەزامەندی والی تازەی بەغداد دیسان بە حاکمییەتی هاتووەتەوە قەڵاچوالان. لەسەرئەمە ئەمجا ئەحمەد پاشای برای ڕایکردووە. بەمجۆرە ئەمارەتی بەبە دیسان بۆ سولەیمان پاشا ساغبووەتەوە. بەڵام چ فائیدە؟ زۆری پێنەچووە لە قەڵاچوالان لەخەوا کوژراوە (١١٧٩ هـ ١٧٦٥م). لەدوای ئەمە لەسەر خۆخۆریی بەگزادەکان و تەقەلادانیان بۆ حوکمکردن لەسەرخاکی بابان، دووبارە هەراو هۆریا پەیدابووەتەوە، وە بەم بۆنەیەوە لە ناوەند حکومەتی بەغداو حکومەتی کەریم خانی زەندا گەلێك خوێن ڕژاوەو لە ژێرپێی

لەشکری هەردوولادا خاکی بابان پەرێشان بووە، لە جیاتی ئەم کوێرەوەریی ‌ا
مەینەتییانە بەگزادەکانی بەبە ئەوەیان پێبڕاوە کە جارو دووجار و سێ جار ببر
بەحاکم، وە دەرپەڕێنرێن لەوڵات و دوورخرێنەوە لە حوکم. ئەمانە هەمووی
لەسەردەمی حوکمی قەڵاچوالاندا روویداوەو تا مێژووی ١٠٩٩هـ ١٧٨٤م درێژەی کێشاوە
لەمکاتەدا هێزو برشتی حوکومەتی بەغدا کزبووەتەوە. بەم بۆنەیەوە بەگزادەکانی
بابان لە بەغداد قەدریان پەیداکردووە، گەلێکیان لەوێ دانیشتوون، وە بە پارەو ب
ماڵ والییەکانیان کردووە بە دۆستی خۆیان و بوون بە پشتیوانی حاکمەکانی
قەڵاچوالان و هێزسەندنی ئەمارەتەکەیان. پشتی حکومەتی بەغدا بە لەشکری بابان
و بەگزادەکانیان قایمبوو کە بیانکا بەگژ ئێرانا وە یا عەشایری یاخی عەرەبی
عیراقیان پێ تەمێ بکات. کوردەکانی بابان زۆر ئازابوون، گەلێك جار ئەم جۆر
تەکلیفانەی حکومەتی بەغدایان بەجێهێناوەو حکومەتی ئەوێیان لە تەنگوچەڵەمە
ڕزگارکردووە. سوپای بابانەکان ڕێکوپێك وپڕچەك بوو. ئەفسەرو بەگزادەی بەبە
بەجلی جوانو ڕازاوەی عەسکەرییەوە لە بەغداد بە حورمەتەوە ئەژیان. ئەمر
فەرمان و مەشقو تەربییە بەکوردی بوو. لەبەرئەوە لە عەسکەرایەتی زۆر چالاك
تێگەیشتبوون. بەڵام بەرامبەر ئەم جەوهەرو ئیمتیازە جوانانە شەڕو هەرای
ناوخۆیان وجاروبار هێنانی لەشکری بێگانە بۆ سەر وڵاتەکەیان نرخی قەومایەتی
کەمکردبوونەوە، وە هیوای پاشەڕۆژی ئەمارەتەکەیان کەوتبووە تاریکییەوە
بەکورتیی: حاکمەکانی بەبە لەبەر ناکۆکی ناوخۆیان نەیان پەرژاوە بارستی
ئەمارەتەکەیان بەرزبکەنەوەو لەولاشەوە لەگەڵ حکومەتی بەغدادیشا لەدوای
ئاشتیی، زوو تێکچوونەوە. لەبەرئەوە سلێمان پاشای والی بە لەشکری بەغداد
بەگزادە ناحەزەکانەوە هاتووەتە سەرخاکی بابان. مەحموود پاشای حاکم کە ئەمەی
دی، زانی ناتوانێت بەرامبەریان بوەستێ، وڵاتی خۆی بەجێهێشت و چوو بۆ سنە
لەسەر ئەمە سلێمان پاشای والی، ئیبراهیم پاشای برازای مەحموود پاشای کرد ب
حاکمی بابان (١١٩٨هـ - ١٧٨٣م). ئەم بەگزادە تێگەیشتووە ئەمیرێکی زیرەك بوو و
لەبەغدادا ژیابوو، پەسەندکراوی والی بوو. حەزی لە ژیانی شارستانی ئەکرد

لەبەرئەوە نەیویست لە دێی (قەڵاچوالان)دا بژی، بەڵکو ئەیویست شارێك بنیات بنێت. لەسەرئەوە هیچ نەوەستا لەجێی ئیستەدا شاری (سولەیمانی)ی بنیاتناو کردی بە پایتەختی حکومەتی بابان.

## بینای سولەیمانی ١١٩٩هـ ١٧٨٤م

شاری سولەیمانی ئیبراهیم پاشای بابان لە مێژووی ١١٩٩هـ ١٧٨٤م دا لای دێی (مەڵکەندی)وە لەگن سەرای مەحمود پاشای مامی بناغەی داناوە. هەر لەو ساڵەدا دەزگاو دائیرەی فەرمانڕەوایی براوەتە ئەوێ. مزگەوت، حەمام، بازاڕ، سەراو چەند خانوویەك بۆ ئیش وکاربەدەستی حکومەتیی تیادروستکراوە. ئەمجا گواستوویانەتەوە ئەوێ. یادگاری هەرە جوانی بابانەکانو خزمەتی هەرە پەسەندو پایەداریان بۆ کوردان دروستکردنی ئەم شارەیە. ئیبراهیم پاشاو ناوی شارەکەی بەناوی سلێمان پاشای گەورەی والی بەغداوە ناوناوە. ڕەنگیشە بەناوی کوڕەکەیەوە کە (سلێمان)ی ناوبووە ناوی نابێت. لەم سەردەمەدا یاخیگەرەکانی عەرەب بەهێزی چەکی سوپای بابانیی تەمێکراوە. بەو هۆیەوە بەگزادەی بەبەو هەندێجار حاکمەکانیان هەمیشە بەڕێوە بوون ئەچوونە بەغداو لەوێوە ئەچوونە سەر یاخییەکان. جا بەمبۆنەیەوە بابانەکان بڕوایان بەخۆیان پەیداکردبوو، تیایانا هەبوو ئەیویست حکومەتێکی سەربەخۆ پێکەوە بنێت. بەڵام ئەخۆشییە میراتییەکەیان، واتە ناکۆکییەکەی ناوخۆیان هیچ کاتێك بواری نەئەدان کە ئەم بیرە پیرۆزەیان سەربگرێت. لەبەرئەوە ئیبراهیم پاشاو عوسمان پاشاو ئەوڕەحمان پاشای حاکمانی بابان دووجارو سێ جار چوونە سەرمەسنەدی ئەمارەت و عەزلکران، والی بەغدا بە فکرێکی سیاسی هەمیشە تێکیداون و ناکۆکیی خستووەتە ناو بەگزادەکانی بەبەوە. کە یەکێکیان دانایە لەسەرتەختی ئەمارەت تاقمێکی تریان ئەکردە ئەدیمی خۆیان و بۆ تەنگانە لە بەغدا دایانئەنان. وایلێهاتبوو لە سلێمانی ببووە عادەت کە حاکمێکی بەبەی تازە ئەهات دەستەو دائیرەی حاکمی پێشوو لەشارو لەخاکی بابان ئەچوونە دەرەوە. بەڕاستیی کوردەکانی عێراق لەمکاتەدا بۆ هێز پەیدا کردنی حکومەتی بەغدا هەمیشە خوێنی خۆیان بەختکردووە. کەچی بۆ پاشەڕۆژی قەومی خۆیان تۆزێك هۆشیارییان نەنواندووە. ئەمجۆرە ڕەوشتە هەتا ١٢١٩هـ ١٨٠٤م بەردەوام بوو لەم ساڵانی دواییەدا (وەهابییەکان) حکومەتی عوسمانیی خستبووە ترسەوە. وەهابییەکان دەمیان

ژمنبووه عێراق. ئەوڕەحمان پاشای بەبە دووەمجار کەبووەتە حاکم، لە سلێمانییەوە لەگەڵ لەشکری خۆیا چووە بۆ بەغداو بەسرەو ئەحساو چووە بەگژ وەهابییەکاناو بەربەرستیکردوون. لەم هەرایانەدا لەبەر گەرما گەلێك لە کوردەکان مردوون. لەسەرئەوەشا کە گەڕاوەتەوە والی بەغدا لە جیاتی ئەوەی خەڵاتی بکات لێی تووڕە بووە. لەسەرئەمە ئەوڕەحمان پاشا یاخیبووە، خەریکبووە بانگی سەربەخۆیی هەڵبدا، بەڵام هەندێك لەخزمەکانی خۆی ئەمەیان بە هەلزانی چوونە بەغداد لەگەڵ لەشکری ئومەرای کوردی باکوری عێراقا هاتن بۆ سەر سلێمانی. ئەوڕەحمان پاشا لە پردێ (ئاڵتوون کۆپری) داویە بەسەر ئەم لەشکرەداو تارومارى کردوون. لەدوای ئەمە ئینجا والی بەغداد بە لەشکرێکی زۆرەوە خۆی هاتووە بۆ سەرسلێمانی. ئەوڕەحمان پاشا کە ئەمەی دی داوای کۆمەکی لە ئێران کرد. ئەنجامی کار لە (دەربەندی بازیان)دا هەردوولا شەڕێکی قورسیان کرد. بەگزادە ناحەزەکانی بابان لە هەردوو تەنیشتەوە پشتی سوپای ئەوڕەحمان پاشایان پێچا. لە ئەنجامی جەنگدا ئەوڕەحمان پاشا شکاو وڵاتی بەجێهێشت و چووش بۆ ئێران لە ١٢٢٠هـ. درێژە کردنی ئەم شەڕانە حکومەتی ئێرانیشی تێوە گلاندووە. لەشکری سلێمانیو بەغداد هاتووەتە (مەریوان) لەوێ لای گۆمی (زرێبار) ئەوڕەحمان پاشا بە لەشکرێکی کەمەوە عامبازیان بووە، بە ئازایی و چالاکی خۆی لەشکری دوژمنی شکاندووەو گەلێکی لەو لەشکرە بە دیل گرتووەو ناردوویەتی بۆ تاران. سەرداری لەشکری بەغدا لەناو ئەم دیلانەدا بووە ئەمجا ئەوڕەحمان پاشا بەشانازیی سەرکەوتنەوە هاتووەتەوە بۆ سلێمانی. لەسەرئەمە حکومەتی بەغداد بەناچاریی پایەی ئەمارەتی دایەوە بە ئەوڕەحمان پاشا کە ئەمە سێهەم جاربووە سەندبوویەوە. بەڵام بە فیتی بەگزادە ناحەزەکانی بەبە، والی تازەی بەغدا سلێمان پاشای لاز بیری تێکچوو. دووبارە لە بەغداوە سوپایەکی قورس رێکخراو نێرراوەتە سەر ئەمارەتی بابان. لە (دەربەندی بازیان)دا کوردەکانی بەبە بۆ پاراستنی سەربەستیی نیشتمان ئەمجارەش شەڕێکی مەردانەیان کرد. بەڵام دوژمن دەچەندانەی ئەمان بوو. خەیانەتی ناو خۆشیان سەرباز بووە. دەستەی ناحەز بەدزییەوە ئەمجارەش پشتی لەشکری ئەوڕەحمان پاشای گرت. لەسەرئەوە سەرداری بابان بەناچاریی مەیدانی شەڕی بەجێهێشت و چووە ئێران ١٢٢٣ هـ ١٨٠٨م. حکومەتی ئێران چونکە بۆ سیاسەتی بەکەڵکبوو، دووبارە لە سەر ئەوڕەحمان پاشا هاتەجواب ئەوسا والی بەغدا نەیتوانی بەرامبەر بە ئێران بوەستێت. کەڕەتی چوارەم ئەوڕەحمان پاشای کردەوە بە حاکمی بابان. لەمبەینەدا کۆڵەمەنەکانی بەغدا کەڵکەڵەی

سەربەخۆیی بۆ خۆیان هەڵی پێچابوون، والی بەغدا خۆی سەرداری ئەم بیرەبوو. لەمکاتەدا دەوڵەتی عوسمانیی زۆر کزببوو. ئەمانەش ئەیانویست خۆیان شتێك ببچڕن. ئەستەموڵ لەمەوە کەوتبووە شکەوە. (حاڵەت ئەفەندی) ناو پیاو ماقووڵێکیان بە سەلاحیەتی زیادەوە نارد بۆ ئەوە کە هەواڵی عێراقیان بە ڕاپۆرت بۆ بنووسێت. ئیشوکار وایلێهات ئەم حاڵەت ئەفەندییە لەگەڵ لەشکرێکی گەورە لە موسڵەوە چووبووە سەر بەغداد، وە لەسەر داواکردنی ئەم، ئەوڕەحمان پاشای بەبەش بە ٢٠ هەزار سوارو پیادەوە هاتەسەر کەرکوك، لەوێ یەگدگیر بوون. ئەم لەشکرانە لە نزیك بەغداد شەڕێکی قورسیانکرد، ئازایی کوردەکان شکستی بە لەشکری بەغداد دا. سلێمان پاشا ڕایکرد، بەڵام لە ڕێگا کوشتیان. لەسەرئەمە بەغداد خۆیدا بەدەستەوە. واتە تەسلیم بوو. لەدوای ئەمە حکومەتی عوسمانی ویستی وڵاتی عێراق بدا بە ئەوڕەحمان پاشای بابان، بەڵام حاڵەت ئەفەندی ئەمەی بەتەڵزگە (تەهلوکە) داناو ڕای حکومەتی تێکدا. تەنانەت لەجێی ئەم هەموو خزمەت و خەباتە کە ئەوڕەحمان پاشا کردبووی بۆیان ئەم حاڵەت ئەفەندییە ئەیویست لەناویبەرێت. بە فرو فێڵ لە بەغداد ئاژاوەیەکی نایەوە، بەدەستو بازووی سەربازەکانی بابان هەراو هەڵلاکە کوژایەوە. ئەمجا حاڵەت ئەفەندی خۆی لە ترسانا عێراقی بەجێهێشت و گەڕایەوە ئەستەموڵ. حکومەتی بەغدا بە بازووی سوپای ئەوڕەحمان پاشا ڕاگیرابوو. ئەم تۆزە دەستدارییە خەیاڵێکی تازەی بەحاکمی بابان دابوو، ئەیویست هەولێریش بسێنێ بۆخۆی، بەڵام لەلایەکی ترەوە چونکە حکومەتی عوسمانیی کزببوو، حکومەتی ئێران خۆی لەئەوڕەحمان پاشا زویرکردبوو. بەرامبەر بەم گۆڕانی سیاسەتە پێویستبوو ئەوڕەحمان پاشا عاقڵانە هەڵسوڕێت و لەگەڵ لایەکا بە دۆستی رابوێرێت. کەچی پاشا پێچەوانەی ئەمەیکردووە، دڵی والی بەغدای ئێشاندووە. لەسەرئەمە والی بەغداد بێ زانینی حکومەتی ئەستەمبوڵ، هەر بۆ ئەوەی ئەوڕەحمان پاشا بشکێنێ، لەگەڵ حکومەتی ئێرانا یەکیگرت، هەردوولا لەشکریان نارده سەرخاکی بابان، بەرامبەر ئەم گەلە کۆمەکییە ئەوڕەحمان پاشا خۆی پێنەگیرا، رایکردە کۆیە، لەشکری ئێران شوێنی کەوت. ئەوسا والی بەغدا لە چەوتیی بیری خۆی گەیشت و بایدایەوە، تەنانەت ڕاسپێریی عەشایرە کوردەکانی ئەوناوەی کرد واز لە ئەوڕەحمان پاشا بێنن، بەڵکو لەسەری بکەنەوە. ئەمجا ئەوڕەحمان پاشا هۆشی هاتەوەبەر وخۆی دەستیکرد بەخۆگرتن بە جۆرێکی وەها ئێرانییەکانیش لە دڵگۆڕینی والی بەغدا گەیشتن (١٢٢٦هـ ١٨١١م). لەسەرئەمە شازادە محەمەد علی میرزای سەرداری ئێران داوای لە والیی

بەغدا کرد کە خالد پاشای بەبە بکرێت بە حاکمی سلێمانی و ناوچەی حەریرو کۆیەش بدرێ بە ئەوڕەحمان پاشاو هەراکە ببڕێتەوە. بەڕاستی هەراو زمناکەش هەروا بەوجۆرە بڕایەوە. ئەم جۆرە کردەوانە تێماننەگەیەنێ کە پیاوی دەوڵەتی ئەوکاتە بڕشتی ئیداری و سیاسییان زۆر ناتەواو بووە. هەرسێ تاقمەکەی لای سەروو بەرژەوەندیی (مەصلەحەت)ی دەوڵەتەکەی خۆیانیان نەزانیوە بەجێبێنن؟ لە هەموو لەلایەك زیاتر بابانەکان بە ختوخۆڕایی و هەرلەبەر ڕقەبەرێی ناوخۆ یارمەتی بێگانەیانداوەو نیشتمانیان کردووە بە پێخوستی بێگانە. ماڵو ئازادی میللی خۆیان لەدەستداوە. ڕقی حوکمکردن بە جۆرێك کاری لێکردوون کە هیچ غایەیەکی گشتی و قەومایەتی تریان لەبەرچاو نەماوە. ئەوڕەحمان پاش بەمجۆرە ئاشتییە ڕازیی نەبووە. کارێکی وایکرد والی بەغدای ئاشتکردەوەو جاری پێنجەم بووەتەوە بە حاکمی بەبە. ئینکار ناکری ئەم سەرداری بابانە زیرەکو وریاو زۆر ئازا بووە. سەودای سەربەخۆیی هیچ دەمێك لە کەللەی نەچووەتە دەرەوە. ئەم هەموو تەقەلایەی بۆ ئەوە بوو کە ئەمارەتەکەی بکات بە حکومەتێکی ڕاستەقینەو سەربەخۆ. بەلاّم ئە بەگزادەکانی تری بەبە نرخی ئەم بیرەیان زانیوەو نە کۆگای خەڵکی بەبەش ئەوەندە بیرڕووناکبوون کە ڕێی ئەم حاکمە بیربەرزەی خۆیان بگرن و گشتیان پشت بدەنە پشتی، تا کاری خێری سەربەخۆیی ئەگەیەننە ئەنجام. بێجگە لەمە خەیانەت و دووڕوویی خزمەکانی و فێلْ و فەرەجی والییەکانی بەغداو ئومەرای ئێران و بەد هەڵکەوتنی جوغرافیایی ولاّتەکەش ببووە دوژمنی ئەم سەربەخۆییە. لەبەرئەمانە ئەوڕەحمان پاشا کە بووەوە بە حاکمی بابان و لە سلێمانی دامەزرایەوە، ئەمجا ئێرانیکرد بە دۆستی خۆی پەلاماریدا هەولێری داگیرکرد تەنگی بە کەرکوکیش هەڵچنی. لەسەرئەمە والی بەغدا کەوتە مەترسییەوە، لەشکرێکی زوربەی هەلگرت و هات بۆسەر سلێمانی. لەملاشەوە ئەوڕەحمان پاشا بە سوپای بابانەوە ڕووی کردووەتە بەغدا، لە کفری هەردوو لەشکر تێکئالاّن. ئازایی و بەجەرگیی سوپای بابان لەشکری بەغدایی شپرزەکرد. دەستەی کۆڵەمەن و پیادەکانیان شکاند. سوارەی کورد خەریك بوو پشتی دوژمن بگرێت، بەلاّم ئاگری تۆپخانەی دوژمن لەمساتەدا بووتە هۆی کوشتارێکی زۆر لە سوپای بابان. ئەم کارەساتە هێرشەکەی وەستاندووە. گەلێك بەگزادەی بابان و پیاوماقوولْ و ئەفسەران لەمکاتەدا کوژراون. هەر لەودەمەدا ئەوڕەحمان پاشا لە باتی خەریکی ڕزگاربوونی لەشکرەکەی بێ کەچی کەوتووەتە سەودای ڕزگارکردنی گیانی خۆی لەگەلْ چەند سوارێکا ئەو لەشکرە ئازایەی

بەجێهێشتووەو چووە بۆ ئێران. بەڕاستیی ئەم کردەوەیەی دوایی ئەوڕەحمان پاشا پێچەوانەی دەستوورو ڕەوشتی قوماندارێتیبوو. لەدوای ئەمە سوپای بابان تەفرو توونا بووە، تا ئێرە سێ جار خالید پاشاو پێنج جاریش ئەوڕەحمان پاشا ببوونە حاکمی سلێمانی. پەنا بردنی ئەمجارەی ئەوڕەحمان پاشا هەلێکی تازەی دایەوە بە ئێران کە لە خاکی جوانی باباندا دەستەڵاتیان تازە ببێتەوە بەوهۆیەوە ئێران دەستیکرد بە شەڕفرۆشتن بە حکومەتی عێراق، بەڵام بۆ ئەوەی شەڕ دانەمەزرێت حکومەتی عێراق بە تەکلیفی ئێران ڕازیبوو. جاری شەشەم ئەوڕەحمان پاشای کردووەتەوە بە حاکم لەسەر وڵاتی بابان لە ١٢٢٨هـ - ١٨١٢ زایینی دابەڵام ئەوڕەحمان پاشا لەمەودوا ئەوەندە نەژیاوە لە دوای ساڵێك مردووە. بەڕاستی ئەم سەرداری کوردە یەکەمین زرنگ و ناوداری بابانە، بەدبەختیی خۆی و وڵاتەکەی مەیدانی نەداوە بە هیچ ناواتێك بگات. ئەوڕەحمان پاشا تێکڕا ٢٤ ساڵێك حاکمییەتی کردووە. حاکمێکی زۆر دینداربووە، قەدری شەریعەتی ئیسلامی گرتووە، زانستی و زانایی زۆرخۆشویستووە. هۆشی قەومایەتی نێجگار بەرزبووە. لەدوای ئەوڕەحمان پاشای گەورە مەحموود پاشای کوڕی بووەتە حاکم. لەم مێژووەوە ئەمارەتی بابان ٣٩ ساڵی تر ژیاوە. بەڵام نەك ژیانێکی وەك جاران، بەڵکو لە جاران گەلێك بێهێزتر ژیاوە. لە بەگزادەکانا ئێرێتی و ئازایەتی قەومایەتی جاران نەماوە، بەڵکو هەموو ناواتیان هاتووەتە سەر ئەوە کە حوکم بەدەستی خۆیانەوە بێت نەك بە دەستی ناحەزیانەوە. بیری سەربەخۆیی وەیا کوردایەتی لەکەللەیاندا نەماوە. سەیرنەوەیە هەموو پێیان لە چەوتیی ئەم حاڵەتە ناوە، کەچی ڕێگای ڕزگاربوونیان نەدۆزیوەتەوە. لەم سەردەمەدا لەبەر دەستەڵات زیادیی ڕووسەکان هێزی حکومەتی عوسمانی لە جاران زۆر کەمتر بووەتەوەو هەر لەبەرئەوە حکومەتی بەغدادیش وەك جاران بەرامبەر ئێران هیچی پێ نەئەکرا. بە کورتی نشوستییەکی گشتی پەیدا ببوو. ئێرانییەکانیش تینی جارانیان نەمابوو، بەڵام هێشتا لە عوسمانییەکان چاکتربوون، وە هەر لەم سەردەمەدا وڵاتی بابان بەنەخۆشیی تاعوون و ڕشانەوە زۆر شپرزە بووە. ئینجا لەبەر ئەم هەموو هۆیانە ئەمارەتی بەبە نرخی جارانی نەماوە. مەحموود پاشا حاکمێکی زۆر ژیرو تێگەیشتوو ولەسەرخۆ بووە. ویستوویەتی خاکی بابان بەمەردیی ئیدارە بکاو بەرزیکاتەوە. بەڵام ئەم گیانپاکیی و دەروون چاکییەی بۆ نەئەچووە سەر چونکە سیاسەتی وەخت دوو ڕوو بوون خزمەکانی خۆیشی لەو سیاسەتە دووڕووتربوون. لەبەرئەوە هەموو گێرۆدەی دووڕووییەکە ببوون کە بۆ ئەنجام خراپیی ئەمارەتەکە

ئەمە لە هەموویان کوشندەتر بوو. حکومەتی بەبە لە ناوەند مەحموود پاشاو عەبدوڵڵا پاشاو سلێمان پاشادا کەوتبووە گێرەوە. ئەم ئەهات ئەو ڕاینەکرد. یەکێکیان خەریکی دامەزران بوو، ئەویتریان بە لەشکری بێگانەوە ئەهاتە سەری. بەکورتی مەحموود پاشا تا دوا ڕۆژ دڵسۆزی ئێران بووە، زۆرجار لەگەڵ پاشا کوێرەی ڕەواندوزیشا بەشەڕهاتووە، جا بەم هەراو زرمە زلێیانە ئەمارەتەکە ئەوەندە وێران بووە زیانی ماڵ و گیان نەئەهاتەوە حیساب. بەڕاستی خاکی بابان لەکیس نومەرای بابان چووبوو. دەستەڵات و حوکم ڕەوایی کەوتبووە دەست ئێران و بەغداد ئەو موڵکە پڕ خوێنەی بابان کە جاران سەری لە بەغداد تێکدا بوو ئێرانیشی نەسڵەماندەوە ئیستە بەدەست چەند هەزار عەجەمێکەوە دامابوو لەوکاتەدا کە سلێمان پاشا حاکم بووە هەرای (حەمە شەریف هەمەوند) پەیدا بووەو سلێمانی پێچاوەتەوە. ئەم سلێمان پاشایە لەسەر حوکم ماوە تا مردووە، ئەوسا أحمد پاشای کوڕی چووەتە جێی لە ١٢٥٤هـ ١٨٣٨م دا. ئەم ئەحمەد پاشایە زۆر زیرەك و هۆشیار بووە. ویستوویەتی حکومەتی بابان بژێنێتەوە، لەشکرێکی بچووکی بە تۆپخانەوە پێکەوەناوە، بەڵام حکومەتی بەغداد لەم تارەکاتە کەوتووەتە مەترسییەوە. ئەمجارە والی بەغداد ویستوویەتی بەیەکجاری ئەم ئەمارەتە ناساغە لەناوبەرێت. بۆیە بەلەشکرەوە بەسەرکۆیەدا چووەتە سەر سلێمانی. سوپای سولەیمانییش بۆ شەڕکردن چووە بە پیریەوە. کەچی لەدوای ئەوە ئەم لەشکرە بێ شەڕکردن بڵاوەی لێکردووە ئەوکاتە ئەحمەد پاشا ڕایکردووە بۆ ئێران و لەوێوە چووە بۆ ئەستەمبوڵ. ئەمجا عەبدوڵڵا پاشا کراوە بە قائیمقام نەك بە حاکم، وە لە دوای چوار ساڵ بانگکراوەتەوە بەغداو نێراوە بۆ ئەستەموڵ وە پاشایەکی تورکیان لەجێی ئەو لە سلێمانی داناوە بەمجۆرە ئەمارەتی بابانی سلێمانی لە دوای حوکمڕانییەکی دوو سەد ساڵیی گیانی بە ئیستیعمار سپاردووە.. (١٢٦٧ هـ - ١٨٥١م)[1].

## شارستانیەتی وڵاتی بابان:

لەلایەن هەواڵی ناوخۆیی ئەمارەتی بابانەوە هەتا ئێرە گەلێك باس نوسراوە قسەمان لەهەواڵی ئەهالی و تەبەقەی ماقوڵانی قەومەکە کرد کە چەندە ناحەزی یەکبوون و چییان بەسەریەکتری هێناوە، پیاو کە کردگاریان ئەگێڕێتەوە ماتەمێنی

---

[1] هەموو باسەکانی جزمی دووەم.

نەیگرێ. هەر زانای وەك (مستەر ریچ)و (مستەر لۆنگریك)و (فرازەر) كە لە کوردستانی بابانا بەساڵەها ژیاون، نەزانن ئەمانە چییان بەسەرهاتووە چونکە بۆ ئەم مەبەسە زۆریان نوسیوە. کەسێك گەردشەکانی ئەم زانایەنەو مێژووە جوانەکەی (تەئریخی سلێمانی) ی ئەمین زەکی بەگ بخوێنێتەوە لەمەینەتی ئەهالی و ماڵوێرانی و بەدبەختی وڵاتی بابان ئەگات. ئەوانەی هەوەسی موتاڵایان زۆرە با ئەونوسراوانە بخوێننەوە بەڵام تەنیا ئەوەشم بە پێویستزانی لێرەدا تۆزێك لە چەندوچوونی هەواڵو جوغرافییاو کشتوکاڵو پیشەسازیو ئابووری وڵاتی بابان بدوێم. وڵاتی بابان کە ناوچەیەکە لە کوردستان سەرزەمینێکی کەژو کێودارو ئاودارە، سروشت هەموو چاکییەکی پێبەخشیوە. بۆ کشتوکاڵ مانەندی نییە. بە ملیۆنەها مەردوم ئەژێنێت. هەموو جۆرە دەغڵودان و کشتوکاڵی زستانەو هاوینەی تیا ئەکرێت وەکو پەموو، تووتن و مەرەزەو دارو درەختی میوەدار بەرهەمئەهێنێ. بەڵام لەبەر نائەمینیی و ڕەفتاری جەنگی ناوخۆ ئەم خاکە جوانە ئەوکاتە وەك چۆڵی لێهاتووە. وەهەرلەبەرئەوە بۆ پیشەسازییش ئەهالییەکە مەیدانی نەبووە. لەبەرهەراوزەنا کێ توانیویەتی دابنیشێت تەونو جۆلایی تیابکات. بۆ لەبەرکردن ئەگەر فریاکەوتبن بەجۆلایی لە خوریی و لە مەرەزە شاڵیان ئەکردو لە دەزووی لۆکەش جاویان ئەکرد. بەڵام لەبەر زرمەزلێ و هاتوچۆی شەڕکردن بازرگانی و کاسبیی پەکیکەوتووە لەسەرئەوەشا ئەختێك دەرفەت بووبێت میوەیان پێگەیاندووە لەوڵاتی کەرکووك فرۆشتوویانە.

### بێینەوە سەر جوغرافیای وڵاتەکە:

خاکی بابانو سنوورەکانی لەبەر شەڕو هەرا هەمیشە گۆڕاوە. خاکی (کفری) سنووری باشوری وڵاتەکە بووە. زەنگەنەو زەندو ناوچەی چەمچەماڵو سەنگاو و شوان و قەڵا سێوکەو هەموو سەرزەمینی لیوای سلێمانی ئیستەو جوانرۆو تا ڕووباری سیروان و لای ڕۆژاوا تاکو زێی بچووك و قەرە حەسەن و بەرێکەوت زەنگا باد و مەندەلی و بەدرەو جەسان و پردێ و هەولێر کەوتۆتە ژێرحوکمی بابانەوە و لە

همنگامی خانه پاشادا ناوچەی سنەشیان بەدەستەوە بووە جا بەمجۆرە هەواڵی هەشت حکومەتە سەر بەخۆکانی کورد لێرەدا تەواو بوو[٢].

## لەدوای بێهێزیی خەلافەتی ئیسلام هەواڵی کوردو کوردستان

**١- کورد لە سەردەمی بۆیەهییەکانا: لە ٣٣٠هـ تا ٤٤٧هـ (٩٤١ - ١٠٥٥م):**

کاتێك کە عەبباسییەکان بێدەستەڵاتبوون، نەتەوە موسڵمانەکان دەستیانکرد بە تەقەلادان بۆ سەربەخۆیی. هەوەڵ کۆ ئەم جووڵەیە لەئێرانا پەیدابووە، چونکە لەناو هەموانا نەتەوە کۆنەکانی ئێران بۆ ئەهات. یەکێ لەو نەتەوانە (بۆیەهی)یەکان بووە (٣٣٠هـ). پادشاکانی بۆ زیندوو بوونەوە ئازادیی ئێران و سەربەخۆیی جارانیان کسپەیان لێوەهاتووە، ئەمانە ویستوویانە هەموو کیشوەری ڕۆژهەڵاتی عەبباسییەکان بخەنە ژێرچنگی خۆیانەوە. لەبەرئەوە دەستیان لە شەڕ هەڵنەگرتووە تا هەموو ئێران و عێراقیان داگیرکردووە. مسکێنی هەرە زۆری ئەو حکومەتە کوردەکان بوون کەوا سەرۆکەکانیان ئەیانویست بە سەربەخۆیی بژین. ئەوەبوو لە ئازربایجانا سەردار (مەرزەبان) خەریکی دامەزراندنی حکومەتی (ڕوادی) بوو ٣٣٢هـ وە (شاباز) شای دۆستەکیش لە دیاربەکردا خەریکی پێکەوەنانی حکومەتی (دۆستەك) بوو (٣٧٠هـ) هەروەها میرحوسنەوییش لەناوچەی شارەزوورو کرمانشای ئێستەدا خەریکی پێکهێنانی حکومەتی (بەرزیکانیی) بوو (٣٥٠هـ). ئەم حکومەتی کوردە بە درێژایی ژیانیان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان بەگژ حوکمدارانی بۆیەهیدا چوون. کە تەنگەتاوبووبن مسکێنێتییان کردوون و لە هەلکەوتا بایانداوەتەوەو بوونەتەوە بە سەربەخۆکەی جاران. مەلیکەکانی حەمدانی موسڵ و حەلەبیش لەمساتانەدا لە کوردستانەکەی دەوری خۆیانا خەریکی ئەوەبوون کوردەکان بخەنە ژێرچنگی خۆیانەوە. (٣٥٤هـ) لە ساڵی (٣٦٩هـ ٩٧٩م)دا کوردەکانی شارەزوور بۆ بەرژەوەندی یەکتری لەگەڵ عەشرەتی (بنوشیبان) ی عەرەب کە لەوناوچەیەدا دامەزرابوون

---

[٢] هەموو باسەکانی جزمی دووەم و چەرخی سەربەخۆیی مێژووی نەتەوەی کورد لەمێژووی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ وەرگیراوە.

یەکیانگرتبوو. (عضد الدولە)ی پادشای بۆیەهی لە بەغداوە لەشکری ناردوونەتە سەر. عەرەبەکانیان بۆ ناو چۆڵی عەرەبستان دوورخستۆتەوەو، کوردەکانیشیان بێدەستکردووە. لە ٣٨١ه دا لەشکری ڕۆم کە هاتبووە سەر سوریە (احمد کوڕی فحان) ناو سەردارێکی کورد شکاندوونی و ولاتەکەی لەم دین دوژمنانە ڕزگارکردووە. لەم چەرخەدا واتە لە ٣٨٠ه ٩٩٠م دا حکومەتی (بنوعیاز - عیار)ی کورد لە (شارەزووورو ماهیدەشت) دا پەیدابووە. سەربەخۆ وە نیوە سەربەخۆ (٧٠) ساڵێك ژیاوە ٤٥٢ ه ١٠٦٠م.

بەکورتی، کوردەکان لە هەنگامی حوکمی بۆیەهیدا لە شۆڕشەکانا چنگیان گیڕاوە. مەرامیشیان ئەوەبووە کە دەستەڵاتی بۆیەهییەکان کزبکەن و دەستەڵاتی خۆیان بەرزبکەنەوە. لە ساڵی ٣٩٧ه ١٠٠٧م دا لەشکری بۆیەهی چووەتە سەر کوردەکانی (بەندەنیجان)، بەڵام لە مەیدانی شەڕا بۆیەهییەکان خۆیان شکان و گەلێك تالان دەست کوردەکان کەوت لە ساڵی( ٤١١ه ١٠٢٠م) یشا کە تێپە سوپای تورکی (شمس الدولە)ی بۆیەهی لە هەمەدان یاخیبوو بە سایەی بازووی لەشکری کوردەوە ئەو تورکە یاخییانە لەناوبراون و فیتنەکەیان کوژاندووەتەوە.

**لەسەردەمی هەڵمەتی تورك و مەغۆلدا:**

**٢- کورد لە کاتی تورکەکانی سەلجووقیدا ٤٣٢ه تا ٦٠٦ه**

ئەوانەی ڕوانیویانەتە مێژووی ئیسلام، تێگەیشتوون کە شەوکەت و شانی ئیمپراتۆریەتی عەباسیی ڕاستەوخۆ تورکەکان لەناویانبردووە. لە تورکستانی دیمەرۆکەوە جاروبار عێلاتی تورك ڕوویکردووەتە وڵاتە ئاوەدانەکانی ئیسلام. ئەمانە لەدوای دەرفەتێك سواری حکومەتە مەحەللییەکان بوون و داگیریانکردوون. بە هەڵمەتی ئەمانە وەك خەلافەتی عەبباسی لە تینی حوکمڕانێتی کەوتووە سەربەخۆیی کوردەکانیش نشوستی هێناوە. ئێمە لێرەدا تەنیا باسی هەواڵی پاش ئیسلامییەت ئەکەین. عێلاتی (غەز - ئۆغۆز)ی تورکمان پێشڕەوی سەلجووقیەکان بوون. ئەوەبوو لەباسی حکومەتی (ڕوادی)و (دۆستەکی)دا خراپەی ئەم عەشرەتە وەحشەمان دی، کە بە زۆری زووی عێلاتی کورد پێشانی ئەمانە گیراو کوردستان

لەبەربادبوون ڕزگارکرا. بەڵام دیسان خراپەی ئەمانە کاریکردبوو، تینی لەنەتەوەکانا نەهێشتبوو (٤٢٠ هـ ١٠٢٩م) و لەساڵی ٤٦٣هـ ١٠٧١ م دا کە ئالپ ئەرسەلانی پادشای سەلجووقی لە شەڕی (مەلازگرد)دا سوپای ڕۆمی شکاندو ئیمپەراتووری بیزانس (ڕۆمانۆس)ی بەدیلگرت بەرەبەرە هەموو کوردستانیشی داگیرکرد. بەمە گشت حکومەت و ئەمارەتەکانی کوردی ئەوحەلە بووەتە مسکێنی دەوڵەتە گەورەکەی سەلجووقی. کوردەکان وەکوو بوونە مسکێنی سەلجووقییەکانۆ و لەگەڵیشیان ڕاهاتن سەربەستی عەشرەتییەکەیان بۆمایەوە. سەلجووقییەکانیش لەگەڵیانا بەنەرمیی و موداراکردن ڕایانبواردووە. تەنانەت وتەی (کوردستان) لەوکاتەدا (رسماً) بەکارهێنراوە. هەرچەندە داگیرکردنی کوردستان لە لایەن تورکەکانەوە نەگبەتییەکی گەورە بووە بۆ کورد، بەڵام لەسەرئەوەشا چاویان نەشکاوە. تینی نەتەوایەتییان ئەوەندە قایمبووە بەمانە ورەیان بەرنەداوەو لە هەلکەوتا بۆ ڕزگارکردنی ئازادیی و مافی خۆیان و سەندنەوەی سەربەخۆیی خۆیان هەوڵیانداوەو تۆڵەیان لەناحەز کردووەتەوە. کورد قەت بەتەواوی گیرۆدەی حوکم و هێزێك نەبووەو لە سەدەی ١١ و ١٢ هەمی زاینیدا دووبارە وریابووەتەوە. لەگەڵێك شەڕو هەرادا ئازایی و نەبەزۆکی خۆیان نواندووەتەوە. پادشاکانی تورك لە کاتی تەنگانەدا ناتاجی یارمەتی کوردەکان بوون لە (٤٩٦هـ ١١٠٢ م. ٥١٠- ١١١٦م) لەگەڵ جێگادا (مەلکیشا)ی سەلجووقی و جێنشینەکانی لەڕاو تەدبیری ئومەرای کورد قازانجیان دیوەو بە یارمەتیی و پشتیوانیی سوپای کورد هێزی حکومەتەی خۆیان پێراگیرکراوە.

**٣- کورد لەکاتی ئەتابەگەکانا (باوکی گەورە) ٥٢١ هـ ١١٢٧م – ٦٢٢هـ ١٢٢٥م**

بەشی زۆری ئەم ئەتابەگانە لە ناوچەکانی کوردستانا حکومەتیان دامەزراندووە ئەوانەی ئەمجۆرە حکومەتەیان دامەزراندووە پیاوماقوولۆ و لەلەی شازادەکانی سەلجووقی و خولامەکانیان بوون. لە پێشا پادشاکان بۆ ئیدارەکردن ئەمجۆرە پیاوانەیان ناردووەتە وڵاتەکان. ئەمانە وردە وردە لەوێ دەستەڵاتداربوون، ئینجا لە مسکێنایەتی پادشاکان دەرچوون، لە ئەنجامی کارا پادشاکان چاریان نەماوەو لە گەڵیانا ڕێکەوتوون. جا ئەمجۆرە حوکمڕانە لە ئەوروپاوە دەستپێکردووەو بە هەموو

ولاتی ئیسلامیشا بلاوبووەتەوە. لە مێژووی گشتییدا ئەمە سەردەمێکی تەئریخییە بەسەردەمی (دەرەبەگی) ناوبانگی ڕۆیشتووە لەولاتی ئیسلاما گەورەو بچووك حکومەتی وردەڵەی وەها زۆربووە. هەموو ولاتی تورك و کوردو عەرەبی گرتووەتەوە جا لێرەدا تەنیا باسی ئەوانە ئەکەین کە لە کوردستانا دروستبووە وەکو:

عمادالدین زەنگی: یەکێکە لەوجۆرە حاکمانە (ئەتابەگی زەنگی) عینوانی حکومەتەکەیەتی ئەم کابرایە ویستوویەتی لە کوردستانا حکومەتێکی گەورە دروست بکات. ئینجا هاتووە لە ولاتاکانا لەشکری گێڕاوە. لە سالی ٥٢٨ ھ - ١١٣٤ م دا چووتە سەر ناوچەی (بۆتان) شاری (تانزا)ی داگیرکردووە، لە دواییدا ڕوویکردوەتە (دیاربەکر) شارەکەی پێچاوە بەلام بۆینەگیراوەو لەشکرێکی تری ناردووەتە سەر عێلی حەمیدی کورد گەلێك قەلاو شاری لێداگیرکردوون (شووش)و (ئاکرێ - عەقرە) لەو قەلایانەبوون. ئەمەشی بۆیەکرد چونکی سەرداری ئەم عەشرەتە لە دژی عماد الدین یارمەتی خەلیفەی بەغدادیداوە. عمادالدین لە ٥٣٧ھ ١١٤٢م دا پەلاماری ئەمارەتی کوردی هەولێریشیداوە. لای عەمادیە قەلای (ئاشیب)ی گرت و وێرانیکردووە. گەلێك پیاوماقووڵو ئاغاواتی کوردی کوشت لەم هەڵمەتانەیانا. ئەمجا ڕوویکردووەتە ناوچەکانی (هەکاری)و (زۆزان) گەلێ قەلاو شاری ئەوناوەشی گرتووە.

شۆرەت وایە لەم سەردەمەدا لە جێگای قەلای (ئاشیب)ی کۆن بە ناوی خۆیەوە قەلای (عمادیە - ئامێدی)ی دروستکردووە، بەلام ئەلێن ئەم ناوە لەناوی (ئامادی - امیدی)یەوە هاتووەو ناوەکە کوردییەو زۆرکۆنترە. عمادالدین لە ٥٣٤ ھ ١١٣٩م دا ڕوویکردووەتە شارەزوورو گرتوویەتی، وە لە دوای سێ سالێ هەڵمەتی بردووەتە سەر کیشوەرەکانی (بۆتان)و (سعرد)و چووەتەسەر (ئامەد)و (ماردێن) شارو قەلای ئەهێشتوون هەمووی زەوتکردووەو تاکو لە کاتی پێچانەوەی (فنك) دا بەسەریا مردووە لە ٥٤١ھ ١١٤٦م دا. لەم دەورەدا خەلیفەکانی عەبباسی بۆ شکاندنی شەوکەت و دەستەلاتی تورکەکان لەشکری کوردییان بەکارهێناوەو کوردویانن بە گژیانا. لەم سالانەدا لە میسر بناغەی ئەیوبیی کورد دانراوە (٥٦٩ھ - ١١٧٣م) کەوا لە باسی حکومەتی ئەیوبییدا دوورو درێژ قسەی لێکراوە. هەروەك ئەتابەگەکانی موسلْ

کەوتوونەتە گیانی کوردەکان و سەربەخۆییان نەهێشتوون، حوکمدارانی ئەیوبیی کوردیش تۆڵەیان لەم زەنگییانە کردوومتەوەو لە ناویانبردوون. لەسەدەی حەوتەمی کۆچییدا حکومەتی (ئازیزان)ی کورد لەناوچەی جزیرەدا پەیدابووە، هەتا پەیدابوونی دەوڵەتی عوسمانی پایەدار ماوە. لە( ٥٨١ ھ ١١٨٥م )ەوە کوردو تورك بەینیان تێکچووە لە سوریەو کوردستان و ئازەربایجانا کردوویانەتە شەڕێکی میللی نەوتۆ هەردوولا تووشی زیان بوون. تەنانەت ئەرمەنییەکان ئەو ڕووداوەیان بەهەل زانیوە لێیان ڕاپەڕیون تاکو پەرێشانیان بکەن. لەسەرئەوە هەردوولا لە ترسان بەناوی ئیسلامییەتەوە ئاشتبوونەوە. بەڵام لەسەرئەوەی حوکم بە دەست کاملاو بێت دیسان تێکهەڵچوونەوەو خوێنی یەکتریان ڕژاندووە. کوردەکان بەناچاریی هەندێ جێگای (سوریە)و (ئەدەنە) یان بەجێهێشتووە. لەناوچەی (موسڵ)یشدا ئەم جەنگە میللییە پەیدابووە .

بەکورتی: لە مێژوودا ساغبووەتەوە کە کوردەکان هەمیشە لەگەڵ تورکەکانا لە شەڕدا بوون. کەچی لەگەڵ ئەرمەنیی و (فەلەکان)ی تردا کە دین دوژمنیش بوو، بەم پێیە ناکۆك نەبوون. بەڕاستیی بۆئەوەی حوکم بە دەست کاملاوە بێت ئەم دو نەتەوەیە لەگەڵ یەکا هەمیشە لە ڕقەبەرییدا بوون، تاکو لە سەردەمی عوسمانییەکان بە تەواوی ساغبووەتەوە حوکم کەوتووتە دەست تورکەکان. هەر بەبۆنەی ئە ناخۆشییانەوە کوردەکانی ناوچەی موسڵ‌و ئامێدی لە ٦١٩ھ ١٢٢٢م دا داویانەتە کۆمەکی موسڵ‌و تورکەکانیان لەوناوە دەرکردووە ئەمجارەش کوردە بەدبەختەکان بوونە ژێردەستە و مسکێنی موسڵاوییەکان. لەسەر ئەم هەموو ناسۆرانەدا ساڵی ٢٢ ھ ١٢٢٥م سروشتیش لە کوردستان تووڕە بووە. بە بوومەلەرزەو باوبۆران و قات قڕیی نیشتمانەکەی کورد وێرانبووەو بە هەزاران گیانی بێچارەی تیا لەناوچووە لەدوای ئەمەش سەلجووقییەکانی ئەنادۆڵ داویانە بەسەر ناوچەی دیاربەکرا زەرەر زیانێکی زۆریان پێگەیاندوون و خوێنیشیان ڕشتوون.

### ٤- کورد لەکاتی خوارەزم و ئیلخانی مەغۆلدا: ٦٢٢هـ-٧٨٥هـ=١٢٢٥م -١٣٨٢م:

خـوارزم سـەرزەمینێکە لـە تورکستان لای گۆمـی ئـۆراڵ. بـەم نـاوەوە لـەوێ حکومـەتێکی تورکی شیعی پەیدابووە، پادشاکەیان سـوڵتان (محەمـەد عـلاء الدیـن تـەکش)ی خوارزمـی نـاوبووە. ئـەم مەلیکـە لـە ٦١٤هـ ١٢١٧م دا لەشـکرێکی زوربـەی ناردووەتەسەر خەلیفەی عەبباسی عیراق، چونکە ڕقەبـەریی یەکتریان ئەکرد. ئەمە بە ئەنجام بووەتە بەربەرەکانێ لەناوەند شیعەیەتیی و سوننیەتییدا. جا کوردەکانی کـەژوکێوی زاگـرۆس بـەهۆی ئـەم بەربەرەکانێیـەوە تووشـی تـاڵان و بـڕۆی ئـەم خوارەزمییانە بوون بەسەروماڵەوە تیاچوون بەرەکەتدا لەشکری ئەمان کە چووەتە سەر عێراق، لەبـەر سەرماوسـۆڵە لای کرماشـان پەرێشـان بـووە، ئەوسـا کوردەکـان تاویانداوەتە سەر ئـەم لـێقەوماوانە. ئەمـە پێش ئەوسـەردەمە ڕوویـداوە کـە سوپای جـەنگیزخانی مـەغۆل وەك بـەڵا ڕوویکردووەتـە سـەر زەمینـی خـوارزم و هـەموو وڵاتەکانی ئیسلامی یەك لە دوای یەك داماڵیوە، لە پاشا جلال الدینـی کوڕی سـوڵتان محەمەد بە لەشکری شکستەوە زۆر بەپەرێشانی ڕایکردووەتە ئەفغان و هیندوستانو لـەوێوە بایداوەتـەوە بـۆ ئێران و ڕوویکـردووە بـۆ عـێراق. لـە ڕێگا دەستیکردووە بـە تاڵانو وێرانکردنی (هەمەدان، کرماشان، بـەدرە، بەعقوبـە، تـاوغ) وە ئەهالییەکەشـی کوشتووە، چونکە خـەڵك نەینەوێرا چەك هـەڵگرێ و لەسـەر جلال الدین بکاتـەوەو بچێـت بـەگژ سـوپای جـەنگیزخانا. کوردەکـانی هـەولێر کـە دڕندەیـەتی لەشـکری خوارزمیـان بـەمجۆرە دی، لـە تـاوا بـە بیرلەشـکرەکانیانەوە چـوون و گیـانی خۆیـان پاراستووە. کەچی لەسەر ئەوەشا جلال الدینی خوێنخوار ڕوویکردووەتـە ئازەربایجان و مەراغـەو تـەورێزو داگیریکردوون (٦٢٢هـ ١٢٢٤م) وە لـەوێوە چووە بـۆ گورجسـتان، ئەمجا بایداوەتەوە بۆ کوردستان، کە دووبارە تاڵانی بکات. بەڵام کوردەکـانی (خـێلات) مەردانە گێڕاویانەتەوە. لەسـەرئەوە چووە بـۆ لای (عمادیـە)و (زۆزان) بـە شـەڕکردن وڵاتـی ئـەو کوردانەشـی تـاڵان و وێرانکـردووە. سـەرەڕای ئەمانـە لـە (٦٥٦ هـ ١٢٢٩م)دا جلال الدین لە (خێلات -- ئـەخلات)ەوە هەڵمەتەکـەی دووبـارە کردووەتـەوە ئـەمجارە بەلای (مووش)و (جوودی)دا هەر وەك ئاگر بەربووبێـتەوە هەموولایەکی کاولکردووە.

لە تاوا بەشێکی خەلکەکە ولاتی بەجێهێشتووەو چووە بۆلای حەلەب و سوریە. لەسەر ئەمە ترسی گشتیی خەلکی والێکردووە، کەلەدژی ئەم خوێنخوارە مەلیکەکانی سەلجووقی رۆم و مەلیك ئەشرەفی ئەیوبییە یەکیانگرتووە. ئەوکاتە کوردەکان بەدلی پڕ لە خوێنەوە لای ئەم حوکمدارانە کۆبوونەوە. سەردار عەشیرەتێکی کوردی (هەکاری) بووەتە قوماندانی گشت ئەم لەشکرانەو پەلاماری (جلال الدین)یانداوەو تا شاری (خووی) ڕایان فڕاندووە، بەلام بەم سەرکەوتنە دیسان کوردستان ڕزگاری نەبووە، چونکە لەشکری مەغۆل لەوێ تەنگیان بە جلال الدین هەلچنیوە، ڕایان فڕاندووەتەوە بۆ لای ئەخلات (٦٢٨هـ ١٢٣١م). ئەم بەخت ناوەژووە لێرە بەدواوە داوای یارمەتی لە کوردەکان کردووە کە وەك برا هەلمەت بەرنە سەر مەغۆلەکان، بەلکو لەناویانبەرن.

**ئەمجا بە کورتی:**

ئەم حوکمدارە لە خوا نەترسە، لەشکری مەغۆل و تاتاری بەدواوە، سوکوترو تاکو ناوچەی دیاربەکر هاتووە، لەوێ دوژمن هەرچوار دەوری گرتووەو کوشتارێکی زۆریان لە لەشکرەکەی کردووە، تەفرو توونا کراون. ئەو کاتە عێلاتی دلّ پڕ لە ناسۆری کورد لە هەموولایەکەوە دەوری ئەم سەربازە پاشماوانەیان داوە قەلاچۆیان کردوون. ئەمجا جلال الدین کەس لە دەوری نەماوە، ناچار خۆی هاویشتووەتە ناو خێلێکی کورد بە تەمای ڕزگاربوونی گیانی، بۆ؟

کاتێك کە دنیا لە (جلال الدین)یش تاوا بوو، ئەوەندە سەرمەستی شەراب خۆری بیوو لەمالە کوردێکا سەری شاهانەیان بڕی و ئاگای لە خوێ نەبوو (٦٢٨هـ ١٢٣١م). ئەوەندە هەیە بەختی کوردستان لەگەلّ ئەم سەرئەنجامە خوێنڕێژانەشا لە کلۆلیی ڕزگاری نەبووە، بەلکو کاولکردنی موقەددەر بووە لەلایەن سوپای مەغۆلەکانەوە لەدوای لەناوچوونی جلال الدین ئەمانە لە دیاربەکردا گیانداریان نەهێشت. هەرچی کەسێکیان بەردەست کەوت هەموویان قەلاچۆکرد. ئەگەر عێلی (کریشیە)ی کوردی ئازا ڕێگای لەمانە نەگرتایە گیان لەبەرێك نەئەما هەموو نەکوژرا. مەغۆلەکان لە خوێنڕژاندن تێرنەئەبوون، قۆلە لەشکرێکیان خۆیگەیاندە ماردین و نەصیبین

ئەوناوەشیان وێرانکرد. قۆڵێکی تریش لە ئازەربایجانەوە ویستی بێتە سەرهەولێر. بەڵام سەردارە ئازاکانی ئەوناوە خۆیان ئامادەکردبوو، بەرایی لافاوی هێرشەکەیان گرتن، ئەو ناوە ڕزگارکرا.

بەکورتی: هاتنی جلال الدین بۆ کوردستان ئاوە ڕەشەیەکی زەهراوی بووە بۆ کوردەکان، چونکە هاتنی مەغۆل و تاتارەکان بە هۆی ئەم تاوانبارەوە بووە، تەنانەت ئەوی لە کوشتن ڕزگاریبووە لە تاوان خۆی کوتاوەتە ناو کەژو کێوەکان، وەیا تەرە بووەو وڵاتەکەی بەجێهێشتووەو دەربەدەربووە بۆ جێگایەکی تر!! ئەم حوکمدارە بەدخووە ئەوەندە بێڕەزا نەبوایە، بەهۆی کەڵەمێردیی و ئازاییەکەیەوە نەیتوانی خۆی لای کوردەکان خۆشەویست بکا تا ببن بە پشتیوانی و بچن بەگژ تاتارەکانا. بەڵام زوڵم و زۆر و خوڵق و پیشەی ناڵەباری بووەتە هۆی لەناوچوونی خۆشی و وێرانبوونی کوردستان بەجۆرێکی وەها تا کاتێکی دوور ئاوا نەبێتەوە.

پەیدابوونی مەغۆل لەگەڵ سەردارە جیهانگیرەکەیانا لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نەگبەتیەکی زۆر گەورەیەو بەسەر ئینسانیەتا هاتووە بەتایبەتی لەیقەومانو قوڕبەسەرییەکە بەسەر موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتا هاتووە مەگەر مێژوو بتوانێ بیگێڕێتەوە. لەناویانا کوردەکان تەواو تووشبوون. ئەو کوردانە کە لەسەر ئەوەشا هێشتا وازیان لە ناکۆکییەکانی ناوخۆیان نەهێناوە. ئینجا ئەم مصیبەتە (کەیان)ی نەتەوایەتی خستووەتە مەترسییەوە، هیچ ئیدارەو سیاسەتیان نەماوە. ناوبانگی بەرزیان کەلەکاتی دەوڵەتی ئەیوبییەوە بۆیان مابوو نشوستی هێنابوو.. لە کاتێکی وادا تووشی هێرشی خوارەزم و مەغۆلەکان بوون و لەپەلوپۆ کەوتن. لە هەموولایەکەوە منالْ بێباوك، ژن بێمێرد، نیشتمان بێ پیاو مابووەوە. ئەوی کە ماشبوو لەوانە نەبوو بتوانێ پێکەوە بنوسێ، وە یا بە فەرموودەی سەرۆکێك بۆ بەرژەوەندی نیشتمان تێبکۆشێت بۆیە ئەبینین کە دەوڵەتی (ئێلخانی) لەسەر کیشوەرە وێرانەکەی عەبباسییەکانو هەموو دەوڵەتە وردەڵەکانی کوردو ئیسلام دامەزرا، کوردەکان ئەوەندە پەککەوتووبوون، تا بەمێنێك ناوونیشانی نەتەوایەتییان دیارنەبوو. لەشکرەکانی هۆلاکۆ کە چوو بەغدا بگرێت، لای کرماشان و هەولێرەوە بە کوردستانا بەسەرلاشەی دلاوەرانی کوردا تێپەڕبوو لە (٦٥٦ هـ ١٢٥٨م)دا. کە بەغدا دەست دوژمن کەوت و هێرشەکان دواییهات، لەتاو کوێرەوەریی، کوردی شارەزوورو هەندێ جێگای تر وڵاتیان بەجێهێشتووە وچوونەتە شام و میسر. (ابن خلدون) ئەڵێ

خێڵاتی (بادین)و (لادین)ی کورد لە جوملەی ئەم دەربەدەرانە واتە (مهاجرانە) بوون کە چوون بۆ جەزائیرو لەوێ دانیشتوون. دوای لەناوچوونی خەلافەتی عەبباسی هۆلاکۆ تەورێزی کردووە بە پایتەختی دەوڵەتەکەی خۆی. لەوێوە بەسەر کوردستانی ژووروودا لەشکرێکی ئەستووری ناردووەتە سەر سوریە کە داگیری بکات و دەوڵەتی مەملووکی میسر لەناوبەرێت. لە رێگا ئەوی ئەم لەشکرە بێرمزایە هێناویە بەسە کوردەکانی حەکاری‌و میافارقین و دیاربەکرو جزیرەو ماردیندا بە زمار ناگێرڕێتەوە، مەگەر مێژوو بیگێڕێتەوە. لەشەڕەکانی سوریەدا کوردەکانی ئەوێ لا مەملووکی میسریان گرتووە، وە لەشەڕی (عین جالوت) دا بە یارمەتی هەڵمەتی کوردەکان سوپای مەغۆل شکستی خواردوە، بەوە وڵاتی ئیسلام لە خراپەی ئە خوێنخوارانە رزگاری بووە (٥٨٠هـ ١٢٨١م). کەچی بە پێچەوانەی دوژمنایەتی قەومی- کوردەکانی فارس لە ترسانا لەگەڵ مەغۆلەکانا بوونەتە یەك. زوربە لەشکری مەغۆل کەچووەتە سەر گێلان و داگیریکرد لەم کوردانە بووە. گومان نیی کە ئەمانە بۆ بەرژەوەندی ژیانی خۆیان ئەم یەکێتییە نابەجێیەیان ئیختیارکردووە چارو ناچار وڵاتەکانی تری غەیری کوردیش سەری بۆ ئیدارەی مەغۆل دانەواندووە لەسەر ئەوەشا بەپێی رەوشت و خووی قەومایەتییەکەیان، ئەم کوردانە هە کەهەڵکەوتووە چوون بە گژ مەغۆلەکانا، وە لە تەقەلای سەندنەوەی سەربەخۆیی قەت دوانەکەوتوون. تەنانەت هەندێ لە سوپای مەغۆلی گاور کە لە هەولێر یاخی ببوو لە سایەی یارمەتی کوردەکانەوە لە هەراکەیانا خۆیان زۆرگرتووە. هەروەها لە ئێرانا کە ئەمیر ئەورۆز یاخیی بووە لە ئێلخانییەکان کوردەکانی وڵاتی (جیبال یارمەتییانداوە. لەسەرئەوە (غازان خان)ی پادشای ئێلخانی چووەتە سەر ئەم کوردان زۆر نائینسانانە سزایداون. جا ئەم کوردانە تووشی تاڵان و چەرمەسەرییەکی وەه بوون هیچیان نەماوە، وەکو[٢]:

سوپای غازان خان لە دوای شەڕ کە تاڵانەکەیان فرۆشتووە کوڕ بە (١٢)و گایەك بە (٥) و بزنێکیان بە (١) درەم فرۆشتووە. بەڵام لە شوێنێکی ترا کە (خودابەندە)ی پادشای ئێلخانی لەشکری ناردووەتە سەر کوردەکانی (گێلان). ئێلخانییەکان شکاو (٧٥٠هـ). ناوچەی هەولێرو مەراغە بۆ سوپاکانی مەغۆل ببوو بە شەقام، چونک بێرەدا هات و چۆیان نەکرد.

---

[٢] ئەم حکومەتە تورکمانە لە (١٣٩٠ەوە تا ١٤٦٨م) پایەداربووە، پایتەختیان لە شار (دیاربەکر) بووەو حوکمی بەسەر بەغداشا کردووە.

بەکورتی: کوردستان لە سەردەمی ئەم ئێلخانییانەدا بە تەواوی پەرێشانبووە. واریداتی لە چاو دەوری سەلجووقیدا دەچەندانەی جاران کورتی هێناوە. ئەو کاتەی دەوڵەتی ئێلخانییش نشوستی هێنا ئێلخانییەکان لە ناوخۆیانابوون بە دووبەرەکیی و بەگژیەکا چوون. لەدواییدا ئەمانە کیشومرەکەشیان بەشکرد لە ٧٣٨هـ ١٣٣٧م دا. کوردستانی ئێران و خوزستان بەر تاقمی (سەلدۆز)ەکان کەوت، وە لە (٧٨٥ هـ ١٣٨٢م)یشا عێراق بۆ هۆزی (جەلاییری)یەکان ساغبووەتەوە. ئیتر دەوری ئێلخانی نەماوە.

## سەردەمی تورك و مەغۆلی دوایی:

### ٥-کورد تا پەیدا بوونی صەفەویەکان: (٧٩٨ - ٩٢٠هـ - ١٣٨٠-١٥١٤م):

ئەو نەتەوە دەستەڵاتدارانەی لە چواردەوری کوردستانا ئۆقرەیان گرتووەو حکومەتیان پێکەوەناوە، هەمیشە خەریکی داگیرکردنی کوردستانەکەشبوون، چونکە ویستوویانە بەوە کەیانی حکومەتەکەیان بپارێزن و پایەداربن. جا لەم باسەمانا بۆ ئەم مەبەستە تەقەلای تورکەکان زۆر چاك دیارە. حکومەتی تورکمانی ئاسیای ڕۆژاوا کە ناحەزو دوژمنی مەغۆلەکانبوون لەگەڵ ئێلخانییەکانا هەمیشە لە زرمە زلێدا بوون. دوای لەناوچوونی ئەم حکومەتی مەغۆلە ئەمجا کەوتوونەتە تەقەلای ئەوە وڵاتەکانی کوردستان بخەنەژێر حوکمی خۆیانەوە. (قەرە قۆینلی)یەکان یەکێکن لەو حکومەتانە. ئەمانە تا ناوەڕاستی کوردستان حوکمیان ڕەواجی بووە. لەوشوێنانەدا شەڕو هەرای سیاسیی و مەزهەبییان ناوەتەوە. زوربەی ئەم تورکانە رافضی بوون. لە ڕووی ئەم دوژمنایەتییەوە هەندێك عەشایری کورد تەنگە تاو بووە، وڵاتەکەی بەجێهێشتووە. ئەم بزووتنەوەیە ڕژێمی دانیشتنی کوردەکانی ئەوناوەی تێکداوە. بەو بۆنەیەوە موکریانییەکان چوونە سەرزەمینی (مەهاباد)ی ئیمرۆ وڵاتەکەیان داگیرکردووە. لەدوای هورووژمی مەغۆل پێویستبوو کوردەکان پشوویەك بدەن و خەریکی ئەوە بوون بێنەوە سەرخۆیان، کەچی بەڵای تەیمووری لەنگ ڕووی تێکردوون. ئەم پادشاهە زۆرداره لە دوای ئەوەی لەناوچەی ئەسفەهاندا لە هەزاران سەری ئینسان منارەی دروستکرد، ئینجا ڕوویکردووەتە عێراق. لەم ڕێبازەدا هەتا چووەتە بەغداد بێڕەحمانە خەلکی کوشتووە. حاکمی بەغداد سوڵتان ئەحمەد

جەلایری مەغۆل ناچاربووە وڵاتی بەجێهێشتووە ئینجا سوڵتان تەیموور بەسەر کوردستانا بەرەو قافقاس ڕوویکردووەتە باکور، ئەوناوەشی شێواندووە سەرو شوێنی لە کوردەکان تێکداوە. جەزیرەو دیاربەکری وێرانکردووە ئەهالی لە تاوانا داویەتە کەژو کێو بەگژوگیا ڕایبواردووە. لە ڕاڕەوی (٧٦٩هـ - ١٣٩٤م)یدا کە دەهشەتی ئەم کابرا دڕندەیە دەرکەوت، سەردارانی کوردی (هەولێر، جەزیرە، حەسەن کێف ماردین و ئەرزەن) بەهیوای پارێزگاریی سەرو ماڵ چوون بە پیریەوە، خوا کرد خەڵکەکە بەمجۆرە ڕزگاری بووە، تەیموورخان (میران شا)ی کوڕی کردووە بە حاکمی کوردستان، ئەوسا بەجێیهێشتووە. ئەم شازادە خوێنخۆرە لە خوڵقی باوکیا بوو. لە وڵاتەکەدا وەك جانەوەر دەستیکردووە بە کوشتار. ئەهالی (حسن کێف، دیاربەکر نوور عابیدین)ی وەك دڕندە پارچە پارچە کردووە. لەسەرئەوە خەڵکەکە لە گیانی خۆی بێزاربووە. لە تاوانا چەکی هەڵگرتووەو یاخیی بووە. تەیموور لەبەر بێرادی و بێ ڕەزایی ناشتیی نەبووە بێ پرسینەوە لە کوردەکان تووڕە بووە. قەراریدا تۆڵەیان لێبکاتەوە. لەسەرئەوە لە (٨٠٤ هـ ١٤٠١م)دا گەڕاوەتەوە سەر کوردستان، تووشی هەرچی ئاوەدانییەك بووە وێرانیکردووە. هەرچی گیاندارێکی دەستکەوتووە هەڵیدڕیوە. کوردستانی والێکردووە ئەوی بەوێدا ڕۆیشتبێ لەبەر چۆڵ و هۆڵیی وڵاتەکە سامی لێنیشتووە. ئەمیر شرف الدینی بیتلیسی بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەی چوو بەپیر تەیموورەوە. لای دیاربەکرو مووش تووشی بووە. خواو ڕاستان تەیموورخان ئەم سەردارەی لا خۆشهاتووە، لەبەرئەوە قەدری گرتووەو لەسەر ئەمارەتەکەی خۆی دایناوەتەوە. لەپاش مردنی تەیموور خاقان لە (٨٠٨هـ = ١٤٠٥م)دا ئەمیری عەشرەتی (قەرەقۆینلوو) قەرە یۆسف ناو کە لەترسی تەیموورخاقان ڕایکردبوو هاتووەتەوە کوردستان و خۆیخستووەتە پەنای سەرداری کورد شمس الدینی بیتلیسی. ئەم ئەمیرە دڵسافە کچی خۆیشی داوەتێ و کردوویە بە زاوای خۆی. بەم فێڵەو بە یارمەتی ئەم سەردارە قەرە یۆسف سەرلەنوێ حکومەتێکی تازەی پێکهێنایەوە. جا لەبەر دڵسافیی و کەمهۆشی سەردارەکانی کورد لە تەربیەی سیاسییدا بە دەستی خۆیان دوژمنی خۆیان سەرلەنوی ژیاندووەتەوە. تەنانەت ئەم شمس الدینە لە

(٨٢٠هـ ١٤١٧م)دا بێ لێكدانەوەی دوارۆژ ئەمارەتی بیتلیسی رسماً بۆ قەرە یوسف تەسدیقكردووە، كەچی ئەمیر یوسف شیعی مەزهەب بوو، زۆر ڕقی لە كوردبوو، وە لەدوای ئەم یارمەتیدانەشی هەر بە ناحەزی كورد مایەوە.

لە (٨٢٤هـ ١٤٢١م)دا (شاهرۆخ میرزا)ی كوڕی تەیمووری لەنگ كە بە لەشكرەوە گەیشتە ئەرمەنستان، سەردارانی كورد وەكو میر شمس الدینی بیتلیسیی و مەلیك محەمەدی (حەكاری) و مەلیك خەلیلی حاكمی (حسن كێف)و ئەمیری (خێزان)و سەردارانی (خووی) بە پیریەوە چوون و ئاشتی و دڵسۆزیی خۆیان عەرض كرد بەوجۆرە خۆیان لە شەڕی تەیمورزادە پاراست. لەم دەورەدا حكومەتی (بایندەر)ی پەیدا بووە. ناوی ئەصلی ئەمانە (ئاق قۆیۆیلی)یە، عێلێكی ترە لە توركمانەكان. ئەمانە حكومەتی قەرە قۆیۆنلییان لەناوبردو لە شاری دیاربەكردا هاتوونە ساحەی مێژووەوە، بوون بە ملۆزمێكی تازەی كوردەكان (حەسەنە درێژ) ناو مەلیكی ئەمانە زۆر بەچنگ بوو، (ئەبوو سەعید میرزای كوڕی تەیمووری لەنگ)ی لە جەنگێكدا شكاندو حكومەتەكەیانی لەناوبرد. ئەمجا مەلیك حەسەنە درێژ پایتەختی گواستەوە تەورێز لەوێ فەرمانڕەوایی دەوڵەتەكەی كردووە. ئەم مەلیكەدرێژە زۆر ناحەزی كوردەكان بووە. ویستوویەتی حكومەتی وردەڵەی كورد لەناوبەرێتو حكومەتێكی توركمانی بێگەرد پێكەوە بنێت. ئەم سیاسەتە لە بناغەی حكومەتی ئاق قۆیۆنلیدا ڕەگی داكوتاوە. پادشاكانیان هەمیشە شەڕیان بە سەردارەكانی كورد فرۆشتووە. گاه لایەنگیری (قەرەقۆیۆنلی)یان لێكردوون بە بیانوو و چوون بەگژیانا، جارجاریش بە سەرزاریی لایەنگیری هەندێك لە كوردەكان ئەبوونو ئەیانكردن بەگژ ئەوانی ترا. لەمەشا مەبەسیان ئەوە بووە خۆ بەخۆ بەیەكتری بیانفەوتێنن. حەسەنەدرێژ زۆر بەژیریی ئەم سیاسەتەی بەكارهێناوە. جا بەم سیاسەتی (لێكیان كەرەوەو تێكیان بەرەوە) یەعنی سیاسەتی (فرق تسد)ە گەلێك حكومەتی كوردی لەناوبردووە. بەڕاستی مایەی ئازاری دڵە كەبەهۆی ئەفامیی و ناكۆكییەوە ئەم هێزی پەرشو بڵاوی كوردە بووەتە ناحەزییەی و خزمەتكاری بەرژەوەندی بێگانە. هیچ كاتێك لە كردەوە نابەجێكانی خۆیان تەمێخواردوو ئەبوون، بەڵكو لەم سەردەمەدا بوونەتە

ئالەتێکی وشك‌و بێدەنگ‌و بێهۆش بەدەست حەسەنە درێژەوە. گەلێك سەردارو ئەمارەتی کوردی بە ئەمیرێکی تری کورد لەناوبردووە. بەرەگەتدا لەمبەینەدا صەفەوییەکان‌و دوا بەدوای ئەوانیش حکومەتی تورکی عوسمانی پەیدابوون لە کوردستاناو دەستیانکردووە بەڕقەبەریی لەگەڵ یەك. جا بەو بۆنەیەوە ژیانی سیاسیی کوردەکانیش بۆ سەردەمێکی تر ژیاوەتەوە.

**٦- کورد لەکاتی صەفەوی‌و پەیدابوونی عوسمانیەکانا (٩٢٠ -١٠١٤هـ-١٥١٤-١٦٠٥م):**

دەوڵەتی صەفەوی لە کیشوەری ئێرانا پەیدابووە. ئەمانە شیعە مەزهەب بوون. لە تەکیە نشینیی و شێخیەتییەوە پێگەیشتوون بوون بە پادشاه، (شێخ صفی الدین)ی ئەردەبێلی باپیرەیان. (جنید)ی کوڕی لە ترسی (جیهانشاه)ی قەرەقۆیۆنلی ڕایکردووەتە لای حەسەنە درێژی ئاق قۆیۆنلی لە دیاربەکر. لەوێ حەسەنەدرێژ کچی خۆی بەحەیدەری کوڕی ئەم شێخ جونەیدە داوە. جا لەم ژن و مێردە شاە اسماعیلی صەفەوی هاتووەتە دنیا. شاە اسماعیل کە حکومەتی ئاق قۆیۆنلی لەناوبردو تەورێزی کرد بە پایتەختی دەوڵەتەکەی، تێفکری بەشی زۆری مەملەکەتەکەی (کوردستان)ەو ئەهلەکەشی سوننی مەزهەبە هیچ حەز لەشیعەناکات، لەبەرئەوە شاە اسماعیلیش (کورد)ی خۆش نەویستووەو لێیان ئەمین نەبووە، جا لەبەرئەوە خێرا دەستیکردووە بە تەقەلای لەناوبردنی ئەمارەتەکانی کورد. بە کردەوە ئەمانە لە ئاق قەرەقۆیۆنلییەکان زۆردارتربوون لەگەڵیان لەبەرئەوەی کوردەکان سووننی بوون هیچ متمانەی پێنەکردوون، بەڵکو متمانەی بە تورکەکان بووە چونکە وەك خۆی (ڕافضی) بوون. لەهەچ کوێیەك ئەمیرێکی کوردی دەستکەوتبێ بواری نەداوە بە کوشتن وەیا بە حەپس کردن لەناویبردووەو لە جێگای ئەوانە خێرا ئەمیرێکی تورکمانی قزڵباشی ڕافضیی داناوە. بەرەگەتدا لەمکاتەدا حکومەتی عوسمانی برووزی سەندووەو لەشەڕی (چاڵدیران)دا یاوز سوڵتان سەلیم شاە اسماعیلی شکاندووە (٩٢٠هـ - ١٥١٤م) . بەمە کوردەکان هۆشێکیان هاتووەتەوە بەبەرداو لە سیاسەتی لەناوبردن بەدەستی صەفەوییەکان ڕزگاریان بووە. لەدوای ئەم شکستی چاڵدێرانە هەرچەندە حکومەتی صەفەوی لە ئێراندا هەرماوە، بەڵام جارێکیتر هێزو دەستەڵاتیان بەسەر ڕۆژاوای شاخەکانی زاگرۆسدا پەیدانەبووەتەوە.

ئەم سەردەمە دەوری ڕقەبەری مەزهەب بووە. نەتەوە موسوڵمانەکان بەهۆی شیعەیەتی و سوننییەتییەوە بەلێشاو خوێنی یەکتریان ڕشتووە بەم بۆنەیەوە

عوسمانییەکان کە سوننی بوون بوونەتە پشتیوانی کوردەکان، وە ئەمانیش بوونەتە (هێزو ئەیروو) بۆ ئەوان، لەبەرئەوە کوردەکان بەرامبەر شەڕو شۆڕی صەفەوییەکان لەمەولا هەمیشە بوون بە پێشڕەوی عوسمانییەکان و کوردستانیش بووەتە جەولانگای لەشکرو سوپای هەردوولا. عوسمانییەکان بۆ ئەوەی کوردەکان بکەن بە لایەنگری خۆیان ئەمیر ئیدریسی بیتلیسی ناو سەرکردەیەکی زاناو هۆشیاری کوردیان کردووە بە واسیطەی تەفرەدانی کوردەکان کە لە شاە ئیسماعیلی صەفەوی (شای شیعە) هەڵسنە پێ. جا ئەم سەرکردە پڕ هونەرەش ئەم فەرمانەگرانەی زۆر بەڕێکی و مەردانە بەجێهێناوە کوردەکانی هەڵساندووەو کردوونی بەگژ ئێرانییەکانا. بۆیە لە پاش جەنگە ناودارەکەی چالدێران سەردارەکانی کورد والییەکانی ئێرانیان دەرکردو ئاڵای عوسمانییەکانیان هەڵکردووە. بەمجۆرە سیاسەتی زوڵم و زۆرکارانەی ئێرانییەکان بووەتە یارمەتیدەری سەرکەوتنی سیاسەتی عوسمانییەکان. ئەوسا سوڵتان سەلیمی عوسمانی ئەمیر ئیدریسی بیتلیسی ناوبراوی داناوە بە نوێنەر (نائب)ی خۆی تا هەموو کوردستانی گەورەی بۆ ساغبکاتەوەو بە دڵدانەوەو دیاریی و خەڵات گشت سالارەکانی کورد بکا بە مسکێن (تابع)ی دەوڵەتی عوسمانی. لەمڕووەوە ئەمیر ئیدریسیش دڵسۆزانە هەوڵیداوەو کوردەکانیش بە دڵ و بە گیان قسەی ئەویان بەجێهێناوەو لە ڕێی فەرمانەکانیان خوێنی خۆیان بەختکردووە. کە سوڵتان سەلیم شەڕە گەورەکەی چالدێرانی بردەوە، تەورێزی بەجێهێشتو گەڕایەوە (ناماسیە) لە ڕۆژاوای کوردستانی گەورەدا، شا ئیسماعیلیش هاتەوە تەورێز دەستیکرد بە تەدارەکی لەشکرو سوپای بۆ تۆڵەکردنەوە. کە تەدارەکات تەواوبوو، لەشکری ئێران لە باکوور و باشوورەوە بە دوو قۆڵ ڕژایە کوردستانی گەورەوە دەستیانکردەوە بە شارداگیرکردن هەتا هاتووەتە (دیاربەکر)، ئینجا سەرکردەی بەناوبانگی ئێران (قەرەخان) ناو ئەوێشی پێچاوە. ئەگەرچی کوردەکان زۆر شێرانە شەڕیانکردووەو خوێنیان ئەڕژابێت بستێك زەمینیان بەجێنەهێشتووە، ئاڵاونە دەوری ئەمیر ئیدریسو بۆ هەموو لایەك هەڵمەتیان بردووە. بەڵام ئێرانییەکانیش لە شێرکۆیان نەئەکرد بۆ سەرکەوتنی شاە ئیسماعیل گیانیان بەختنەکرد. لەبەرئەوە بە ساڵەها جەنگ درێژەی کێشاوە،

یەکتریان هێناوەو بردووە، شاران و دێهاتیان وێرانبووە، لەمکاتەدا (سولتان سەلیم)یش هەمیشە یارمەتیداوە گەلێك جار لەگەڵ سەرداری ناودارا لەشکری زۆری بۆ یارمەتی ناردووەو ئێرانییەکانیان شکاندووە. لەسەرئەوەشا رەدو خورد کۆتایی نەهاتووە، ناوچەی ئەو شەڕانە شاری دیاربەکرو ماردین بووە، لەبەر قەڵای ماردین ئێجگار خوێنرژاوە، لە دواجارا کە شاری حەڵەب زەوتکراوە، ئەمجا سولتان سەلیم پەرژاوە لەشکرو تۆپی زۆری ناردووە، ئێرانییەکانیان بە تەواوی شکاندووە وە تا شاری موسڵ هەموو ولاتەکانیان لێسەندوونەوە. لەدوای ئەمە هەردوولا هەستی ماندوویەتیی کردووەو ئەوسا ئەمیر ئیدریس سەرفراز دەستیکردووە بەرێکخستنی ولاتو شارەکانی کورد، بە سەلیقەیەکی تەواو بەپێی سیاسەتی رۆژو نەریتی زەمان بۆ ئاوابوونو پێشکەوتنی کوردستان، بەرێوەبەرایەتییەکی زۆر بەجێ و رێک پێکەوەناوەو، تامی سەربەخۆیی لەناو حکومەتە کوردەکانا هێشتووەتەوە، ئومەرای کوردی دامەزراندووەو سەربەستییەکی ماقووڵی داونێ و بۆساغکردنەوەی ئاغایەتی واتە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانییش لەولاتەکانا تەشکیلاتی تایبەتی تری کردووە. ئەم هەموو رێکخستنو پێکەوەنانە بە فەرمانێکی سولتان سەلیم قبولکراوەو بۆ دەرخستنی ئەم کاروبارانە ١٧ ئاڵا (بەیداخ)و ٥٠٠ خەلاتی شاهانە نێرراوە بۆ سەردارەکانی کورد. ئەمانە بەسەریانا دابەشکراوە، رەسمیاتیش بەجێهێنرا. لەگەڵ ئەمانەدا خەلاتێکی نایاب و (٢٥) هەزار زێڕیش بەجیا نێرراوە بۆ (ئەمیر ئیدریس بەخۆی بەخشراوە. سەرەڕای ئەم تەرتیبو داهێنراوە تازەیە لەناوچەکانی: دیاربەکر بیتلیس، وان، هەکاری و خەرپووتدا گەلێك حکومەتی کورد هەبوو لەجێی خۆیان بەتەواوی سەربەخۆبوون، جا بەپێی ئەم رژێمە تازەیە فەرمانڕەوایی لە باوکەوە بۆ کوڕ بەمیراتی ئەچوو، وە لەشکری تایبەتی کورد بەپێی پەیمانەکە لە کاتی شەڕ ئەچوو بە کۆمەکی لەشکری عوسمانییەکانەوە، بێجگەلەمانە لەولاتەکانی تریش ئیدارەی مەدەنی واتە (شارستانی) دانراوە کە سەرەکی ئەو ئیدارەیە لەلایەن پادشای عوسمانییەوە دائەنرا، هەرچەندە بەهۆی ئەم تەرتیباتە تازانەوە گەلێك ئەمارەتی نیشتمانی کورد لەناوبراوە، بەلام بەراستی ئەمانە هەمیشە سەرمایەی ناژاوەبوون

نرخێکی میللی و سوودێکی نیشتمانپەروەرییان نەمابوو. جا ئەم تەرتیباتانەی لای سەروو بەپێی پەیوەندی و پەیمانێك کە لەمیانی حکومەتی عوسمانی و حکومەتە نیشتمانییە تابیعەکانی کورددا بەستراوە دروستبووە لە (٩٢٠هـ - ١٥١٤م)دا لەدوای بەجێهێنانی ئەم ئیدارە جوانە. ئەمیر ئیدریس بەدەستی خۆی و بەناوی سوڵتان سەلیمەوە، ئاڵاو چەك و تەپڵی بەسەر نومەراکانی کوردا دابەشکردووە کە ئەمانە بەپێی نەریت و ڕەوشتی ئەوکاتە نیشانەی سەربەخۆیی بوون. سوڵتان سەلیم ئەمیر ئیدریسی زۆر پەسەندکردووە بۆئەوەی لە بیرو پێشنیارەکانی کەڵك وەستێنێ کە چووە بۆ داگیرکردنی (میسر) لەگەڵ خۆیابردوویەتی. جا بەمجۆرە بەسایەی وریایی و ژیریی (ئەمیر ئیدریس)ەوە کیشوەرێکی زۆر سەخت و بەرنەرکی وەك کوردستانی بێشەڕو شۆڕو بە نارەزوو و ڕەزامەندیی خەڵکەکەی بۆ حکومەتی عوسمانی ساغکردەوە، کە ئەمە لەمێژوودا کەم بینراوە، چونکە ئەم وڵاتی کوردە لە دەوری ئاشوورییەکانەوە تا ئەوڕۆژە بەرامبەر هەموو جیهانگیرەکان وەستاوە کە بەنەوێدا ڕۆیشتوون، هیچ کاتێك بەتەواوی سەری بۆ یەکێك لەمانە دانەنەواندووە، ئەیرووی دەوڵەتە جیهانگیرەکانی ئاشوور، ئێران، پارت، یۆنان و ڕۆما کە بەکوردستانا ڕۆیشتوون هەمیشە بە پەرێشانی لێیدەرچوون، وەك ئەمیر ئیدریس بۆ سوڵتان سەلیم کوردستانی ساغکردووەتەوە بۆ دەوڵەتەکانی لای سەروو ساغنەکراوەتەوە. بەڵام حکومەتی تورکی عوسمانی لە پاش ١٥ ساڵ ئەم خزمەتانەی لای سەرەوەی لەبیرچووەتەوە لە پەیمانەکەی لایداوە، دەستیکردووە بە بادانەوەو زۆرداریکردن لەگەڵ حکومەتە کوردەکان یەکە یەکە هەموو ئەو دەوڵەتە بێتاوانانەی لەناوبردووە تاکو لە (١٢٦٦هـ ١٨٥٠م)دا دوایی بە حکومەتی کورد هێناوە. لەدوای مردنی شاە ئیسماعیل حاکمی عەشرەتی (کەڵهوڕ)و سەرداری خێڵی (مۆسلۆ)ی کورد (ذوالفقار خان) بەلەشکرەوە هات بەغدادی گرت و ناوی سوڵتان سولەیمانی قانوونی لە خوطبەدا خوێندەوەو لە بەغدادا بەڕێوەبەرایەتییەکی کوردی سەر بەحکومەتی عوسمانی هێنایە مەیدان.ئەم سەردارە ئازاو کارامەیە ئەوناوەی خستبووە ژێرحوکمی خۆیەوە. بەڵام ئێرانییەکان دەستبەرداری عێراق نەبوون. شاە تەهماسبی صەفەوی لە ساڵی

٩٣٦هـ ١٥٣٠م)دا بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتەسەر بەغداد. لەدوای شەڕێکی دوورودرێژ بەفێڵ ذو الفقارخانی بە براکانی بەکوشتدا. ئەمجا بەغدادی گرت. براخانینەکانی ذوالفقارخانیش هیچیان دەستنەکەوت و شارەکەشیان بەوێرانکردندا. لەبەرنەوەی حکومەتی عوسمانی و صەفەوی هەریەکە لەسەر هێڵێکی سیاسی پێچەوانە ئەڕۆیشتن بوبوونە دوژمنی گیانیی یەکتری. هەراو هوریای سنوورو دووبەرەکیی و نەفامیی کوردەکان هەموو کاتێك مەبەستی بەگژیەکاچوونی بۆ ئەم دووحکومەتە ئەدۆزییەوە. ئەگەر لەکوردەکانا تەربییەی سیاسی ببوایە لەم کێشمەکێشانەدا بە جۆرێك هەڵئەسووڕان کە هەردوو حکومەتەکە زەبوون بکەن بەلام بیرو هۆشێکی وەها بەکەڵك لەسەری سەردارانی کورددا نەبووە لەبەرئەوە ئەم دوو حکومەتە بەسەد ساڵەها لە کوردستانا بەگژیەکا چووەو لەئەنجامی کارا (کوردو کوردستان) لەوان زیاتر لەناوچووە. لەناوەند سوڵتان سولەیمانی قانوونی و (شاه طەهماسیب)ی صەفەویید کە دوو شای هەرە گەورەی ئەم دووحکومەتە بوون بۆ بەیدەستکردنی یەکتری گەلێك جەنگ و هەرا ڕوویداوە. سوڵتان سولەیمان بە سوپای زۆرەوە بە کوردستانی گەورەدا فاتیحانە چووەتە تەورێزو لەوێوە بە کوردستانی ئێرانا وەرگەڕاوەتەوەو هاتووە بەغدای داگیرکردووەتەوە لە ٩٤١ هـ ١٥٣٤م دا، سولەیمان پاشای والی عوسمانی دیاربەکر لەم سەفەرەداکراوە بە والی بەغداد کە ئەمە یەکەم والی حکومەتی عوسمانییە لەعێراقدا. سوڵتان سولەیمان لەم سەرەیدا کەگەڕاوەتەوە لەباتی پاداشی چاکە، هەندێك سەردارو ماقووڵی گەورەی کوردی کوشتووە. قەڵای خورماڵ لە سەردەمەدا بە ئەمری سوڵتان سولەیمان لە شارەزوور دروستکراوە. برای تەهماسیب شاه (ئەلقاس میرزا) لەمکاتەدا لە شاه یاخیی بووە. شاهزادەی یاخیی بە سوپای کوردەوە زۆر دەردیسەریی شای داوە. ئەنجامی کار سورخاب بەگی کورد لە قەڵای (مەریوان)دا ئەڵقاس میرزای گرتووەو پێشکەشی شاه طەهماسیبی کردووە.

لە (٩٦١هـ ١٥٥٤م)دا شاه تەهماسیب هەڵیکوتاوەتەوە سەر کوردستانی گەورەو هەتا دیاربەکر هەموو وڵاتەکان بەر تاڵان کەوتووە. ئەمجارە ئێرانییەکان لە کوردستانا خوێنی زۆریان ڕشتووە بە تەحریکی وەها کە کوشتارەکانی سەردەمی هۆلاکۆی

تەيمووری لەنگیان هێناوەتەوە بیری خەڵك. لەمکاتەدا شاهزادە حەمزە میرزا ناو سەردارێکی زرنگ و ئازا لە ئێرانییەکانا هەڵکەوتووە. لە هەموولایەکەوە تەنگی بە عوسمانییەکان هەڵچنیوەو زیانی زۆری لە کوردستانیش داوە (٩٩٤هـ - ١٥٨٥م). لە دوای ئەم هەموو شەڕو داوایانە (شاە عباس)ی صەفەوی ئینجا ئاشتیخوازیی نواندووە. لەسەرئەوە لە (٩٩٨هـ ١٥٩٠م)دا لە ئەستانبوول ئاشتیانبووەتەوە. بەپێی پەیمانی ئەم ئاشتییە وڵاتانی ئازربایجان، شیروان، گورجستان و لوڕستان و شارەزوور بۆ حکومەتی عوسمانی ماوەتەوە. بەندێك لەم ئاشتییە ئەوەبووە کە ئێرانییەکان واز لە شیعەیەتی بێنن کە ئەمەش دیارە خەیاڵێکی خاوبووە. لە (١٠١٢هـ ١٦٠٣م)دا شەڕو هەرای دەوڵەتی داگیرسایەوە. شاە عباس خێرا تەورێزی داگیرکردووە. ئەمجارە لە خزمەت شادا گەلێك سەرداری کورد شمشێری وەشاندووە وەکو لەبەری عوسمانییشا تاقمە سەردارانی تری کورد خوێنی خۆیان بۆ تورکەکان ڕشتووە. لەم هەڵلا تازەیەدا مستۆ بەگی سەردار عەشرەتی (مەحموودی)ی کورد لە قەڵای (ماکۆ) دا شەڕێکی ڕۆستەمانەی لەگەڵ ئێرانییەکانا کردووە، بەڵام وڵاتەکە لەناوچووەو لە ئەنجامی کاریشا لەشکری عوسمانی شکاوە. لەسەرئەوە سەردارەکانی کوردیش تەقەیان تێکەوتووە هەر یەکە بەرەو مەڵبەندی خۆی کشاوەتەوە (١٠١٤هـ ١٦٠٥م).

### تازەبوونەوەی سەودای سەربەخۆیی لە کوردستان

### هەڵسانی کوڕی (جان پۆلا)

خانەدانی (جان پۆلا) بەمیراتی فەرمانڕەوای ناوچەی (کلیس) بوون (جغالە) پاشای سەردار لەشکری عوسمانی لەم خانەدانی کوردە (میرحسین ناوێکی کردبوو بەحاکمی حەڵەب، لەبەرئەوەی ئەم ئەمیرە لەگەڵ جغالە پاشادا نەچووبوو بۆ شەڕی ئێران. کە پاشا لەشەڕەکەدا شکاو گەڕایەوە میرحسەینی کوشت لەسەرئەوە ئەمیرعەلی برای میرحسەین چووە حەڵەب لەوێ یاخییبوو، وحکومەتێکی سەربەخۆی پێکەوەناو تەرابلوس وشامیشی گرت و چواردەوری شامی تاڵانکرد. ئەم ئەمیرعەلییە لەشکرێکی ئازاو چالاکی پێکەوەنابوو، بەناوی خۆیەوە خوتبە ئەخوێندرایەوەو سکەیشی لێدا کە ئەمانە نیشانەی سەربەخۆیی بوون لەوسەردەمەدا. وە لەگەڵ فەرڕالی (تۆسقانا)ی

ئیتالیا کە (فەردیناند)ی ناوبوو لە (١٠١٦ ھ ١٦٠٧م) دا پەیمانی یەکیەتی بەست و خەریکبوو لەگەڵ حکومەتی تریشا لە دژی عوسمانییەکان قەول و بڕ بکات. لەمکاتەدا لە ئەنەدۆڵ (خێلاتی جەلالی)ی کوردیش هەڵسابوون. (قۆیۆجی مراد پاشا)ی سەرداری عوسمانی بەم بۆنەیەوە لەتەك لەشکرێکی زۆردا هات، لەپێشا ڕوویکردووەتە میرعەلی جان پۆلا. سەرداری کورد بە چل هەزار سوارو پیادە ڕەوەوە لە دەربەندی (باغرس) ڕێی لە سەرداری عوسمانی گرت. لە سوپای عوسمانیدا ٤٠ هەزار چەکدارێك هەر کورد هاتبووە سەر ئەمیرعەلی، هەردوو لەشکر لەدەشتی (ئوروٚج) دا بەرەنگاری یەکبوون، شەرێکی قورس لە ناویانا قەوما. میرعەلی هەتا نیوەی لەشکرەکەی کوژرا خۆی پێگیراو لەوەدوا شکا. ئەوسا گەڕایەوە حەلەب، بەلام سەیریکرد گونجایشی نابێت ڕایکردە ئەستانبووڵ خۆی هاویشتە پەنای سوڵتانی عوسمانی لەسەرئەوە سوڵتانی عوسمانی لێیبوردو کردی بە حاکمی (ئم شوار) لە (مەجارستان). بەلام ئەم لێبووردنە ڕقی مورادشای خوێنخواری دانەمراندبوو، ڕایسپارد لە (بولغەراد) ئەمیر عەلییان کوشت کەوا خەریك بوو ئەچوو بۆ (ئم شوار).

### هەرای قەڵای دمدم ١٠١٧ھ = ١٦٠٨م

هەندێ سەرگوزەشتی پێشینان هەیە قەت نامرێت، بۆ پشتاو پشت ئەبێتە داستانی شانازیی و لەبیرناچێتەوە. وەك ئەستێرەیەکی بەشەوق لە ئاسمانی مێژووی ئەتەوەدا هەمیشە ئەدرەوشێتەوە. تیشکێکی خوایی لەدڵی لاوانیا پەیدائەکاو بۆیان ئەبێت بە میراتیی ئازایەتی، ئەگەر لەسەری بڕۆن وایان لێئەکا، کۆ لە شێرنەکەن و پاشەڕۆژی ئەتەوەکەیان ڕووناك ئەکەن. قەت ڕێ بەناهومێدی نادەن و بۆ بەرزیی و پێگەیشتن ئامادە ئەبن. لە کوردیدا باسی وا هەیە زۆر کەشخەوجوانە بەچیرۆك ئەیگێڕنەوە. غەزەلیاتی تەرمۆکی و سەرگوزەشتی (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی لەوانەیەو بۆ ئەمجۆرە مەبەستە هەڵبەستراوە. ئەوی ئێمە لێرەدا ئەمانەوێ باسی ڕووداوێکی ڕاستەقینەی مێژووییە، کەکوردەکانی قەڵای دمدم لە موکریان بەسەریانهاتووە. چونکە ئەم قارەمانانە لەڕای ئازادیدا هەتا مردن شەڕیانکردووە. ئەم داستانە بڵندە باسی ئازایەتی عێلی برادۆستی موکرییە. ئەمانە بۆئەوەی قەڵاکەیان دەستی دوژمن

ئەکەوێ خۆیان بەکوشتداوە. بەڕاستیی پێویستە ئەم ڕووداوە کەشخەیە لە کتێبێکی سەربەخۆدا بنوسرێ و بۆ یادداشت بەجێبمێنێ. نەك لەم مێژووە گشتییەدا بەچەند وتارێکی کورت تێپەڕێنرێت. ئەوی ئەم ڕووداوەی لە مێـژووی (عالـەم ئـارا)دا نوسـیوە (ئەسکەندەری مونشی) ناو چیرۆکنووسی شاە عەباسە. ئەگـەرچی بـەپێی جیـایی مەزهەبی ولایەنگیریی دەوڵەتیەوە ئەم چیرۆکنووسە ناحەزی کوردە، بـەلاّم چونکـە ڕووداوەکە ئازایەتییـەکی بێهاوتایـە ئـەم ڕووداونووسـە غـەرەز کـاری تیانـەکردووە، ناچاربووە زۆر بەشیرینی مـەدح و ئەنای ڕووداوەکە بکات و مێژونووسەکانی تریـش بخاتەجۆشوخرۆش. قارەمانی ئەم داستانە سەرۆکی سـەردارەکانی خێڵی (برادۆست)ە کەناوی ئەمیرخانی زیرین)ە. یەکەمین سەرداری خێڵەکە بووە، سـەردەمێك بـە ناوانـا گەڕاوە چووەتە لای عومەربەگی حاکمی سۆران بەرێکەوت ئـەم عومەربەگـە تووشی شەڕبووە ئەمیربەگ یارمەتییداوەو دەستی بەر شمشێر کەوتووەو پەڕیوە. لەو ڕۆژەوە بەئەمیرخانی یەکدەست ناوی بلاّوبووەتەوە. لەوبەینەدا شاە عەباسی یەکەم هاتووەتە ئەوناوە کە بچێ بۆ ئەریوان. ئەمیربەگ ئەمەی بەهەل زانییبوو چوونە خزمەت شاە.

شاە عەباس ناوبانگی ئازایی و ئەبەزیی ئەمیربـەگی بیستبوو. بەوبۆنەیـەوە شـاە قەدری گرتووە. ڕوتبەی خانێتی و ئەمارەتی خێلاّنی برادۆستی داوەتێ و کردوویەتی بەحاکمی ناوچەی (ورمێ)و (شنۆ)و (مەرگەوەڕ)و (تەرگەوەڕ). ئـەمجا بەفەرموودەی شاە دەستێکی زێڕینی بۆ دروستکراوە. جا لەدوای ئەمە بە(ئەمیرخانی زێڕین دەست) ناوبـانگی ڕۆیشـتووە. ئـەمیرخان لـە سـایەی ئـازایی و ڕەشـیدی و بەڕێوەبەرایـەتی جوانیەوە بەئاقاقا ناوبـانگی بلاّوبووەتـەوە. لەماوەیـەکی کـەما سوپایەکی پڕەشق و پڕچـەکی پێکـەوەناوە فـەرمانی مـەزن و کـردەوەی باشـی بەجێهێناوە چووەتـە ڕێـزی سەردارە پایەبەرزەکانی سەفەوی. ئەم ناوبانگـە بـەخیلیی و ناحەزییـەکی خراپـی بـۆ ئەمیرخان ناوەتەوە. سەردارە ڕافضییەکان پێشکەوتن و بەرزبوونـەوەی ئـەم ئـەمیری کوردی سوننی مەزهەبیان لا گرانبووە. ئەمیرخان ئاگای لـەم ناحەزییانـەبوو، بـەلاّم چونکـە دڵسۆزانە خزمـەتی شـای ئـەکرد بـاکی نـەبووە. بـە تێکۆشـانی بـەرزو بـەجێ گەلێك خێڵ و کۆماری کوردی عوسمانی هێناوەتـە ژێـر ئیدارەو حوکمـی خـۆی. بـەم

کردەوە پاشانەی شاە عەباسی مەمنوون کردووە. بە کورتی ئەمیرێکی ئازاو بەسام و گەورەیەکی دڵ پاش و ئالیکاری لێدەرچووە. ئەهالی لەژێر ئیدارەی جوانی ئەمیرخاذ حەساوەتەوە. ئەم ڕووداوانە دوژمن و ناحەزەکانی ئەمیرخانی خستۆتە ترس و لەرزەوە. لەبەرئەوە ویستوویانە دەستەڵاتی ئەم ئەمارەتە بەشەوکەتەی کورد بشکێنن بەتایبەتی سەردارە بێباکەکەی کە ئەمیرخانە لەناوی بەرن. جا چاوەڕوانی ئەو ڕێکەوتەبوون. لەسەر ئەمەشا دڵسۆزیی ئەمیرخان بۆ شاە عەباس ئەوەندە ئاشکر بووە، قسەی ناحەزەکان لەلای شاە کاری نەکردووە. وا ڕێکەوت ئەمیرخان لە دواییەدا لە سنووری دەوڵەتی عوسمانییا بە ئیزنی شاە قەڵایەکی بۆخۆی دروستکردووە. چونکە ئەو شوێنە هەمیشە بە گۆبەند بووە پێویست بووە ئە قەڵایەی لێبکرێ. ئەمجا ئەمە هەلێك بوو ناحەزەکانی بۆ فیتنەبازی گرتیار بەدەستەوە هەتا دڵی شاە عەبباسیان لێ کرمێکرد. ئەم قەڵایە لەسەر باسکێکی سەخت و بەرز لای شاری ورمێ لە جێگا قەڵایەکی ئێجگار کۆنا لە (١٠١٧هـ ١٦٠٨م)د دروستکراوەو بە ناوە کۆنەکەیەوە ناوی قەڵای (دمدم). ئەمیرخان بە بەرژەوەندی ئەمارەتەکەی ئەبوو ئەم قەڵایە دروستبکا نەك ویستبێتی بەربەرەکانێی شاە عەباس بکا. بەڵام ناحەزەکانی ئەوەندە تێکۆشان هەتا شاە عەباسیان دوودڵکرد لەسەرئەوە ئەمری شاهانە دەرچوو کە قەڵاکە تێکبدرێ نەك تەواوبکرێ. ئەمیرخان زانی کە بەرامبەر بەخۆی دڵی شاە عەباس گۆڕاوە. ئەمجا ئەمیرخان تێگەیشت کە لە دوو شت ئەبێ یەکێکیان بکات: یا بەبێ دەنگ تەسلیمی دوژمن بێت و لەناوبچێت وەیا بەئاشکرا تێبکۆشێت هەتا بەمەردیی ئەمرێت. ئەمیرخان لای دووەمی گرتووە قەڵاکەشی تەواوکردووە. لە دوای ئەمانە ئەمیری برادۆست دەستیکردووە بە تەدارەکی شەڕ. ئەگەر هاتنەسەری و تەنگیان پێهەڵچنی لەهیچ کۆ نەکا، هەتا مردن شەڕ بکا. لەمکاتەدا جەلالییەکان لەدوای شەڕێکی زۆر لەگەڵ عوسمانییەکان شکستیان خواردووە. خۆیان هاویشتووەتە ئێران. هاتنی ئەم شۆڕشگێڕانە بووەتە هۆی ئاشکرابوونی ئەمیرخان و حکومەتی ئێران لە یەکتری. ئەمانە ٢٠ هەزار کەسێکبوون شاە بە بیرێکی نهێنی ویستی لەم شۆڕشگێڕە هەڵاتوانە هەشت هەزارێك لە برادۆسن

دامەزرێنێت. لەبەرنەوە لەگەڵ لەشکرێك ئەمانەی نارده لای ئەمیرخان کەلای خۆی دایان بمەزرێنێ. ئەمیرخان لەترسی دواڕۆژو هەوژانی ناڕەزاییەکانی برادۆست ئەمرەکەی شاه عەباسی بەجێنەهێنا. کوردو جەلالیو قزڵباشییەکان بە دوو دڵیی و قین لەدڵ پێکەوە لەوێدا ڕاوەستا بوون لەناویانا ورده شەڕ داگیرسا. ئەمجا بەسەرداریی وەزیری گەوره (معتمد الدولـه) لەشکرێکی زۆر هاتەسەر ئەمیرخان کە بترسێت و جەلالییەکان بەزۆر لەوێ دامەزرێن. ئەم سوپا زۆره قەڵاکەی پێچا!. هەموو لەشکرەکە له ٢٥ هەزار سوارەو پیاده زیاتر بوو، چەکی باش و تۆپی زۆریان پێبوو کە قەڵاکە بکوتنو بیڕوخێننو بیگرن. بەرامبەر بەمە هەموو لەشکری ئەمیرخان لەیەك هەزار کەس زیاتر نەبووە، چونکە لەوە زیاتر نەیروو نەنەحەوایەوە، واته قەڵاکە زیاتری نەئەگرت. جگە لەمانە ورده ناتەواویی تریش هەبوو له قەڵاکەدا بۆ جێبەجێکردنی ئەوانەش ماوه نەمابوو. له بیناغەدا دەوری قەڵاکە کانی و ئاوێك هەبوو ئەویش بەرێگایەکی ژێرزەمینا خرابووه سەر قەڵاکە پاسەوانی بۆ دانراوە. هەرچەنده ماوەی ئەم هەراو شەڕە بەتەواوی نەزانراوە، بەڵام بەپێی مێژووی (عالم آرا)ی ئێران بەلای کەمەوە حەوت مانگێکی خایاندووه. کە شەڕ هەڵگیرسا ئێرانییەکان بە ژمارەی زۆری خۆیان نازیون، گەلێك هەڵمەتیان بردووەو بۆ گرتنی قەڵاکە عامبازی برا دۆستییەکان بوون، بەڵام زۆریان لێکوژراوەو بە پاشا گەڕاونەتەوە. ئەوسا تێگەیشتوون کە ئەم جنگە (کوردە) تا بێدەرەتان نەکرێن و بەرێکی نەپێچرێن (محاصره) بێدەست ناکرێن. جارێ بە چوار مانگ دەستڕێژی تۆپ و هەموو رۆژێك شەڕو کوشتار. ئینجا قزڵباشییەکان توانییان ڕێگای کانیاوەکە بگرن. لەم شەڕانەدا گەلێك خوێنی ئەم ڕافزییانە ڕژاوە، هەڵمەتەکانیان جار بە هەڵمەتی بەرامبەری کوردەکان بەرەو پاش گەڕاوەتەوە لەکاتی ئەم شەڕە قورسانەدا جەلالییەکان ورده ورده خۆیان دزیوەتەوەو بڵاوەیان لێکردووه، وە چوونەتەوە بۆ وڵاتی عوسمانی. لەگەڕانەوەکانیانا وڵاتیان تاڵانکردووەو تووشی قزڵباشی بووبن کوشتوویانە. لەدوای گرتنی کانی و ئاوەکە سەردەمێك ناوی لیخنی ئەستێڵی قەڵاکەیان خواردووەتەوەو ناوه بۆگەنەکەش خەریکی تەواوبوون بووه. خوا

کـردی لەوکاتـەدا کـە سـەرەتای زسـتان بـوو بـارانێکی زۆر بـاریوە، لافـاو ئەسـتێڵی نـاو قەڵاکەو چاڵە بەفرەکەی پرکـردووە. ئـەو ئـاوە پێویسـتی شـەش مـانگی قەڵاوانـەکانی جێبـەجێکردووە. لەسـەرئەوە (برادۆسـت)ییـەکان گەشاونەتەوە، بـەڵام ئێرانییـەکان ئەمەیان زۆر پێناخۆش بووە. سـەرداری سوپای ئـێران چاری نـەما، بـەڵێنیدا کـە بـە هێرش و زۆرداریی قەڵاکە بگرێت. بۆیـە دەسـتیان بـە کوتـانی قـەڵا بـە تۆپـەکانیان‌و خەندەك لێدان بۆ نزیکبوونەوە لە بورجەکان. لە دوای چەند مانگێك ئازارو کوشتار ئەمجا توانییان بورجێـك تـەنیا هـەبوو بـڕوخێنن و بیگرن و شـەڕکەرەکانی بکوژن ئـەم سـەرکەوتنە بـوو بـە ڕوونـاکی و هیـوا بـۆ قزڵباشـەکان‌و مەراقیشـیداوە بـە قەڵاوانەکان. هەرچەنـدە شەڕکەرەکانی ناو قەڵا پـەلاماریانداوە دەرپەڕیونەتـە دەرەوە سنگ بەسـنگ لەگـەڵ ئێرانییـەکانا شـەڕیانکردووەو ئەمـە زۆرجـار وەهـاکراوە، بـەڵام ئەمجارە سەری نەگرتووە بورجەکە بـۆ ئێرانییـەکان ماوەتـەوە. لـەم کاتـەداو لـە دوای ئەم ڕووداوە، وەزیری گەورەی ئێرانییەکان مردووە. شاه لـەجێی ئـەو محەمـەد بـەگی بیکدلی کردووە بە سەرداری لەشکر. ئەمجا شەڕو ئەبەردیی دەورەی قـەڵا بـە توندیی دەستپێکردووە. بە گوللـەباران بورجێکـی تریـش شـپرزەکراو بەئەبـەردیی شـەوو ڕۆژ قەڵاوانەکان هەموو کوژران. قزڵباشەکان هەموو بورجە ڕووخاوەکانیان داگیرکردووە زۆری پێنەچووە بورجێك کە بەدەست کوڕی ئەمیرخان بوو لەلایەن پیر پۆداق خـانی حاکمی تەورێزەوە زەوتکراوە. لەلایەکەوە ژمـارەی زۆرو کـەمیی شـەڕکەری هـەردوولا ئـەوەندە زۆربـوو بـە خـەیاڵیش دەرەتـان نـەبوو بڵـێین برادۆسـتییەکان ئـەم جەنگـە ئەبەنەوە. لەسەرئەوەشا بەشەڕی شـەوو ڕۆژو ئـەبـەردیی سنگاو سـنگ و گوللـەبارانی تـۆپ و تفـەنگ‌و لەغـەم و خـەندەك لـێدان ئێرانییەکان ئـەو بورجانـەی مابوون لـە قەڵاکەدا ئەوانەشیان ڕووخاند. بەمانە توانای خۆڕاگرتنی قەڵاکە زۆر کەم بوومتـەوە جێگاکە زۆر تـەنگە بەرببوو، مەیدانی جووڵانەوە نەمابوو. لەهەموو لایەکەوە دیواری قەڵاکە ڕووخابوو، لەشکری عەجەم چووبووە ناویەوە. بێجگە لەمەنزڵی ئـەمیرخان کـە قەڵای (نارین)بـوو جێگـای تـر بـە دەسـت برادۆسـتییەکانەوە نـەمابوو. ئـەمجا لـەوێدا دەستکرایەوە بە شـەڕ، بەرامبـەر ئـەم قارەمانییـە سـەرداری صەفـەوی حـەیران مـاوە

نەیزانیوە چی بکات. سەرەڕای ئەمە لەمکاتەدا کۆمەکی تازە بۆ نێرانییەکان هاتووە، کوردەکانیش هیوایان هەر بەخواو بە گیانی بەرزی خۆیان بووە. بەڵام ئەمیرخان تێفکری لەسەر شەڕ ڕۆیشتن هیچ سوودێکی نەماوە. لەبەرئەوە دوای موزاکەرەیەکی کورت لەگەڵ ڕەفیقەکانیا بەڵێنیاندا کە دەست لەشەڕ هەلگرن. ئەمجا ئەمیرخان خەبەری بۆ سەرداری عەجەم نارد کە تەسلیم ئەبن. ئەمانە بێنەوەی چەك لە خۆیان داماڵن و بەومەرجەی نەیانکوژن تەسلیمی ئەلیاس خانی سەرۆکی قزڵباشەکان بوون. لەدوای ئەوە هانیویانن بۆ بارەگای سەرداری سوپای عەجەمەکان کە هەموویان سەد کەسێك ئەبوون. لەدوای ئەمە عەجەمەکان بیریان گۆڕی، بەڵێنیاندا بیانکوژن. کە قارەمانەکانی برادۆست بەمەیانزانی خۆیان وریاکردەوە بۆ شەڕ. لەمەولاوە دەستەی ئەلیاس خانی سەرۆکی قزڵباشەکان ویستیان چەك لە یەخسیرەکان بسێنن. لەسەرئەوە شەڕ داگیرسا. یەخسیرەکان ئەلیاس خان و چەند قزڵباشێکیان کوشتووە. ئەمجا لەشکری قزڵباشیی چواردەوری ئەم کەڵە مێردانەیانداوە. لەدوای شەڕێکی وەحشییانەو کوشتارێکی زۆر لە قزڵباشەکان ئەم پاڵەوانانە هەموو کوژراون. ئەمیرخانو ڕەفیقەکانی بەجیا لە خێوەتێکا بوون لە درزو کونی خێوەتەکەوە، چاویان لەم قەسابخانەیە بوو. تێگەیشتن کە کار لە کار ترازاوەو ماوەی پینەو پەرۆ نەماوە. لەبەرئەوە ویستوویانە دەستپێشکەریی بکەن و لەخۆیان زیاتر لە دوژمن بکوژن ئەمجا بمرن. لەبەرئەوە کوتوپڕ قزڵباشەکانیان داوەتە بەر تفەنگ. ئەوانیش لە هەرچوار لاوە ئەمانیان داوەتە بەر شێلگی تفەنگ. لەدوای ئەمە ئەمیرخان و ڕەفیقەکانی دەستەوخەنجەر شەڕیانکردووە. ئەوی لەبەر برینی زۆری خۆی نەگرتووە کەوتووەتە زەوی لە پاڵەوە هەر شەڕیکردووە هەتا مردووە. گەلێجار هەڵمەتی هارانەی قزڵباشەکان لەڕووی هێرشی ئەم ڕەوە شێرانەدا خۆی نەگرتووە وەستاوە، یەك لەسەریەك لاشەی قزڵباشەکان لەسەر زەوی بووەتە گردۆڵکە. بەڵام قزڵباشەکان ئەوەندە زۆر بوون نەنەبڕانەوە، بەڵکو کەڵەمێردەکانی برادۆست کە هیچ پەناو کۆمەکێکیان نەبوو بە ئەنجام ئەوان بڕانەوە. کاتێك دوایی ئەم شەهیدە ئازایانە هات لووره لووری شادمانی دوژمن لەوناوەدا دەنگی ئەدایەوە. تومەز خۆشی و

سەماکردنی ئەمانە نیشانەی ئەوەبوو کە هەرای (دمدم) بڕاوەتەوە! لەدوای ئەوە بورج و تەلاری دەمدم کە حەوت مانگ بوو سەیری ئازایی و قارەمانێتی ئەم شێرانەی ئەکرد، بەسەر لاشەی کوژراوەکانا ڕووخێنرا. جا لاشەی ئەم شەهیدانە کە لە ڕێی ئازادیدا بە کوشتچوون، لە ژێرزەمینی قەڵا ڕووخاوەکەدا بەوجۆرە شارراوەتەوە.

## قەلاچۆی خێلاتی موکریان (١٠١٩ هـ ١٦١٠م)

هەر لەسەردەمی لای سەرەوەدا بەبیرێکی سیاسی کێوی و ڤینی مەزهەبیی لەلایەن حکومەتی شاە عەباسەوە عێلەکانی کوردی موکریان قەلاچۆکراوە لە ١٩٩١هـ ١٨٥٤م دا. (ئەمیرە پاشا) ناو سەردارێکی کورد کە حاکمی موکریان بووە، لەبەرڤین‌وخراپەی شیعەکان لەدڵدا ڕقی لێیانبووە. لەبەرئەوە لە کاتی شەڕەکانی عوسمانی و ئێراندا کە لەشکری عوسمانی هاتووەتە دەوری تەورێز، ئەم ئەمیرە پاشایە ئەهالی شیعەی وڵاتی (سلدۆز)و (میاندوا)و (مەراغە)ی ئازارداوەو (قەرە چۆق) ناو موڵکی تایبەتی شای ئێرانیشی تاڵانکردووە. لەسەرئەمانە، شا چونکە شێخ حەیدەری کوڕی ئەم ئەمیرە کە بیووە سەرەکی بەشێکی موکریان سەربە شا بووەو لە ڕەزمی (روان)دا لە پێناو حکومەتی ئێرانا بەکوشت چووە. لەبەرئەوە شا جارێ دەنگی نەکردووە بەڵکو لە پاداشتی ئەمەدا (قوبادخان)ی کوڕی شێخ حەیدەری لەجێی باوکی داناوە بەلام لەلایەکەوە بەهۆی ناکۆکی دائیمی نێوان شیعی و سوننییەتی و لەلایەکی تریشەوە لەبەر بوختانکردنی ماقووڵانی شیعە بە ئومەرای کورد لای شاهی عەجەم ڕابواردنی وەها لێکردبوو دۆستایەتی بە هیچ لایەکیان ڕانەئەگیرا، لە حاڵەتێکی، وەهادا لە موکریانا یاخیگەرییش پەیدابووە!.

سەرەڕای ئەمە لە هەرای دمدمدا قوبادخان بە کۆمەکی شاهەوە نەچووە. جا ئەم هەموو نالەبارێتییە وایکردبوو لە شاە عەباس لە ساڵی ١٠١٩هـ – ١٦١٠ م دا بڕیاریدا کە قڕی عێلەکانی موکریان بێنێت. جا لەسەرئەمە هەر ئەوساڵە شاە عەباس بەلەشکرەوە ڕوویکردووەتەوە وڵاتی موکریان، جارێ شاە قوبادخانی خلافاندووە بەرەو ڕووی خان بەخۆشیی دواوە هەتا قوباد بەمانە تەفرەی خواردووە. وەتە بەخۆی و سوارەکانییەوە چووەتە بارەگای شاە ئەوسا ئەمری بە کوشتنیانداوە ماقووڵەکانی کورد کە ئەم نامەردییەیان دی، پەلاماری چەکیانداوە تا مردن شێرانە شەڕیانکردوە. لەدوای ئەوە سوپای شاە پۆل پۆل ڕوویکردووەتە نیشتمانی موکریان

دەستیانکردووە بە قەلاچۆکردنی ئەهالی بەسەزمان. بەوجۆرە کوشتارێکی زۆریان لەو ئەهالییە بێدەرەتانـە کـردووەو نـافرەت و منداڵـەکانیان بەخسـیرکردووە. شـیعەکان لـەدوای ڕۆژێکـی وەهـا ئەگـەڕان کـە لـە موکریانـا هیـچ نەیـەڵن. جـا بەڕاسـتیی خوێنخوارییـەکی وەهایـانکرد کـە لـە مێـژووی ئـادەمییدا بـە شـەرمەوە بـاس بکرێـت، بەمجۆرە تینوێتی خوێنخواریی شای صەفەوی نامەرد شـکاوە. لەدوای ئـەم قەلاچۆیـە کوردستانی ئێران وەها شپرزەکراوە، حکومەتی شاە عـەباس لەوتۆڕەیـەدا نـەیتوانیوە لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانیدا لەسەرشـەڕ بـڕوات. لەبەرئـەوە بـەناچاریی داوای ئاشتییکردووە. لە ئـەنجامدا لەسـەر بڕیارەکانی سوڵتان سـەلیم دەستوبرد ئاشتییان پێکـهێناوە، بـەڵام لەبـەر گـیروگرفتی بێئـەندازەی میـانی ئـەم دوو دەوڵەتـە ئاشـتبوونەوەکەیان سـەری نـەگرتووە. بـەڵکو لـە(١٠٢٤هـ - ١٦١٢م)دا دیسـان شـەڕ داگیرساوەتەوە. سەردارەکانی کوردی عوسمـانی پێشڕەوی لەشکری ئـەمجارە بـوون، هاتوونەتەسەر سنوورەکان و ئاژاوەیان ناوەتەوە. لە هـەرای ئازربایجانـا زەینـەڵ خـان سەرۆکێکی کورد سەرداری ئێرانی بریندارکردووە. ئینجا لەشکری شایان شکاندووە. لەسەرئەوەشا شەڕ زۆر درێژەیکردووە، گەلێکجار لەشکری ئێران هاتووەتە کوردستانی عوسمانییەوە. ئومەراکانی کورد لەناو بەدبەختی ئومـەرای شیعەی ئێران کەوتوونـە سەودای پارێزگـاری مـاڵ وموڵکـی تایبـەتی خۆیـان و بڵاوەیـانکردووە. لەبەرئـەوە نەیانتوانیوە لەشکرێکی ئەستوور پێکەوە بنێن و بەرەنگاری لەشـکری ئێران بوەسـتن و لە کوردستان دەریانکەن و تۆڵەیان لێبکەنەوە. جا بەهۆی ئەم جیاجیا بوونـەوەیان زەرەریان لێکەوتووەو کوردستان وێران بووە. تەنانەت لـە ڕووی ئـەم بڵاوبوونـەوەیان وا ڕێکەوتووە کوردو تورك یەکگر یەکا چوون و زۆریان لەیەك کوشتووە، لـە ئـەنجامی کـارا هـەردوولا لـەم ڕووەوەو کـورت وەسـتاوە وە لـە (١٠٢٧هـ ١٦١٨)م) دا ئـەم دوو حکومەتە ئەمجارەش ئاشتیانبووەتەوە. حکومەتی ئێران لەسەر ئەم هەموو خراپانەدا کە دەربارەی کوردەکانی کردووە، کـەچی بناغـەی هێزی سوپاکەی لەڕۆڵەکانی کورد بووە. سنووری وڵات ئەمان پاراستوویانە لەشەڕی دەوڵەتیدا پشتو پـەنای عەجـەم عەشیرەتەکانی موکریی بووە. گەلێك پۆلە لەشکری دایمی شاە عەباس لە کوڕە کوڕەی کورد دروست ئەبوو. لەمانە ئەفسەرو سەردار لەشکری زۆر هەلکەوتووە وەکو (عـەلی جان سوڵتانی شوکاکی، گەدایی سوڵتان کۆڵانـی. قەلـەندەر سـوڵتانی کەڵەگیری. ئیمام قولی سوڵتانی چنگنی) لـەو سـەردارە بـە ناوبانگانـەن کـە لـە سـەردەمی شاە عەباسـی یەکەما پێگەیشتوون. هەر ئەم شاە عەباسە بۆ بەربەستکردنی هێرشی تورکمانـەکان

پانزە هەزار ماڵێکی کوردی بۆ خۆراسان دەربەدەر کردبوو، لەشەڕی بـەغدادو موسا
تیپی هەرە بـەکاری لەشـکری شـاە عـەباس کوردەکـان بـوون و شـارەزووڕو قـەڵا
کەرکووکیش سوپای خـان احمد خـانی حـاکمی ئـەردەڵان کەسـەردارێکی بـەناوبانگ
کوردە بـۆ شـاە عـەباس زەوتکـردووە. شـاە عـەباس لـە ١٦٢٤م دا کەلەشـکری ئـێرا
سـەرلەنوێ ڕێکخستووەتەوە گـەلێك پـۆلی ئـەم لەشکرەی لـە عەشایری موکری کو
دروستکردووەو بـەم لەشـکرە زۆرجـار سـوپای دەوڵـەتی عوسمـانیی شـکاندووە. ل
ئومەرای موکری تەنیا (شێرخان) ناوێك مابوو کە بەرکوشتار نەکەوتبوو، ئەویش ا
ماقووڵانی شاە عەباس بوو خۆی و براکەی ئێشکگری شاە بوون، لەبەرئەوە شاە خۆ
ئەمانـەی بەخشـیوەو نەیهێشـتووە بکوژرێـن. جـا قـەلاچۆی موکریـان بـەمجۆ
دواییهاتووە.

## تـازە بوونەوەی هەرای موکریان و ئە نجامەکەی ١٣٠٤هـ – ١٦٢٥م

لەدوای کوشتارە گەورەکەی موکریـان کـەلای سـەرەوە باسکرا، بەفـەرموودەی شـ
(شـێر خـان)ی نـابراو کـراوە بەسـەر کۆمـاری عەشـایری موکـری، بـەلام بـەهۆ
زۆرداریکـردنو دەسـتدرێژیی قزڵباشـەکان و دوژمنایـەتی بـەینی شـیعەیەتی
سوننییەتی کە ڕێگای ئارام و ئاسایشی گرتبوو، ئـەم شێرخانەش خۆی پێنـەگیراو
بەرامبـەر بەحکومـەتی ئـێران یـاخیبووە لـە ١٠٣٤هـ ١٦٢٥ م دا شـێرخان لەپێش
بەلەشکرەوە ڕوویکردووەتـەوە مەراغە. لەوێ گـەلێك شـیعەی کوشـتووەو ئـەوناو
تالانکردووە. لەدوای ئەوە کـە بیستی لەشکری شاە عەباسی هاتووەتە سەر، چارە
نەماوە بە خۆی و عەشایرەکەیەوە کشاوەتەوە ناو شاخەکانی ئـەوناوە. بـەوە خۆی
سـوپاکەی لـە تۆڵەکردنـەوەی عەجەمـەکان ڕزگـارکردووە. ئێرانییـەکان هەرچـە
هەوڵیانداوە ئەمانە تووشـی سـزا بکرێـن، بـەلام لـە تـالانکردن و سووتاندنی وڵاتەک
زیاتر هیچی تریان پێنەکراوە. لەسـەرئەوە سوپای ئـێرانیش لـەوناوەدا ئیش و کار
نـەماوەو گەڕاوەتـەوە. لـەدوای مردنـی شاە عـەباس لـە ١٣٠٩هـ ١٦٢٩م دا شـەڕی ئـێران
عوسمانییەکان دووبارە دەستیپێکردووەتەوە، سەرداری ئەعظەمی عوسمانی (خوسر
پاشای بەناوبانگ) بۆ سـەندنەوەی بـەغدا بـە لەشـکرەوە هاتووەتـە موسـڵ، لـەو
ئومـەراکانی کـوردی لـەخۆی کۆکردووەتـەوە لـە سـازمانێکی گشتیدا. خوسـرەو پاشـ

ئومەرای کورد وایان پێباشبووە لە پێش بەغداد چوونا جارێ کوردەکانی هەرێمی ئەردەڵان بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیان. لەدوای ئەوە ئینجا بچن بەغدا بگرن. لەسەر ئەم بڕیارە دەستە لەشکرەکەی عوسمانی بەسەر شارەزووردا ڕۆیشتووە بۆ ئەردەڵان. خوسرەو پاشا لە ڕێ قەڵای (خورماڵ)ی پینەو پەڕۆ کردوومەتەوەو لەگەڵ هەندێك لەسەر کۆمارەکانی کورددا پەیوەندی بەستووە. ئەوەندە هەیە ئەم سەرکۆمارانە لە هێزدارە دەستەڵاتدارەکان نەبوون وەکو (زەینەڵ خان)و (خان ئەحمەد خان)ی ئەردەڵانی کە سەر بەعەجەم مابوونەوە، یەعنی وەك ئەمانە بەهێز نەبوون. لەشکری عوسمانی لەدوای چەند دەستوەشاندنێك بایداوەتەوە سەر بەغدادو شارەکەی پێچاوە. بەڵام بۆی زەوت نەکراوە. لەسەرئەوە گەڕاوەتەوە بۆلای شاری موسڵ. ئەوسا خان ئەحمەد خان بەلەشکری کوردەوە شوێن عوسمانییەکان کەوتووەو شارەزووری داگیرکرووەتەوە (١٠٤٠هـ ١٦٣١م).

لە ساڵی (١٠٤٨ هـ ١٦٣٤م)دا پادشای عوسمانی مرادی چوارەم کە بە (فاتیحی بەغداد) ناودارە، هاتووەو بەغدادی داگیرکردوومەتەوە، واتە لە عەجەمەکانی سەندووەتەوە. سەردارە کوردەکانی ناوچەی (عەمادیە، هەولێر، بادینان، کەرکووك، شارەزوور) بەلەشکریانەوە لەم فەتحەدا لە خزمەت سوڵتانی عوسمانیدا بوون و بۆ سەرکەوتنی پادشاە گیانی خۆیان بەختکردووە. یەعنی بەسایەی خۆبەکوشتدانی کوردەکان بەغداد گیراوەتەوە. لەدوای ئەمە ئینجا هەردوو حکومەتەکە ئاشتبوونەتەوەو، تەنانەت ئەمجارە سنوورەکانیش ساغکراونەتەوە، وەتا سەدەی نۆزدەمینەم ئیتر نەگۆڕاوە. وە بەم کەین و بەینە کوردستانی خوارووی (زاگرۆس)مکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی یەکلایی بووەتەوە. جا تا ئەم مێژووە ناوچەکانی (بیتلیس، عەمادیە، هەکاری) هەریەکە بەجیا لە حوکمی سەردارێکی کوردا سەربەخۆ بووە، بەڵام لە (١٠٧٠هـ ١٦٦٠) بەدواوە ئەم وڵاتانە بە مسکێنایەتی بوومەتە موستەعمەرەی دەوڵەتی عوسمانی. بەڕاستی ئەم هەرا دوورو درێژەی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوییەکان ڕووداوێکی گرنگە لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا. نرخی سیاسی کوردو کوردستانی بەتەواوی بۆ نەتەوەی کورد ساغکردوومەتەوە. بەڵام کوردەکان ئەمجارەش لەم هەڵە باشانەی مێژوو پەندیان وەرنەگرتووە. نەیانتوانیوەو نەیانزانیوە کۆمەڵێکی یەك دڵ و یەك سەرۆك پێکەوە بنێن و دایمەزرێنن کە بەرامبەر لافاوی بێگانە وەك کێوە پارە ڕابوەستێ. ئەو مەینەتانەی کوردی لەم خۆ کۆکردنەوەیە دواخستووە هەموومان

ـەیزانین فـەقیریی‌و نـادانیی و نـاكۆكیی بـووه. نـەبوونی تەربیـەی سیاسـیی و نەفرەخواردن بەهەڵاتی كاربەدەستان كوردی تووشی نوغرۆی خۆخۆریی كردووه. لە باتی پالْبدەنە پالْ یەك بە دلْسۆزی هەولْی ڕزگاربوونی خۆیان نیشتمانەكەیان بـدەن، كەچی بە پێچەوانەی ئەوەوە هەمیشە بەگژیەكا چوون وە یا شمشێریان لەیەك سووه. ـەبەرئەوە ئەو دەوڵەتانەی پێكیانهێناوە هەمووی لەناوچووه. شەرەفخانی بیتلیسی بە سكالآكانیا دیـارە دەركـی بـەم كوێرەوەرییانـە كـردووەو ڕێگـای باشـی پیشـانی كوردەكـانداوەو پێیوتـوون كـە نـەبێ یەكێتییـەكی سیاسـی پێكـەوە بنێـن و لـە حكومەتەكانیان دەوڵەتێكی یەك پارە (فەدەراسیۆن) دروست بكەن و شاری جزیـرەش بكەن بـە پایتـەختی ئـەم دەوڵەتـە، یـەعنی ئـەم وەسیـەتانەی هـەموو كـردووه. بـەڵام داخی داخانە فیتی حاكمەكانی نـاوخۆ كـە پـەرش‌و بلآویكردوونەتـەوەو نەیهێشـتووە ئەم پەندە جوانانە بچێتە مێشكی سـەردارەكانی كوردەوە، بـەڵكو هـەر لەسەرشوێنی كۆن ڕۆیشتوون و بەرە بەرە گشتیان لەناوچوون.

## لە سێ سەدەی دوایی ڕۆژهەلاتی نزیكا

### ١- هەواڵی كوردستان ١٦٠٠هـ – ١٨٥٠م

هەواڵی مێژوویی سێ سەدەی دوایی كوردو كوردستان بریتییە لەو سەرگوزوشـت‌و سەرئەنجامە كە لەبەینی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێراندا بە ڕقەبەری یەكتری لـە خـاكی كوردستـانا ڕوویـداوه. لەوسـەردەمەدا ئـەم دوو حكومەتـە بـۆ داگـیركردنی كوردسـتان بـە گـژ یـەكاچوون و بـۆ نەهێشـتنی بـیری سـەربەخۆیی لـە كوردەكانـا زۆر خوێنیان ڕژاندووه. بە پێی بژارەی (شەرەفنامە) لە پێشا كوردستان زۆرگـەورە بـووه، بـەڵام بـە سیاسـەتی نـاوخۆی توركـەكان لـە دواییـدا بچووككراوەتـەوه. لـە هـەوڵ‌و تەقـەلآدانی سیاسـیی و عەسـكەری ئـەم سـێ سـەدەیەدا تـورك لـە ئـێرانی زیـاتر دەستكەوتووه. زۆربەی سەرزەمینەكانی كوردستانی ڕۆژاوا لەگـەڵ كوردسـتانی نـاوەند بۆ توركەكان ماوەتـەوه. تـەنیا تەقـەلاكانی (نادرشـاه) نـەبێ نـەختێك دەستەلآتی لـە ئێرانا نواندووه، ئەگینا دەوڵەتە بەچنگەكەی ئێرانی پێشوو نـەماوه. وایلـێهاتووە كـە عوسمانییـەكان لـەئێران پـەروایان نـەماوه، بـەڵكو لەوكاتانـەدا خـەریكی بەجێـهێنانی سیاسـەتی مەركـەزیی ناوخۆیـانبوون، ، یـەعنی شـكاندنی دەسـتەلآتی ئەمارەتـەكانی كـوردو لـەناو بردنیـان ئامـانجی حكومـەتی عوسمـانیبووه. ئەمـەش بـە ئـەنجاه

سەریگرتووە. کە مرادی چوارەمی پادشای عوسمانی بەغدادی گرت، ئەحمەد پاشا؛ زاوای کرد بە والی دیاربەکر. ئەمجا ئەم پیاوە دڵڕەقە بووەتە ملۆزمی سەربەخۆیی ئەمارەتەکانی کورد. بەهەموو جۆرێك شەڕی پێفرۆشتوون، لەناویبردوون، تەمر ولاتانی کردوون. ولاتەکانی لەدەست سەندوون. ئومەرای (عەمادیەو بیتلیس شووشیك)و جێگایانی تری لەناوبردووە. ئەم کابرایە ٢٠ ساڵ زیاتر لەتەك کورد بەخراپەکردن ڕایبواردووەو سەیر ئەوەیە کە دووبەشی ئەم خراپانەی خۆ بەخۆ بـ کوردەکان ئەکرد. تاقم تاقم لەگەڵ خۆیا ئەیبردن و بەگژ یەکیا ئەکردن، تاکو بە سیاسەتە لە (١٠٧٠هـ ١٦٥٩م) دا کوردستانی بەتەواوی بچووککردووەتەوە. لەبەرئەو بەشی زۆری ئەو دەرەبەگانە لەوێنەی ئەمارەتیی دەرچووە، وەیا خراوەتە ولاتەکانی تری تورکیا. ئەمارەتی بابان لەپاش ئەم سەردەمە لە (شارباژێڕ) پەیدابووە. لەمەو کوردی عێراق زۆر خزمەتی دەوڵەتی عوسمانیی کردووە. گەلێکجار لەشکری کورد بە سەرۆکایەتی سەرداری خۆی ڕوویکردووەتە ئێران بۆ بەرژەوەندی عوسمانییەکان لەشکری عەجەمی شکاندووەو بەڕشتنی خوێنی خۆیان ویستوویانە هەمو کوردستانی ئێران بخەنە ژێرحوکمی عوسمانییەکانەوە. کەچی والییەکانی عوسمانی بەغداد لە دوای ئەم سەرکەوتنانە لە باتی پاداشتی چاکە ئەکەوتنە تەدبیرو تەقەلای زیان لێدان و لەناوبردنی ئەمارەتەکانی کوردی (سۆران)و (بابان). (١١٣٥هـ ١٧٢٢م) لەم سەردەمەدا دەستەلاتی صەفەوییەکان لە ئێرانا ئێجگار کزبووە. ئەمیرەکانی ئەفغان خەریکی داگیرکردنی هەموو خاکی ئێران بوون. بەڵکو ئەیانویست کوردستانی ئێرانیش لە حکومەتی عوسمانیی بسێننەوە بۆخۆیان. بەلام عوسمانییەکان بەیارمەتی لەشکری کورد هەمەدانیان لە ئەفغانەکان سەندووەتەوە، ئەمجا ڕوویانکردووەتە (تاران) ویستوویانە پایتەختەکەش بگرن و حکومەتی ئێران بەتەواوی لەناوبەرن. لەملاوە ئەشرەف خانی ئەفغانی بە سوپای خۆیەوە هاتووە بەپیر ئەم سوپا سەرکەوتووەی عوسمانییەوە. بەناوی سوونییەتی ئەفغانەکانەوە، بە چاوڕا سەردارانی کوردی سەربە عوسمانی تەفرەداوەو بە هیوای مەسنەدو ڕوتبەو نیشانو خەلاتی گەورە ئەشرەف خان ئەمانەی هەڵخەڵەتاندووەو لە مەیدانی شەڕ

.ووریخستوونەتەوە، وەك لە باسی بابانا وتمان ئەومبوو (خانە پاشا)ی بابان
ەمەیدانی شەڕا لە عوسمانییەکان جیابوەوە. بەوە لەشکری عوسمانی شکاوەو زۆریان
ێکوژراوەو ئەوی دەرچووە گەڕاوەتەوە بەغداد. لەدوای ئەم ڕووداوانە هەردوو
حکومەتی عوسمانی و ئەفغان ئەمجا لای ناشتییانگرتووە. لە بریتی ئەوە کە
حکومەتی عوسمانی شاهێتی ئێرانی بۆ ئەشرەفخان بەڵێنداوە، حکومەتی ئەفغانیش
وڵاتی کرماشان و هەمەدانو ئەردەڵان و لوڕستانی داوە بە حکومەتی عوسمانی. جا
بەوجۆرە لە بەینی هەردوولادا (پەیمان) بەستراوە. جا بێینەوە سەرەوکاری
کوردەکان. بەشی ئەمانیش لە شەرمەزاریی و بێبەهرەیەتی تەربییەی سیاسی زیاتر
هیچیان بۆ نەماوەتەوە.

**٢- کورد لە سەردەمی( نادرشاە)دا (١٧٣٠م):**

نادرشاە لە مرۆڤە هەڵکەوتووەکانی مێژووە. لە دوایی سەدەی ١٧ ی زاینیدا لە
سەرزەمینی ئێران لە عێلی ئەفشار پەیدابووە. لە هەرزەکارییدا جارێ بووەتە شوان.
لە دواییدا بووەتە جەردەو هاتووەتە کایەوەو خۆی ناوناوە (تەهماسب قولی).
لەبەرئەوەی ئێرانییەکان حەزیان لە حوکمی ئەمەرای ئەفغان نەئەکرد. تەهماسب
قولی زۆر بە وریایی ویستوویەتی لەم دژوێنی خەڵکە قازانج بکات و شوێنی خۆی
لەئێرانا بەرزبکاتەوە. لەبەرئەوە بە داوای هێنانەوە کایەی مافی خانەدانی
سەفەوییەکانەوە هاتووەتە مەیدان. جا بەو هۆیەوە شاهزادە (تەهماسبی دووەم)ی
کردووە بە شاهی ئێران لە ١١٤٢هـ ١٧٢٩م دا. (نادر قولی) دووجار ئەشرەف خانی
ئەفغانی لە شەڕا شکاندووەو لە دواییشا لە شیراز گرتوویەتی و کوشتوویەتی.
بەمجۆرە حکومەتی ئێرانی سەربەئەفغانی لەناوبردو حکومەتی سەفەوی بەناو
ژیاندەوە. بەڵام ئەمە راست نەبووە، بەڵکو بەڕاستی حکومەتی (نادریی) پەیدابووە.
لەپەیدابوونی شتی تازەی مێژوویی ڕۆژهەڵاتی نزیکا کوردەکان هەمیشە لە نارادا
بوون و بەخوێنی ئەمانە - ئەو کارەساتە مێژووییانە هاتووەتە بەرهەم. لە
حکومەتی نادرشاە هەمان شت ڕوویداوە، یەعنی بە زۆری بازووی کوردان بناغەی ئەم
حکومەتەش دانراوە. تیپی هەرە ئازاو بەکاری لەشکری نادرشاە ڕۆڵەی کوردو ئەفشارە

بووه. لەدوای ئەمە نادرقولی کە لەحکومەتی شاە تەهماسبی دووەمدا هەرخۆی حیساب بوو- داوای وڵاتەکانی خوارووی ئێرانی کرد کە ئەشرەف خان دابووی بە حکومەتی عوسمانی، بۆیە لەناکاو لای هەمەداندا دای بەسەر لەشکری عوسمانیداو شکاندی وە تا لای خانەقین بە شوێنیەوە بووه. لەسەر ئەمە لەمیانی هەردوو دەوڵەتدا ئاگری شەڕ لە ١١٤٠هـ ١٧٣١م دا داگیرساوەو زۆر درێژەیکردووه. گەلێجار نادر قولی بە لەشکری گرانەوە هاتووەتەسەر عێراق، (بەغداد)و (موسڵ)ی پێچاوەو لەگەڵ لەشکری عوسمانی لەگەلێك جێگادا شەڕیکردووه. جاروبار شکاوەو گەڕاوەتەوە ئێران، بەڵام دیسان لەگەڵ لەشکری قورسا هاتووەتەوەو عێراقی شێلاوە. لەم شەڕانەدا کوردستان تووشی ماڵوێرانیی بووه. لەبەر دڵرەقیی و زۆرداریی و زەلالەتی (نادر قولی) سەردارانی کورد لێیڕەنجاون، لەبەرئەوە هەتا توانیویانە لای عوسمانییەکانیان گرتووه. لەسەرئەمە نادرقولییش بووەتە دوژمنی کورد. نادرشاە ئەم جۆرە کوردانەی لە دوای تاڵانکردن دەربەدەر کردووە وە یا کوشتوونی. بەم بۆنەیەوە گەلێك خێڵی کورد لە ڕۆژاوای ئێرانەوە بۆ ڕۆژهەڵات وە یا باشووری ئێران دەربەدەرکراوە. ئەم شەڕە قورسانە هەتا ساڵی (١١٤٧هـ ١٧٣٤م) درێژەیکردووه. ئەوسا لەسەر مەرجی ئاشتی پەیمانی (سوڵتان مرادی چوارەم)ی پادشای عوسمانی هەردوولا ئاشتبوونەتەوە، وە سنووریان وەك جاران داناوەتەوە، یەعنی ڕیزەچیای زاگرۆس بووەتەوە بە سنووری هەردوو دەوڵەتەکە. لە ١٧٣٨ی زایینیدا تەهماسب شای دووەم مردووه. نادر قولی خان کوڕێکی بچووکی ئەم تەهماسب شایەی بەناوی شاە عەباسی سێیەم خستووەتە سەر تەخت. بەڵام زۆر زوو ئەم منداڵەی دەرکردووەو خۆی داناوە بە شاە یەعنی بووەتە (نادرشاە). لەساڵی ١١٥٤هـ ١٧٤١م دا شەڕی دووبەرەکیی ئێران و عوسمانی دەستیپێکردووەتەوە، لەشکرێکی گەورەی تریشی بەسەر شارەزوورو کەرکووکا ناردووەتە سەر موسڵ چووە ئەوێشی پێچاوە. ئەم زرمە زلەو هەرایە دیسان چەند ساڵێك درێژەیکردووه. بەڵام بەئەنجام هەر کوردستان پەرێشان بووه، چونکە لەشکری ئێران لەم جەنگانەدا سەرنەکەوتووە گەڕاوەتەوە دواوەو ئەم شکستانەشی لە چاوی کوردەکانەوە دیوە. بۆیە لە ١٧٤٧ی زایینیدا بۆ تەمێ کردنی ئەم کوردانە بۆ خۆراسان

دەربەدەری کردبوون نادرشاە بەلەشکرەوە چووەتە سەریان، بەرەگەتدا بەم ئاواتە پیسەی نەگەیشتووە، لە ڕێگا کوژراوە..

لەدوای نەمانی نادرشاە ئێران شێواوە، هەلێکی تازەی سەربەخۆی بۆ کورد پەیدابووەتەوە. بەڕاستی ئەم هەلە زۆر بەجێ و بەڕێ بووە، چونکە لە ئێران حکومەت نەبووەو حکومەتی عوسمانییش لەبەر تەکانی ڕووسەکاندا زۆر بێتاقەت بووە. هۆشی یەکگرتن و بزوتنەوەیەکی بەجێ لەمکاتەدا بخرایەتەکار، بێگومان یەکیەتی سیاسی میللەتی کورد دروستئەبوو. بەڕاستی کوردی ئێران لەمکاتەدا کەوتووەتە تەقەلاو (حکومەتی زەند) لە ١٧٥٢ی زایینیدا دامەزراوە. ئەگەر ئەو دەوڵەتەو حکومەتی سۆران و ئەمارەتی بابان لە کوردستانی عوسمانیدا یەکگیر ببوایەو ئەم سەرحکومەتە سنووری یەکتریان دانایە بە بناغەو بۆ پاراستنی کەیانی نەتەوایەتی دەستیان بدایەتە دەستی یەك و (کونفەدراسیۆن)ێکی جمهووریان پێکەوەبنایە هیچ نەتەوەیەکی تر نەیئەتوانی بەرامبەریان بوەستێ. بەلام سروشت لە کوردستانا تالعی هاوڕێی عەقلْ و تەدبیر دروستنەکردووە. لەبەرئەوە ئەم سێ حکومەتە هەریەکە لە خاکەکەی خۆیا گیرۆدەی فیتنەو ئاکۆکیی ناوخۆی بووە نەیپەرژاوەتە سەر بەرژەوەندی گشتی حکومەتەکانی تر، بەڵکو ئەمە هە بەخەیاڵیشیانا نەهاتووە. کە حکومەتی کوردی زەند لەناوچووە و ئاغا محەمەد خانی قاجار هەموو ئێرانی خستە ژێرحوکمی خۆیەوە، بۆ کزکردنی دەستەلاتی کورد ئە ئاغا محەمەدخانە زۆر هەوڵیداوە. جارێ تیرەی زەندی لەناوبردووە. ئینجا تیر کوردەکانی تریشی بەملاوبەولای ئێرانا دەربەدەرکردووەو حکومەتی قاجار ب دەستەلات پەیداکردن لە ئیشوکاری ئەمارەتەکانی بابان و سۆرانا لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا گەلێك شەڕیکردووەو بەهۆی ئەمەوە کوردستان وەك هەموو جارەکانی ئەمجارەش ماڵوێرانی پێبڕاوە. عێلانی (شوکاك) لەم سەردەمەدا ناوی پەیداکردووە.

**٣- کورد: لە ١٥٠ ساڵی دواییدا ١٧٥٠ - ١٩٠٠ی زایینی:**

کورد لەم ١٥٠ ساڵی دواییەدا بیری سەربەخۆیی و دەماری نەتەوایەتی زۆر تەند بووە. لەوەپێش هیچ کاتێك بەمجۆرە کزو بێدەستەلات نەکراوە. گومان نییە ئە

نشوسته له رووی ناكۆكیی و بەربەرەكانی سەردارەكانیانەوە بەسەریانهاتووە. ئەوە حكومەتە دەستەلاتدارەكانی بەسەرا زالكردوون كە عوسمانی و ئێرانییەكانن. لە كوردستانی عێراقدا ئەمكاتەی لای سەروو دەوری فەرمانڕەوایی ئەمارەتی سۆران و بابانەو لە ئێرانیشا سەردەمی حكومەتی زەندە كەوا باسمانكرد. بێینەوە سەر كوردستانی ڕۆژاوا لەوێشا تەقەلای عێلاتی میللی كە سەرۆكەكانیان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی لە ناوچەی ئۆرفەو ماردێندا كردوویانە. دیارە بەهۆی هەڵسوڕانی ئەمیرەكانی بابانەوە هاتوچۆی لەشكری ئێران و عوسمانییەكان بۆسەر یەكتریی كوردستانی عێراقی بێژاوە. خەلكی كوردستانی ڕۆژئاوا لەناوچەی شاخستانی ماردێن و توری عابیدیندا لە وێنەی كۆمەڵە عەشیرەتیدا بوو وە بەشی زۆری ئەهالییەكەش كورد بووە. ئەمانە تێكڕا ناویان عەشایری (میللی) بووە كۆگایەكی قورس و دەستەلاتداربوو هەر پێویستی بەسەردارێكی زیرو ئەبەز بوو. لە ١٢٠٠هـ ١٧٨٥دا ئەم سەردارەشیان بۆ پەیدابووە ناوی تەیموور پاشا بووە. ئەم پاشایە خانەدان زادەیەكی بەناوبانگی كورد بووە. لە ئەستەمبوڵ خوێندوویەو لەوێ گەورە بووە. سەردەمێك هاتووەتە ناو عەشایری میللی و بووەتە سەرداریان. لەشكرێكی زیركەلەی لە كورەی كۆمارەكان پێكەوەناوەو ئیشوكاری ئەوناوەی خستووەتە ژێر دەستەلاتی خۆیەوە. بەلام ئەمە مەترسیی والییەكانی توركی ئەوناوەی زیادكردووە لەسەرئەوە خێرا كەوتنەخۆیان لە هەمووولایەكەوە بە لەشكرەوە كە بەشی زۆری ئەم لەشكرەش كورد بوو لە ١٢٠٦هـ - ١٧٩١م دا هاتوونەتە سەری وە شەڕیان لەگەلا كردووەو شكاندوویانە. سلێمان پاشای والی بەغداد كە سەرداری گشتی ئەم لەشكرانە بوو لە دوای ئەم سەركەوتنە عەشایرە میللییەكانی زۆر بەسەختی تەمێكردووەو گەلێكی لە ماقووڵەكانیان كوشتووە. بناغەی ئەم هەرایانە لەبەر خراپیی جۆری ئیدارەی حكومەتی عوسمانییەوە هەومابوو چونكە ناوچەی ماردێن كە لەبندەستی دیاربەكرا بوو، بەو دوورییە بە بەغداوە بەسترابوو، زۆرداریی و بەرتیلخۆریی لە ئەندازە بەدەربوو. بێئیداریی و پاشاگەردانیی، ئارامی لەوناوەدا نەهێشتبوو. حكومەت بەسایەی یارمەتی عەشایرەكانەوە توانیویە یاخیگەرێك تەمێ بكات.

لەدوای سێ ساڵ حکومەتی عوسمانی تەیموور پاشای بەخشی بەلام نەیانناردەوە ئەوناوە جارێکیتر. لەمسەردەمەدا کە هەرای محەمەد علی پاشای خدێوی میسر بەدەستەوە بوو ئەگونجا شتێکی تازە بکرێ، کەچی هیچیان بۆ نەکراوە، چونکە محەمەد علی پاشای خدێو کە بەرەگەز کوردە لە محەمەد پاشا کوێرەی سۆران داوایکرد کە پەیمانێك ببەستن و خاکی عوسمانی لەناوخۆیانا دابەشبکەن. لەسەرئەوە خەریکبوون شتێك بکەن. بەلام ئینگلیزو فەرەنسییەکان ئەمەیان بیست ئەیانهێشت سەربگرێت. عێلی (حەیدەرانلی)ی کورد لەم سەردەمەدا لەتاو زەبرو زۆری حکومەتی ئێران نیشتمانی خۆیان بەجێهێشتووەو هاتوونەتە ناوچەی مووش لە ئەنەدۆڵ. ئەمە بوومتە هۆی ناخۆشیی سیاسیی لە میانی حکومەتی ئێران و عوسمانیدا. یەکیەتی فەرمانڕەوای ئێران لەمسەردەمەدا بەتەواوی شڵەقاوە. حاکمی ناوچەکانی ئێران لەبەر ئەپرسینەوەی حکومەت وەك سەربەخۆیان لێهاتووە بۆ دەستدرێژیکردن لە سنووری عوسمانیدا. ئەمانە لەبەر بێئاگاداری (تاران) هەمیشە لە بیانوو ئەگەڕان بەلەشکرەوە ئەهاتنە خاکی کوردستانی عوسمانی و قەلاکانی سەر سنووریان داگیرئەکردو ماڵو ئاژاڵی ئەهالییان بەتاڵان ئەبرد. تومەز شەڕە کوشندەکەی ڕووس کە عوسمانییەکانی تیا شکابوو و زۆرداریی کاربەدەستانی، حکومەتی عوسمانی ئەوەندە شپرزە کردبوو بەرامبەر دەستدرێژییەکانی ئێران هیچی پێنەمابوو (١٨٥٠م). جا لەم کاتی کزێتی حکومەتی عوسمانییەدا کوردەکان بۆ سەندنەوەی ئازادیی جارانیان تەقەلایانداوە. هەروەکو زاناکانی ڕۆژاوا وتوویانە لە بەینی هەراو هوریای دوو سەدەی دواییدا هەندێك لە ئەمارەتەکانی کورد چەندجارێك بەهۆشێکی میللی و بە هیوای سەربەخۆیی هەستاونە پێ وەك لای خوارەوە بە کورتی باسیان ئەکەین.

## بەکورتی تەقەلای دوایی کوردەکان

لە سەدەی نۆزدەهەمەوە کیشوەرەکانی عوسمانی زۆر پەرێشان بوون. حکومەت ئەینەتوانی دانیشتوانی ولاتەکان لە دەستدرێژیی دەرەبەگ و ستەمکارو جەردەو سەرداره زۆردارەکان بپارێزێت. جا بۆئەوەی لەدەست ئەم عوسمانییانە ڕزگارببن گەلێك شۆڕش پەیدابووە لەولاتی عوسمانییدا. یەکێ لەوانە شۆڕشەکەی محەمەدعلی

گەورەیە لە میسر. دەنگی ئەم شۆڕشە ڕزگاریانە بەهەموولایەکی ولآتەکەدا بلآوبووەتەوە لەبەرئەوە سەردارەکانی کوردیش گەلێك شۆڕشی نیشتمانپەروەرانەیان کردووە[4] لە کوردستانەکاندا تاکو لەحوکمی عوسمانییەکان ڕزگارببن. لە ولآتی ئێرانا حالٚ بەدتر بووە وەك لە عوسمانیی. بۆیە لەوێیشا کوردەکان بۆ سەربەخۆیی گەلێك شۆڕشیان بەرپاکردووە. ئەم شۆڕشانە لەسەرەتای چەرخی نۆزدەهەمەوە دەستپێنەکا تا ئێستا نەپساوەتەوە. ئەوا لای خوارەوە گرنگەکانیان بە کورتی ئەگێڕینەوە. (بەکر بەگ)ی کوڕی سلێمان بەبە لە ١٧١٦ی زایینیدا بۆ ڕزگاربوونی کورد لە چنگ بێگانە بەرامبەر بەحکومەتی عوسمانی هەلٚساوە. بەلآم بۆی نەچووە سەرو کوژرا. لە بابانەکان سلێمان پاشای خالد پاشا لە ١٧١٦ی زایینیدا بە هیوای ئەوە سەربەخۆ بژی بەلەشکرەوە چووەتە سەر بەغداد. بەلآم لە قەشقە (جەبەل حەمرین) شکاو گەڕایەوە دواوە. لەسەرئەوەشا هەتا مردن سەربەخۆ ژیاوە. (عوسمان پاشا) کوڕی مەحموود پاشای بەبەش لەگەلٚ والی بەسرەدا پەیمانیکردووە کە هەریەکە لە جێی خۆیا ببێتە سەربەخۆ. بەلآم دەنگەکە ئاشکرابوو، وە تەدبیرەکەیان بۆ نەچووەتەسەر (١٧٨٩م). (ئەوڕەحمان پاشای بابان) ئەم ئەمیری کوردە لە ١٧٨٨ی زایینییەوە ٢٤ سالێك پچڕ پچڕ حاکمی بەبە بووە، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی و حکومەتێکی گەورەی کوردی پێکەوە بنێ، سێ جار لەگەلٚ سوپای بەغدادا شەڕیکردووە، ڕووداوەکان وا ئەنوێنن کە لەبەر نالەباریی خزمەکانی و چەکی زۆرو هێزی زیادی دوژمنەکەی دەرەقەت نەهاتووە. هەرچەندە کە یەکەمجار شکا هیوای نەبڕی. دووجاری تریش پەلاماریدانەوە، بەلآم بە مراد نەگەیشت نەیتوانی دەولەتێکی بەهێز پێکەوە بنێ.

***تەقەلای حەمەد پاشای ڕەواندوزی:***

ئەم ئەمیرە بەرزە کە ناوبانگی لەناو کوردەکانا بەمیرە کوێرە بلآوبووەتەوە لە ١٨٢٦ی زایینیدا بووەتە حاکمی سۆران، وەکو لە باسە تایبەتییەکەیا درێژمان

---

[4] ئەو داستانە لە کتێبی (مێژووی نوێ)ی وەزارەتی زانیاریی عێراق وەرگیراوە. کە بۆ قوتابییانی پۆلی شەشەمی مەکتەبەکەیان لە چاپیداوە لە ١٩٦٠دا، لاپەڕە ١٤٥ تا ١٦٥.

ردووەتەوە، ئەم ئەمیرە بەرزە بە بیرێکی میللی زیندوو ویستوویەتی حکومەتێکی
ۆرگەورەی کوردیی سەربەخۆ پێکەوە بنێ. جا بەم بیرەوە هەر لە (زێی کۆیە) وە تا
اوچەی ماردێن هەموو ولاتانی کوردی خستە ژێر حوکمی خۆیەوە، ئەوەبوو
حکومەتی عوسمانی لەم دەستەلاتە ترسی پەیداکردو لەشکرێکی گەورەی ناردە سەر
میری سۆران خەریکی تەدبیری شکاندنی ئەم سوپا قورسە بوو. ئەوەبوو بەناوی
یانەتەوە بەفێڵ لەشکرەکەیان لێهەلگێڕایەوەو ئەو هەموو رەنجەیان بەبادا.

## شۆڕشی ئیسماعیل پاشای بادینان:

ئەم ئەمیری کوردەش بۆ ئازادیی زۆر هەوڵیداوەو لەگەڵ لەشکری والی موسڵدا
گەلێ شەڕیکردووە گەلێ جار قەلاکەی سەندووتەوە. پایتەختی بوو پێچاویانەو
دەربازبووە. بەلام قەلاکەی سەندووەتەوە. ئەمجا خۆی بە لەشکری بادینانەوە
چووەتە سەر موسڵ، دەورو پشتی شارەکەی تالانکردووە لە دواییدا لە ١٨٣٤ی زایینیدا
لە موسڵەوە لەشکرێکی گەورە چووەتە سەر نامێدی. لە دوای پێچان دوژمن قەلاکەی
گرتووەو ئیسماعیل پاشا بە دیلگیراوەو لە بەندیخانەی بەغدادا ماوەتەوە هەتا
مردووە. بەمجۆرە تەقەلاکانی ئەمیش بەسەرچووە کە ئەبوایە ئەم مەردارانە وەك
برا یەکیان بگرتایە نەك تاکو تووك لەناو چوونایە.

## شۆڕشی بەدرخانیەکان:

پەیدابوونی ئەمیربەدرخان و مەبەستەکانی:

لە ساڵی ١٨١٢دا ئەمیربەدرخان بەڕێوەبردنی ئەمارەتی بۆتانی گرتووەتە دەست.
ئەم ئەمارەتە ئەمارەتێکی کۆنی بچووکبوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا. بەلام
بەڕێوەبردنی ناوخۆ بەدەست سەردارەکانی ناوخۆیانەوە بووە. ئەمیرەکان لەشاری
جەزیرە دانەنیشتن لە باکوری ڕۆژاوای زاخۆ لە تورکیای ئیستەدا. میر بەدرخان
ئەیویست ئەمارەتەکەی گەورە بکاو دەسەلاتی بۆگەنی عوسمانی لەناو بەرێت، نەك
هەر لە ئەمارەتەکەی خۆیدا بەلکو لە هەموو کوردستانا. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە
یەکەم هەنگاوی ئەوەبوو لە پایتەختەکەیا کارگەیەکی چەك و کەرستەی جەنگ

دروستبکات. دووەم هەنگاوی ئەوە بوو هەموو ئەمارەتە کوردەکان بانگ بکات بۆ یەکگرتنێکی گشتی وڵاتی کورد، تاوەکو لە چنگ فەرمانڕەوا بۆگەنەکەی عوسمانی ڕزگارببن. بۆ ئەم مەبەستە هەندێ لە سەردارانی گەورەی کوردو زانایانی ئایینیش ئەم بیری ئەتەوایەتییەیان پەسەندکردبوو. ئەمیر بەدرخان دەستیکرد بە تارەکاتکردن. بەڵام بەهاندانی کاربەدەستانی تورک ئەستوورییەکانیان لێ یاخییکرد. بەدرخان ئەمانەی تەمێکرد. حکومەتی عوسمانی کە چاوی بەمە کەوت ترسا. لەلایەکی تریشەوە ئەوروپاییەکان لەسەر تەمێکردنی ئەستوورییەکان هاتەجواب و حکومەتی ئەستەمبوڵیان تەنگەتاوکرد.

ئەمیر بەدرخان جاڕی سەربەخۆیی ئەدات:

عوسمانییەکان کە کارگەیشتە ئەم پلەیانەو لە بیری ئەمیربەدرخانیش گەیشتن، سوپایەکیان ناردەسەر جەزیرە کە لەناویبەرن ئەمیر بەسوپا بچکۆلە ڕێکوپێکەکەی خۆی توانی ئەم سوپای عوسمانییە بشکێنێ. دوای ئەوە جاڕی سەربەخۆیی خۆی و جیابوونەوەی لە عوسمانیی دا. بەناوی خۆیەوە پارەی کوردیی دەرکرد. لە دیوێکیا نوسراو بوو (ئەمیر بەدرخانی بۆتان) وە لە دیوەکەی تر نوسرابوو (ساڵی ١٢٥٨هجری) کە ڕێکەوتی ١٨٤٢ی زایینییە. لە دوای ئەوە دەستەڵات و هێزی بڵاوبووەوە لە باکووردا تا (دیاربەکر) وە لە خۆرهەڵاتا تا(رضائیە)، یەعنی (ورمێ) لە ئێرانا. وە لە باشوردا هەتا نزیك شاری موسڵ دەستەڵاتی ڕۆیشتبوو.

## عوسمانییەکان شۆڕشەکەی لەناو ئەبەن:

کە عوسمانییەکان تێگەیشتن دەوڵەتەکەیان کەوتووەتە مەترسییەکی سەختەوە، لەڕووی دەستەڵات زۆریی بەدرخانییەکان، هێزێکی زۆرو پڕچەکیان ناردە سەریان. میربەدرخان ئازایانە شەڕی لەگەڵا کردن، بەڵام چاری نەکردن. لەبەرئەوە خۆی کێشایەوە جزیرەی پایتەختی و لەوێشەوە چووە قەڵایەکی زۆر سەختی ئەوناوە. شێرانە هەشت مانگ بەربەرەکانی ئەو لەشکرەی کرد کە دەقات لە لەشکرەکەی خۆی زیاتر بوو. دوای ئەمەش کە خواردن و تفاقیان ئەما بێنەوەی هیوا بڕێ لە قەڵاکە هاتنە دەرەوەو لەگەڵ چەند سەردارێکا خۆیاندا بە سوپای عوسمانییەکانا کە دەوریان گرتبوون. لەئەنجاما خۆی و دوو کوڕی بەدیلگیران. وە لە ساڵی ١٨٤٨م دا ئێردرانە ئەستەمبوڵ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی. بەم ڕەنگە ئەمیربەدرخان نەگەیشت بە ئاواتە پیرۆزەکەی کە ڕزگارکردنی ئەتەوەی کوردبوو لە دەست عوسمانییەکان. عوسمانییەکان ئەم سەرکەوتنەیان زۆر لاخۆشبووە. تەنانەت بەم بۆنەیەوە (نیشانی شەڕی کوردستان)یان بۆ یادگاری داهێناوە.

**کوڕەکانی بەدرخان لەسەر خەباتی باوکیان ئەڕۆن بۆ سەربەخۆیی کوردستان:**

لـەدوای ئەمـە بەدرخانییـەکان تـا شـەڕی تـورك و ڕووس کـە سـالّی ۱۸۷۷، بەبێدەنگمان. بەلاّم کە شەڕەکە هەلگیرسا کوڕانـی بـەدرخان لەسـەر داوای حکومـەتی عوسمانی بـەناوی (مجاهد)ی کـورد چوون بـۆ ئـەم شـەڕە. لەسـەر ئەوەشـا ئەمانـا چاوەڕوانی هەلکەوت بـوون. ئەگـەر ڕێکـەوت مەرامەکـەی باوکیـان زینـدوو بکەنـەوە لەبەرئەوە بە دزییەوە خۆیان گـەیاندە جزیـرە، لـەوێ جاڕی سەربەخۆییانداو کوڕی گەورەکـەی بـەدرخان (عوسمـان پاشـا) کـرا بـە ئـەمیرو بـەناوی ئـەوەوە خوتبـە خوێندرایـەوە، ئـەمجا دەستـەلاّتیان بەوناوچەیـەدا بلاّوبووەتـەوە تـا (جۆلـە مـێرگ)، (عەمادیە)و (ماردێن) حوکمیان ئەڕۆیشت. لەسـەرئەوە چـەندجارێك عوسمانییـەکان لەشکریان ناردوونـە سـەر. بـەلاّم بەدرخانییـەکان سـەرکەوتن. ئـەم شکستانە سوڵتان حـەمیدی خستە مەترسییەوە، لـە تـاوا سیاسـەتی گـۆڕی. بـەفێڵ لای ناشـتیی گـرت هەموو بەدرخانییەکانی بەرداو پیاوی نارده لای ئەمیر عوسمـان و پێـی وت کـە بـەبێ خوێن ڕشتن ئامادەیە گشت داواکانی کورد بە ناشتی قبوڵ بکات و خزمەکانیشـیان لـە ئەستەمبوڵ بـەرەڵلاّ کران. جا ئـەم قسانەیان بەڕاسـت دەرخسـت. ئـەمیر عوسمان دەستەو دایرەکەی بەم هەلاّتانە بڕوایان کردو لەگـەڵ تورکـەکان کەوتنـە گفتوگۆ. لـە ڕواڵەتا حکومەتی عوسمانی لە بابـەت ئیمتیـازاتی (کوردسـتان)ەوە سووك هەڵسووڕا تومـەز ئەمانـە بـۆ دڵنیـایی بەدرخانییـەکان بـوو. لـە پـڕ ڕۆژێـك لـەکاتی قسـەکردنا تورکەکان هەلاّتنـە سـەر ئـەمیر عوسمان‌و براکەی، هەردوکیان گرتـن و ناردیـانن بـۆ ئەسـتەمبوڵ لـەوێ دایاننـان. بەدرخانییـەکان لـە دوای ئەمـە جـارێکی تریـش تەقەلایانداوە لە سالّی (۱۸۸۹م)دا کوڕانی بەدرخان ئەمین عەلی بەگ و مەدحەت بـەگ تێهەڵچوونەوە. لە ئەستەمبوڵەوە چوونە (ترابزوون)و هەندێك لە کوردەکان هاتن کە بیانبـەن بۆ کوردستان تـا لـەوێ شتێك پێکـەوە بنێن. بـەلاّم حکومـەت وریـابووەو بەهـەموو لایـەکا لەشـکری ئـەنارد ڕێگایـان لـێئەگرتن‌و شـەڕیان پێئەفرۆشـتن ئەیانشکاندن. وە لـەدوایيدا ئـەمیر زادەکانیش گیران و تەقەلاکەیان بێسـەرو شـوێن مایەوە.

## هەوڵ و تەقەلای ئەمیر عزالدین شێری بۆتانی:

ئەمە سەرداره ناحەزەکەی لەمەڕ بەدرخانە. بەهۆی نامەردییەکەی ئەمەوە ئەوەبوو بەدرخان لەناوچوو. لەدوای تەفروتوونابوونی بەدرخانییەکان ئەم کابرایە وایئەزانی ئیتر دنیا بۆ ئەو تەخت ئەبێ. کەچی لە دواییدا تێگەیشت کە حکومەتی عوسمانی بەتەمای لەناوبردنی ئەویشە. ئەوسا حاڵیی بوو کە کردەوەکەی پێشووی شتێکی نابەجێبووە. لەبەرئەوە لە ئەمارەتەکەی خۆیا لە (بۆتان) بەرامبەر بەحکومەت، هەڵسا، وە سەردەمێك لەوناوەدا بەسەربەخۆیی مایەوە. لەسەرئەوە حکومەتی عوسمانی دووجار لەشکری ناردووەتە سەر. هەوەڵجار لەشکری حکومەت شکاوە. بەڵام دووەمجار عزالدین بە خۆی و سوپاکەیەوە تەفروتوونا بووە (١٢٨١هـ ١٨٦٤م).

## تەقەلای شێخ عوبەیدیللا ١٨٧٧م:

لەدوای شەڕی عوسمانی و ڕووس، ساڵی ١٨٧٧م لە قەزای (شەمدینان) یشدا بۆ سەربەخۆیی سەندن شۆڕشێکی گەورە بەرپاکراوە سەردارو ڕێکخەری ئەم هەرایە شێخ عوبەیدللا ناوە. شۆڕشەکە بەناوی ئایینەوە هەڵگیرساوە وەك دەستپێکردنەکەی شاە ئیسماعیلی صەفەوی. کەلە ئێران دەستیپێکرد. ئەمیش وایە چونکە هەردوولا بە کینەو ڕقەبەری (مەذهەب) شۆڕشەکانیان هەڵگیرساندووە. پێشداری هەردوکیان مریدو دەروێش بووە بەو هۆیەوە ویستوویانە دەستەڵاتێك بۆخۆیان پێکەوە بنێن. ئەگەر شێخ عوبەیدوڵڵاش وەك شاە ئیسماعیل بەکردو بزان بوایە بەئاوات ئەگەیشت، بەڵام وەها دیارە شانس بۆ شێخ عوبەدیللا ڕێکنەکەوتووە لە ئازایی و زیرەکییشا وەك شاە ئیسماعیل نەبووە. بۆیە تەقەللاکەی ئەم هیچ سەرینەگرتووە. ئەگینا ڕێکەوت بۆ شێخ عوبەیدڵڵا زۆرباش هاتووە. چونکە لەپاش شەڕی ڕووس لە ساڵی ١٨٨٠م دا حکومەتی عوسمانی زۆر هیلاكو بێهێزبووە کە شۆڕشەکەی شێخ دەستیپێکرد. لەوکاتەدا لەشکری شێخ زۆر بەکاروئازا بووە و بۆ شێخ گیانفیدا بوون. لەبەرئەوە هەر کە شێخ ئیشارەتیکرد وەك برووسکە پەلاماری (ورمێ)و (سابلاغ) - مەهابادی ئیستە- و (موکری) یان داو گرتیانن. خەڵکی ئەوناوە هەموو کوردو سوننی مەذهەبو

مریدی شێخ بوون. لەبەرئەوە فەرمانی شێخیان خێرا بەجێهێنا. بەڵام لەدوای ئەم بەرهەمە کورتە کینەو رقەبەری مەذهەب خۆیدەرخست. ئەمجا چوون بەگژ شیعەکاناو زۆریان لە یەکتری کوشتووە. ئەم گوشارە دەریخست کە ئەم هەرایە ناکۆکیی مەزهەب هەڵیگیرساندووە. جا لەبەرئەوە سیاسەتی حکومەتەکانی عوسمانی و ڕوس و ئێرانی ئەوکاتە بۆ لەناوبردنی ئەم ئافەتە یەکیگرت هەرسێ لا سوپایان نارده سەر شێخ. لەدوای شەڕو خوێنڕشتنی دوورو درێژ شێخ بەلەشکری شکستەوە گەڕایەوە (شەمدینان) لە ١٨٨٤م دا جارێ بردیان بۆ ئەستەمبوڵ لە دواییدا ناردیانە (حجاز) لەوێ لە (طائف) لەناویانبرد.

## وتاری تەئریخی

ئەم هەوڵ و تەقەلایانە کە باسمانکردن لەگەڵ تەقەلاکانی (جان پۆلاد)و (ئەمیرخانی برادۆست)و ئەوانی تر گشتی بۆ یەك ئاوات بووە. ئەویش بۆ ئازادیی و سەربەخۆیی ئەتەوەی کورد کراوە. کەچی هیچیان سەرینەگرتووەو لەسەرئەوەشا زەرەرو زیانێکی سەرو ماڵیی زۆری بۆ کورد تیابووە. هەموو کەس ئەیزانی کە فەرمانی دنیایی لەهەوڵ و تەقەلاو سەبارەتی ڕێکەوە پێکدێ وە ئەگەر ئەم شتانە ڕێك ئەبوو، ئەو فەرمانەش پێکنایەت. ئەمجا تەقەلای ئازادیو هەوڵی سەربەخۆیی کوردیش کە سەرینەگرتووە گیرۆدەی ئەم یاسایە بووە. ئەگەر ئەختێك لەم هەرایانە وردببینەوەو لە دەوری درێژەو کوژانەوەیان سەرنج بدەین ئەبینین سەبارەتی سەرنەگرتنیان لەڕووی ناهەمواریی ناوخۆیانەوە بووە چونکە ئەتەوەکە هێشتا بۆ ئەمجۆرە شتانە پێنەگەیشتووە وە لەجۆری سیاسی دەورو پشتیان ئەوەندە ئاگادارنەبوون. بە کورتی لە تەربییەی سیاسی و ئیدارییدا ناتەواوبوون وەکو: لە هەرای جان پۆلاددا زوربەی لەشکری حکومەتی عوسمانی تاقمی کورد بوو کە بە گژ (میر علی)دا چوون و لەناویانبرد. واتە بەچەکی خۆیان خۆیان لەناوبرد. تەماشای مێژووی بابان بکەین ئەبینین ئەو هەموو هەراو خوێنڕشتنە کە پاشان بابان لە پێناوی سەربەخۆییدا کردوویانە گشتی بە هۆی ناحەزیی و دووڕوویی و خەیانەتی خزمەکانیانەوە سەرینەگرتووەو ماڵوێرانیشیی بەجێهێشتووەو تەقەلای سەربەخۆی

حەمەد پاشای ڕەواندزی کە بەو بەرزیی و پەسەندییەوە دەستپێکرد لەبەرسەبارەتەکانی لای خوارەوە نەومبوو ئەویش سەرینەگرت:

أ- کینەی ئایینو مەذهەب. بەپێی دەستووری ئایین لەسەر سیاسەت ڕۆیشتنو بە قسەی مەلا (کە لەسیاسەت بێخەبەرن) نیدارەی وڵاتکردن.

ب- لەتەك ئومەرای خۆیەتیدا با دراوسێیش بێت پەیمانو یەکیەتی بەستن نابێ فەراموش بکرێت.

ج ڕقەبەرییو ناهەمواریی ئومەرای بابانو بادینانو جزیرەو بۆتان لەگەڵ یەکدا. ئینجا ئەمانە بوو کە نەیانهێشت شۆڕشەکان سەربگرن.

بەڕاستی ئەگەر محەمەد پاشا ئەوەندە بەخۆناز نەبوایەو ئومەراکانی کوردی دراوسێیشی لەڕێی بەرژەوەندی گشتیدا وازیان لە حەسوودیی و ڕقەبەریی بهێنایەو هیچ نەبوایە هەر لەبەرئەوەی کە لەشکری بێگانەیان هاتبووە سەر، با بۆ ئەو کاتەش بوایە دەبوو یەککەوتنایە. بە طەبیعەت، ئەوسا حکومەتی عوسمانی بەزەحمەت دەرەقەتیان ئەهات، بەڵکو کارەکەشیان سەرینەگرت. بەڵام نارێکیی و لەیەکهەڵپچڕانی ناوخۆ لە قینی یەکتریی و لەگەڵ دوژمنا یەککگرتنو هاتنیان بۆ سەر نیشتمانی یەکتری، بوومتە هۆی لەناوچوونی هەموویان. بەڕاستی کردەوەی عوسمان پاشای میری بادینان لەم هەرایەدا داخی سەرداخانە، بۆئەوە ئەشێت کە بۆ پەندی پێشنان هەمیشە بیگێڕینەوە، کاتێك کە لەشکری عوسمانی لەگەڵ محەمەد پاشا تێکهەڵچوو، ئەم سەرکردەی کوردە لە دوورەوە سەیری لەناوچوونی محەمەد پاشای ئەکرد، کەچی ئەوەندەی پێنەچوو هەرئەو لەشکرە هاتە سەرخۆشی لە (عەمادیە)و گرتیانو بە قۆڵبەستراوی ناردیان بۆ بەغداد. جا بەمجۆرە ئەمارەتی (سۆران)و (بادینان) لەناوچوون و ئەمارەتی بابانیش هەر بەمجۆرە قینەبەریی و دووبەرەکییانە لەناوبرا. بێینەوە سەر سەرنەگرتنی تەقەلای (بەدرخان). هۆی ئەمیش دیسانەوە هی ناوخۆیە: ئەوە بوو (عزەالدین شێر)ی خزمی کە لەگەڵ تورکا یەکیگرتو چوون جەزیرەیان داگیرکرد، ئەمیشبوو بەهۆی شکان و لەناوچوونی بەدرخان. کەچی هەمان لەشکر لەپاش بەینێك چووە سەر عزالدین و ئەویشی لەناوبرد. دیسان لەبەر نیفاقو ناکۆکیی ناوخۆو هەستنەکردنی بەرژەوەندی نەتەوایەتیبوو کە حکومەتی عوسمانی توانی سوپای کورد بنێرێتە سەر ئەمارەتی بیتلیسو تەنگی پێهەڵچنێت، ئەوە بوو شەرەف بەگی ناخرین سەرداری ئەم ئەمارەتە گەلێك شەڕی لەگەڵکردن،

بەڵام چ فائیدە؟ هەر بەیارمەتی چەکی کورد بەنەنجام ئەم ئەمارەتەش لەناوچوو لە ١٨٤٩م دا. بەکورتی پیاوێکی بێگانەو لایەنگیریی نەکەری وەك (مێجەرسۆن) لەوەوە ئەڵێ: ((کورد هەمیشە سەرکێش، نەبەز، بەخۆ نازو دوور لە ئیطاعەت بووە تەنها بەشەڕوشۆڕو داوی ناوخۆی شکاوە. وە لە سایەی ئەم جۆرە کردەوانەوە دەستەڵاتی موستەولییەکانیان زیادکردووە. بەڕاستی مێژوو ناوێنەی عیبرەتە پەندوەرگرتن لە سەرگوزشتەکانی بۆ ئادامیزادو نەقوام ناچارییە. چونکە هۆی سەرنەکەوتنی نومەوور لەژیانا ئەوەیە. ئەویش وردبوونەوەی ئەوێ بۆئەوەی ناهەمووارییەکان دووبارە نەبنەوە. هۆی سەرنەگرتنی تەقەلاکانی کورد لەمەوپێش چی بووبێت، ئیمڕۆش هەر ئەوەیەو لەمەودواش هەر ئەوە ئەبێت. بۆ پێکەوەنانی ئازادییەکی سەربەخۆ لە پێش هەموو شتێکا دوانیان زۆر پێویستن: ((پوول‌و زانستی - علیم مال)) هەر نەتەوەیەك نابووتی ئەم دوو گەنج و جەواهیرە بێت سەربەخۆیی چنگ ناکەوێت، هەوڵەکانی بەباد ئەچێت، سیاسەتی گشتی یارمەتییشی بدات بەئەنجام خێر نابینێت و ناحەسێتەوەو بە جۆرێکی تر تووشی (دیلیی) ئەبێتەوە جا خوێندنەوەی مێژوو ڕاستیەتی ئەمانە بە ئینسان ئەسەلمێنێ.

## نەتەوەی کورد هەموو کاتێك بەکەڵك هاتووە

ئەوەتەی حکومەتی (فارس)ی کۆن (ماد)ی لەناوبردووە لە (٥٥٠پ.م)دا، نەتەوەی کورد تووشی یەخسیریی بووەو ئازادیی لەدەستچووە. لە مێژوودا گەلێك نەتەوە تووشی دیلیی وەهابووە، هەندێکیان بەجارێك نەماوە هەشە ژیاوەتەوە. جا نەتەوەی کورد لەمانەیە. بەڵام ئیستعمار وازی لێناهێنێ هەمیشە بە شوێنیەوە بووە ئەیهێشتووە بە ئاوات بگات‌و ئازادیی تەواو لە باوەش بگرێت. لەمێژوودا کە ئیمپەراتۆریەتە گەورەکان داهاتن، نەتەوەکان تووشی ئەم جۆرە ستەمانە بوون ئەمجۆرە ئیمپەراتۆریەتانە وەك مێژوو باسی ئەکا هەوەڵ کەرەت لە عێراق‌و لە میسردا پەیدابووە وەکو حکومەتی (سۆمەر)و (ئاکاد) لە عێراق. ئەوەبوو لەشکری ئەکاد چووە سەر نیشتمانی نەژادی کورد کە (گوتی)و (لۆللۆ) بوو داگیریانکرد لە (٢٧٥٠)ی پێش میلاد دا، وە ئازادییان لەدەست سەندن. لەدوای ئەوان ئیمپەراتۆریەتی گەورەکەی ئاشۆر پەیدابوو. کوردەکان ئەوسا خراپتر تووشی یەخسیریی بوون. لەدوای

ئەوە (خێڵی ئەخەمەنی)ی ئێران هاتنە پێشەوە، ئینجا ئەوان کوردستانیان داگیرکرد. لەو ڕۆژەوە کە ئەم مەینەتو کلۆڵییانە هاوشانی گەلی کورد بووە تا ئیمڕۆ ئەم نەتەوە گیان پاکە لە خزمەتو یارمەتیکردنی گەلان و کاربەدەستانی باش دریغی نەکردووە. هەر نەتەوەو حاکمێك چاودێریی کردبێ ولەگەڵیا بەچاکیی و دادپەروەریی هەڵسووڕابێ، هەمیشە خێری تووشبووەو لە ئازایی و توانایی جەنگی کورد کەڵکی دیوە. وە هەرنەوەمیەکیش ویستبێتی سزای بدا، ئەویش لە ڕوویا وەستاوەو بەگژیاچووە. لەشەڕو هەرای دەوڵەتە ئیستعمارییە کۆنەکانا کە (ئەشکانی و ساسانی و ڕۆمەکان)ن، دووبەشی مەیدانی شەڕ (کوردستانەکان) بووە. کورد لەمانە هەر لای نەتەوە ئارییەکان وەستاوە، هەتا توانیویانە خۆیان لەشەڕیان لاداوەو هەمیشەش ئامادەبوون کە ئازادییان لێبسێننەوە. کە ئیسلامییەت پەیدا بوو، دیسانەوە لەتەك ئێرانا ماوەتەوە. هەتا لەناوچوونی حکومەتەکەی، پێکەوە بەگژ لەشکری ئیسلاما چووەو زیانی زۆریان لێداون. بەڵام لەدوای گرفتاربوونیان بە لەشکری عەرەب، ڕەوشتو گوزەرانی باشی عەرەبەکان وای لەکوردکردووە موسوڵمانبوون. ئەمجا بوون بە پشتیوانی عەرەب، بەڵام هەر ئەوکوردانە لە گوزەران و سیاسەتی ئەمەوییەکان دلگیربوون. سەبارەت بەوە کوردەکان بوون بە دۆست و پشتیوانی عەبباسییەکان. تەنانەت سەرکردەی سوپای عەبباسی (ابو مسلم) ڕۆڵەی کورد بوو، وە سوپای هەرە باشی ئەبوو موسلیمیش لە کوردەکان بوو. ئەمەش بە شیعرەکانی (ابو دلامە)ی شایەری (ابو جعفر النمصور)دا دیارە وەکو ئەڵێت:

أبا مجرم مــــا غير الله نعمة   علــى عبده حتى يغيرها العبد

أفي دولة المنصور حاولت غدره   الا ان اهل الغدر آباؤك الكرد

کەچی کوردەکان زۆر ئیشوکاری ئەبووجەعفەریان لەکاتی وەلی عەهدییدا بەجێهێناوە هەتا بووەتە خەلیفە. سەلجوقیەکان لەگەڵ کوردەکانا باشبوون. مەلیك شای سەلجووقی لەسایەی بازووی کوردەوە لە وڵاتەکانیان ئیشی بۆ هەڵئەسووڕا. وتەی کوردستان لە دەوری سەلجووقییەکانا بڵاوبوەتەوە. شاە باز (ابو شجاع)ی مەلیکی کورد خەلیفەکانی عەبباسی لە زۆرداریی (آل بویەهی)یەکان ڕزگارکرد. کەلافاوی

تایەفەی غەزوی تورك دای بەسەر ولاتی ئیسلاما، کوردەکان گیانی خۆیان بەختکرد وە لە شەڕەکانی ئەهلی صەلیبدا کورد گیانی خۆی لە ڕێی ئیسلامەتییدا بەخت نەکردایەو سوڵتان سەلاحەدین و ئومەراکانی کورد فریانەکەوتنایە لە ئەفەریقای باکوردا ئیسلامەتی دەستەلاتی ئەنەما، مەسیحییەکان هەموویان داگیرئەکرد، لە پاش ئەمارەتە مەسیحییەکانی (خەصیب)یش زۆری کورد لەناویبردن. وەفاو یارمەتی بەنرخی کوردەکان ئەبوایە یاوز سوڵتان سەلیم پادشای عوسمانی بەزەحمەت بەسەر (شاه ئیسماعیل)ی صەفەویدا زاڵئەبوو صەفەوییەکان لە هێزی کورد زۆر کەڵکیار دیوە. لەوسەردەمەدا کوردەکانی موکریان بناغەی هەرە قایمی لەشکری ئێران بوور لەسایەی بازووی کوردەوە (شاه عەباس)ی صەفەوی لە (١٦٤٤م)دا توانی ئاسایش بداتەوە بە کیشوەری ئێران. بەرامبەر بە لەشکری ئێران حکومەتی عوسمانی هەمیشە کوردستانی کردووە بە بناغەی ڕەزمارایی بۆخۆی، سوپای لێدروستکردوون لە سەرزەمینی ئێرانا سوپاکانی ئێرانی پێشکاندوون. حکومەتی عوسمانی هەرا هورپای عەرەبەکانی باشوری عێراقی هەمیشە بە هێزی کورد دامرکاندووە. مێژووی ئێران و عوسمانیی پڕە لەمجۆرە ڕووداوانە کە ناتوانین لێرەدا گشتی بنووسین. خۆیار پێ لەم داستانە ڕاستانە ئەنێن. تەنانەت ڕووسەکانیش لەساڵی ١٨٢٩دا تیپێك لەشکریان لە نەتەوەی کورد دروستکردووە. حکومەتی عوسمانی کە ئیستە ناوی بووەتە (تورکیا) هیچ وەختێك وازی لە کورد نەهێناوە لە هێزو توانایان کەڵك سەندووەو ئەیسێنێ. ئیمڕۆ بەشی بەکاری سوپای تورك ڕۆڵەی کوردە وە لەم سەدە بیستەمەدا حکومەتەکانی ناوچەی ڕۆژهەلاتی نزیك وەك تورکیا و ئێران و عێراق سوریا، بەڵکو (ڕووس)یش بەناوی هاونیشتیمانییەوە خۆینی کوردەکانی ناو خۆیا ئەمژن و سوپای پڕ چەکیان لێدروست ئەکەن و ئەیانەوێ بە زۆری بازووی ئە کوردانە ئاسایش ڕاگرن!.

### کورد له چەرخی بیستەما پاش شۆڕشی ناوخۆیی ۱۹۰۸م

لەسەرەتای چەرخی بیستەما، حکومەتی عوسمانی زۆر بێتین بوو، لەناو دەوڵەتانا کەس لەحکومەتەکەی ڕازیی نەبوو. هەموو لەسەر پلەی شۆڕشکردن بوون. کورد، لەناو زۆرو ستەمی زیاد شۆڕشیکردووە. هیچ کاتێك ئەم نەتەوە بەدبەختە سەری دانەناواندووە بۆ فەرمانڕەواییەکانی عوسمانیی و ئێران. بەرامبەر بە زۆرو ستەمی والییە بەرتیلخۆرەکان خۆیان پێرانەگیراوەو ڕاپەڕیون. چەندجار شۆڕشیان هەلگیرساندووە داوای سەربەخۆیی تەواو ومیان سەربەخۆیی ناوخۆیان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا کردووە کە بییاندرێتێ. لەم کاتەدا عەرەبیش بۆ سەربەخۆیی وریا بووەتەوە ئێرانییەکانیش لەناوخۆیانا کەوتبوونە تەقەلا لەدژی حکومەتەکەیان. لەم هەنگامەدا لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە دژی حکومەت شۆڕش پەیدابوو و مەشرووتیەت داهات، یەعنی ئیدارەی (دیموکراتی). لە دوای ئەمە ناوی دەوڵەتەکەیان کرد بە تورکیا (۱۹۰۸م) ئەمجار ئەم تورکیای تازەیە لەگەڵ ئەڵمانەکانا بوون بە دۆست و کردیانە ناحەزیکردن لەگەڵ نەتەوەکانی تری ناوخۆیان. لەوکاتەوە دوژمنایەتی قەومی داهاتووە لە تورکیادا. ئەم (بیرە) بریتییە لەوەی هەوڵبدرێ بۆ بەرزکردنەوەی نەتەوەی خۆ لەسەر لاشەی نەتەوەکانی تر. واتە دوژمنایەتی نەتەوەیی بەجێبێنرێت. کاتێك کە تورکەکان بیری دوژمنایەتی نەتەوەییان دەرخست، دەستیانکرد بە زۆرکردن لە عەرەب و لە کوردو لە ئەرمەنی و گشت نەتەوەکانی تر، کە فێری زمانی تورکی ببن و گفتوگۆ بە زمانی خۆیان لە قوتابخانەو دائیرەکانی تری میریدا نەکەن، تەنانەت قەدەغەشیان لێکردن. ئەم کردەوە ستەمکارانەیە کوردەکان و نەتەوەکانی تری ناو دەوڵەتی تورکیای ڕاپەڕاند بۆ ئەوەی ئاگایان لەخۆیانبێت تاکو بتوانن پارێزگاریی زمانەکەیان بکەن و نەتەوەکەیان بپارێزن[5].

---

[5] باسی ئەم شۆڕشانە لە کتێبی مێژووی نوێ وەرگیراوە کە وەزارەتی زانیاری عێراق بڕیاری خوێندنی داوە لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی مەکتەبەکاندا بخوێنرێت.

**لە پێش جەنگی یەکەمدا کورد لە بارەی سیاسییەوە وریا بوومتەوە:**

لـەم دەورەدا کوردەکـــان دەســـتیانکرد بـــە دەرهێنـــانی ڕۆژنامـــەی سیاســـی بـ
بڵاوکردنـەوەی بـیرو پێکـهێنانی کۆمـەڵ کـە خـەریکی خـەبات بـێ بـۆ ڕزگاربوونیـا
یەکەم ڕۆژنامەیان ناوی (کوردستان)بوو* لە(١٨٩٧م)دا، لەدواییدا برایە (قاهیرە) لـەو
دەرنەچوو. کوردەکان لە ساڵی ١٩٠٨م دا لە ئەستەمبولْ کۆمەڵێکی سیاسییان پێکەو
(کۆمـەڵی بەرزکردنـەوەو پێشخستنی کـورد) وە کۆمــەڵێکی تریشـیان دامــەزراند بـ
خزمــەتی ئــەدەب و زانسـتیی بــەناوی (کۆمــەڵا بڵاوکــەرەوەی زانسـتی کــورد). لـ
ئەســتەمبوڵدا قوتابخانەیــەکی کوردییــان کــردەوە کــە منـــاڵی کوردەکـــانی ئــەو
تیـابخوێنن. قوتـابی کوردیش بـەناوی (هیـڤی = هیـوا)وە کۆمـەڵێکیان پێکـەوەنا. بـ
ڕەنگە کوردەکان تـا جـەنگی گـەورەی یەکـەم لەسـەر تەقـەلای سیاسیی ڕۆیشـتن. ک
جەنگ هەڵگیرسا ئەمانە بڵاوکرانەوە، نێرران بۆ جێگای جیاجیا بۆ جەنگ.

**مەینەتیی کورد لە جەنگی گەورەی یەکەمدا:**

کوردەکان لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەرەنگاری مەینەتی زۆرگەورەبوون، چونک
لەجەنگەکـەدا زۆر لـــەلاوەکانیان کــوژران. دانیشـــتووەکانیش لەبەرئـــەوەی ســـوپ
عوسمانی هەموو خواردەمەنییـەکی لـێ زەوت نـەکردن گـەلێکیان لـە برسانا مـردن
گرانیـی و قـات و قـڕیـش کەوتـە نـاو وڵاتەکـەوە. سـەرەڕای ئەمانــەش عوسمانییـەک
کوردەکانیان لە کوردستانی تورکیاوە ئەبرد بۆ خۆرئاوای (ئەنەدۆڵ) بۆ ئەوەی هۆش
نەتەوایەتییان لە بیربچێتـەوە. ئەم زۆر وستەمە بێپایانە بووە هـۆی مردنـی هەزا
کوردی بەدبەخت لەبەر برسیەتی و ماندوو بوون و سەرمای زستان لە ڕێگاوباندا.

---

* ڕۆژنامەی (کوردستان) لەساڵی (١٨٩٧) لـە قاهیرە دەرچوو لـە وڵاتـی میسـر لەلایـ
مقداد مدحت بەدرخان.

### لە پێش جەنگی یەکەمدا کورد لە باری سیاسییەوە وریا بووەتەوە:

لـەم دەورەدا کوردەکـان دەسـتیانکرد بـە دەرهێنـانی ڕۆژنامـەی سیاسـی بـۆ بڵاوکردنـەوەی بـیرو پێکهێنانی کۆمـەڵ کـە خـەریکی خـەبات بـێ بـۆ ڕزگاربوونیـان. یەکەم ڕۆژنامەیان ناوی (کوردستان)بوو* لە(١٨٩٧م)دا، لەدواییدا برایە (قاهیرە) لـەوێ دەرنەچوو. کوردەکان لە ساڵی ١٩٠٨م دا لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵێکی سیاسییان پێکـەوەنا (کۆمـەڵی بەرزکردنـەوەو پێشخستنی کورد) وە کۆمـەڵێکی تریشـیان دامـەزراند بـۆ خزمـەتی ئـەدەب و زانسـتیی بـەناوی (کۆمـەڵا بڵاوکـەرەوەی زانسـتی کـورد). لـە ئەسـتەمبوڵدا قوتابخانەیـەکی کوردیاییـان کـردەوە کـە منـاڵی کوردەکـانی ئـەوێ تیـابخوێنن. قوتـابی کوردیـش بـەناوی (هیڤـی - هیـوا)وە کۆمـەڵێکیان پێکـەوەنا. بـەم ڕەنگە کوردەکـان تـا جـەنگی گـەورەی یەکـەم لەسـەر تەقـەلای سیاسـیی ڕۆیشـتن. کـە جەنگ هەڵگیرسا ئەمانە بڵاوکرانەوە، نێرران بۆ جێگای جیاجیا بۆ جەنگ.

### مەینەتیی کورد لە جەنگی گەورەی یەکەمدا:

کوردەکان لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەرەنگاری مەینەتی زۆرگەورەبوون، چونکە لەجەنگەکـەدا زۆر لـەلاوەکانیان کـوژران. دانیشـتووەکانیش لەبەرئـەوەی سـوپای عوسمانی هەموو خواردەمەنییـەکی لـێ زەوت ئـەکردن گـەلێکیان لە برسانا مـردن و گرانیـی و قـات و قڕیش کەوتـە نـاو وڵاتەکەوە. سەرەڕای ئەمانـەش عوسمانییـەکان کوردەکانیان لە کوردستانی تورکیاوە ئەبرد بۆ خۆرئاوای (ئەنەدۆڵ) بۆ ئەوەی هۆشی نەتەوایەتییان لە بیربچێتـەوە. ئەم زۆر وستەمە بێپایانە بووە هـۆی مردنـی هـەزاران کوردی بەدبەخت لەبەر برسیەتی و ماندوو بوون و سەرمای زستان لە ڕێگاوباندا.

---

* ڕۆژنامەی (کوردستان) لەساڵی (١٨٩٧) لـە قاهیرە دەرچوو لـە وڵاتـی میسر لەلایەن مقداد مدحت بەدرخان.

### ڕێك كەوتنی كوردو ئەمەرنی:

كاتێك جەنگەكە بە شكستی توركەكان دوایی‌هات و وڵاتی عەرەب لە توركیا جیابوونەوە كوردەكان و ئەرمەنییەكان بیریانكردەوە كە هەریەكەیان حكومەتێكی سەربەخۆ دروستبكەن. (شەریف پاشا)ی سەرۆكی كورد لەگەڵ (بۆغۆص نۆبار پاشا)ی سەرداری ئەرمەنی ڕێككەوتن، ئینجا بەیاننامەیەكیان دەركردو دایان بە كۆنگرەی ئاشتی لە ئەوروپادا. لەناویا سنووریان بۆ مافی نەتەوەكەیان كێشابوو.

### *پەیمانی سیڤەر:*

لە ئەنجاما دەوڵەتە سوێندخۆرەكان لە ئەوروپا لە ساڵی ١٩٢٠دا (پەیمانی سیڤەر)یان مۆركرد. لەم پەیمانەدا بڕیاردرا بوو كە لە بەشی باكووری خۆرهەڵاتی توركیادا دەوڵەتێكی ئەرمەنی پێكەوە بنرێت و لە بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی توركیادا لە بەینی دەوڵەتی ئەرمەنی و عێراقدا دەوڵەتێك بۆ كورد دروستبكرێت.

### كوردەكان بە بەڵێنی توركەكان تەفرە ئەخۆن و یارمەتی ئەتاتورك ئەدەن:

بەڵام كوردەكان لە بڕیارو پەیمانەكەی دەوڵەتان هیچ سوودێكیان وەرنەگرت. بە قەوڵ و بەڵێنی توركەكان خەڵەتان كە ئەیانوت جارێ ئەبێ كوردو تورك ببن بە یەك بۆ ڕزگاركردنی وڵاتەكە لەدەست (گاور) ئینجا لە دواییدا تەماشای پێویستیی نەتەوەی كورد بكرێت. مەبەستیان لە (گاور) ئەو یۆنانییانە بوو كە بەشێك لە ڕۆخی خۆرئاوای توركیایان داگیركردبوو. بەم ڕەنگە كوردەكان خەڵەتان و یاریدەی (مصطفى كمال) یاندا تا یۆنانییەكانیان لە وڵاتەكە دەركرد.

### توركەكان دەست ئەكەن بە ئازاردانی كوردەكان:

هەركە موستەفا كەمال و هاوڕێكانی لە جەنگی یۆنانا سەركەوتن و پەیمانی (لۆزان) یان بەست، بەرامبەر كوردەكان كردەومیان گۆڕرا. جاران كە وەك (برا) تەماشایان ئەكردن و لە فەرمانی میردا وەك هاوبەش وابوون، كەچی دوایی بەچاوی

بێگانەو دوژمن سەیریان نەکردن. نە قەبارەیان هێشتن نەبیری نەتەوایەتیی و زمان. بە پێچەوانەی پەیمانی (لۆزان) کە لەوێدا تورك دەستەبەر ببوو کە مافی نەتەوەی کورد بپارێزێت. دیسانەوە حکومەتی تازەی تورك بیرەکەی پێشووی لەگەڵ کوردەکان خستەوەکار کە ئەویش ئەوەیە (کورد نەبێت تورك بێت، نابێ بە کوردی قسە بکات). واتە بە زۆر بکرێت بە تورك. تورکەکان پلەی زۆرداریی و ستەمیان لەگەڵ کورد زۆر بەرزکردەوە. بە ئاشکرا نەیانهێشت بە کوردی گفتوگۆ بکەن. تەنانەت قەدەغە کرابوو کە لە ڕۆژنامەو پەڕاو یەعنی (کتێب) و قوتابخانەکاندا (ناو)ی (کورد و کوردستان) بنوسرێت!.

## شۆڕشی شێخ سەعید ساڵی ١٩٢٥:

کوردەکان بەرامبەر ئەم هەموو خراپەو زۆرداریییە خوێناوییانە نەیانتوانی ئیتر خۆیان بگرن. بە سەرۆکایەتی خالد پاشاو شێخ سەعید ناوان شۆڕشێکی گەورەیانکرد. زۆر لە پیاوە گەورەکان و خوێندەواران دایانە کۆمەکیان. لە حەوتی مارتی ١٩٢٥م دا بڵێسەی ئاگری شۆڕش هەڵگیرساو بەگورجی بە ناوچەکانی (دیاربەکر)و (مووش)و جێگاکانی ترا بڵاوبووەوە. هەرچەندە شۆڕشگێڕەکان بەژمارە چەك زۆر لەسوپا ڕێکەکەی تورك لەخوارتربوون، لەگەڵ ئەوەشا دیسان تورك لە زیانی زۆر ڕزگار نەبوون. (فەرەنسەکان) لەم تەنگانەیەدا نامەردانە ڕێگایاندا کە سوپای تورك بەخاکی سوریەدا بڕواو لە پشتەوە لە شۆڕشگێڕەکان بدات. بەم ڕەنگە تورکەکان توانییان بەسەر شۆڕشەکەدا زاڵ ببن. دوای ئەوە بەشی زۆری گوندەکانی ئەوناوەیان وێرانکردو بە هەزاران کوردیان دەربەدەرو ئاوارەکرد بۆخۆرئاوای تورکیا کە هەر ئاگاشیان لە شۆڕشەکە نەبوو. لەم هەزارانە زۆریان لەرێگەو بان بەبرسیەتی و سەرما مردن.

## شۆڕشی ئاگری داغی ساڵی ١٩٣٠:

بەڵام شۆڕشی کوردەکان بەمە نەبڕایەوەو دوایی نەهات. بەڵکو بێ پسانەوە شۆڕشی وردە ناوبەناو تا ساڵی ١٩٣٠م هەر ڕوویداوە. لەم ساڵەدا کوردەکان باشتر ڕاپەڕین و بنکەی شۆڕشیان لە (ئاگری داغ) دانا کە جێگایەکی زۆر سەختە لە چیای (ئارارات) کە کەوتووەتە بەینی تورکیاو ئێرانو وڵاتی قافقاسی سۆڤیەتەوە لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا. لەوێوە دەستیانکرد بە هێرش بۆ سەر ناوچەکانی ترو زیانێکی زۆریاندا لە سوپای تورک. ئەم سوپایە نەیتوانی بەسەر شۆڕشگێڕەکانا زاڵببێ، هەتا لەگەڵ سوپای ئێران ڕێککەوت. ئەوسا هەر چوارلای شۆڕشگێڕەکانیان پێچاو ئیتر لە کوردی ئێرانەوە یارمەتییان لێبڕا، سەرکردەی ئەم شۆڕشە (احسان نوری پاشا)ناو بوو. لە دوای ئەم ڕێکەوتنە ئێران و ڕووسەکان ڕێگایاندا بە سوپای تورک پشتی کوردەکانی گرت. جا لە دوای ئەم ئەنجامە احسان نوری پاشاو ڕەفیقەکانی خۆیان خستە پەنای ئێرانییەکانەوەو بەمجۆرە ئەو شۆڕشەش برایەوە.

## شۆڕشی دێرسیم ١٩٢٧- ١٩٢٩

دوای ئەوەی حکومەتی تورك شۆڕشی ئاگری داغی کوژاندەوە، کوردستانی تورکیای خستە ژێر فەرمانڕەوایی سەربازەوە، واتە ئیدارەی عەسکەری پەتییەوە. دیسانەوە دەستیکردەوە بە دەربەدەرکردنی کوردەکان بۆ خۆراوای ئەنەدۆڵ. کاتێك کردەوەی دەربەدەرکردن بە زۆرو ستەم لەساڵی ١٩٢٧م دا گەیشتە ناوچەی (دێرسیم) ی بێدەنگ کە ئەکەوێتە باکووری خۆراوای دیاربەکر ئەو ساکە دانیشتووانی ئەوێیش شۆڕشیان کردو شۆڕشەکە لە ساڵی ١٩٢٧ ەوە تا ساڵی ١٩٢٩ درێژەی کێشا. حکومەتی تورك نەیتوانی ئەم شۆڕشە بکوژێنێتەوە تا بە بۆمبابارانی فڕۆکە هەموو ناوچەکەی وێرانکردو سوتاند، وە بە هەزاران جووتیاری داماوی کوشت. ئینجا تورکەکان سەرکەوتن.

**لەسەر ئەوەشا کوردەکان سکالای خۆیان ئەبەنە لای گەلانی یەکگرتوو:**

کوردەکـان لـەم زۆرداریـی و قەلاچۆکردنـە بێدەنـگ نـەبوون. کۆمەڵـەی کـورد دداشـتێکیان دا بەسـکرتێری کۆمــەڵی نەتــەوە یـەکگرتووەکان لـە ١٩٤٨/١١/٢٩دا، وە ،وێدا توانییان خراپیی باری کوردو کوردستانەکانی ئێران‌و تورکیا دەرخەن بەدوای ،مەدا چەند (یادداشت)ێکی تریشیاندا هەر بۆ ئەم مەبەستە داوایـانکرد لـە کۆمـەڵی ەتەوە یەکگرتووەکان کە بەپێی ماددەی ٧٣ لە یاسای ئەو کۆمەڵەیەدا باسی مافی ئەو ڵاتانە کراوە کە ژێردەستی ئەقوامی ترن، بۆ ئەوەی بەڵکو هەڵبداتێ.

**هەواڵی کوردستانەکانی تر**

تـا ئێرە باسی شۆڕشـەکانی نەتــەوەی کـوردی بێچـارەی تورکیـا کـرا کـە لـەناو ۆرداریپەکانی حکومەتی عوسمانی کردوویانە. لێرە بەدواوە باسی کوردستانەکانی تر ەکەین تـا بزانـین ئـەوان چییـان بەسـەرهاتووە. وەکو لـە باسـەکانی پێشـوودا وتــرا یستیعمار کوردستانی دابەشکردووە بە چوار پارچـە. بەشـی هـەرە گـەورەو پەرێشـان ەر تورکیا کەوتووە. ئەوە بوو لای سەرو شۆڕشـەکانمان باسـکرد بۆتـان. بەشـی دووەم وردستانی ئێرانە. بەشی سێهەمیش بەر عـێراق کەوتووە. بەشـی چوارەم تێکـەڵاوی وریە بووە.

**عوسمانییەکان کێن؟**

ئەم تیرەیە نەتەوەیەکی تورکمانن. جنسیان تورکە. ڕەگـەزیان مەغۆلـە. لـە سـاڵی ١٦٣م بە تەواوی عێراقیـان داگیرکردووەو لـە ژێـر فـەرمانڕەواییانا ماوەتـەوە تاسوپا ـەهێزەکانی بـەریتانیا لـە جـەنگی یەکـەمی گێتییـدا کـە ١٩١٤-١٩١٨ بـە بەسـەریانا ڵبوون‌و لە (عێراق) دەریانکردن. ئەوسا عێراق کەوتە ژێر چەپۆکی (بەریتانیا)وە.

ئـەم تورکـی عوسمانییـە کۆچـەریی بـوون کـە هـاتوون، تـیرەی هـەرە دوایـین لـە ورکـەکان، لـەڕۆژاوای ئەنـەدۆڵ دامـەزراون لـە ١٣٠٠م دا ئـەمجا هێزیـان زیـادبووە لـە ١٣٢م دا بـوون بـە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ. ئەمانــە خـەڵکی ئاسـیای ڕۆژاوا نــین وەك ییـەکانی پێشووتر لـە ناوەڕاستـی ئاسیاوە هـاتوون بۆئـەوەی وڵاتـان بـەزۆربگرن و

حوکمیان بەسەرابکەن. وە خۆیان زانایان نەبووە، بەلکو لە دانیشتووانی ولاتە داگیرکراوەکانەوە فێری شت بوون، نەك وەك ئینگلیزەکان کەویستیان ولاتێك بگرن پێشەکی جار ئەدەن ئەلێن بۆیە هاتووین خەلکی ولاتەکە لە زۆردارەکان رزگار بکەین. کەچی لە پاشا ئەکەونە مژینی رزق‌و رۆزیی ولاتەکە بە زۆرو بەهێز نەبێ لێی دەرناچن. ئەمجا ئینگلیزەکان بەمجۆرە جاردانە هاتنە سەر عێراق تورکەکانیان دەرکرد. ئینگلیزەکان لە دەمێکەوە خۆیان ئامادەکردبوو کە عێراق داگیربکەن چونکە عێراق لە سەرڕێگای هیندوستانایە، (نەوت)ی زۆریشی هەیە. بۆیە کە شەڕی گەورەی یەکەم ڕوویدا ئینگلیزەکان خێرا لە عێراق دابەزین، جەبهەی شەڕیانکردەوە. سوپایان لە بەحرەوە هێنایە (بەسرە) دەستیانکرد بە داگیرکردنی ولاتەکە. بەئەنجام کوردستانی عێراقیش بوو بەجەبهەیەك لەوێ. خەلکی عێراق بە کوردو عەرەبەوە بەشداربوون لەم جەنگەدا. کوردی عێراق دەشنێرران بۆ سوریەو میسر وە بۆ (چەناقە قەلعە) و (قافقاس) و ئێران. تورکەکان هەرچی خواردەمەنی کوردستانی عێراق هەبوو بردیان. بەمە ئەهالی قڕی هات. سەدی حەفتا (٪٧٠)ی خەلك لە برسان‌و لە شەڕا مردن. ئەوەندە هەیە وەك کوردی تورکیا دەربەدەر نەکران چونکە ئەوە پێویست نەبوو ئەوی لە عەسکەرێتی رایکردووە بە دەسترێژی تفەنگ کوژراوە. بە هەزاران هەرزەکاری کورد بەم دەسترێژانە لەناوبراون. عێراقی عەرەبی زوو لەدەست تورك رزگاربووە. بەلام کوردستانی عێراق هەتا دوایی جەنگ بەدەست تورکە زۆردارە ستەمکارەکانەوە ماوەتەوە. حکومەتە سوێند خوارەکانی ئەورووپا عەرەبەکانیان بەتەمای سەربەخۆیی و ئازادیی تەفرەدا. کەچی لە ژێرەوە لەناوخۆیانا دابەشیانکردن. زۆرداریی و ستەمی زیادیشیان دەربارەکردن. هەرچی کوردستانی عێراق هەیە هەمووی بەر ئینگلیزەکان کەوت. ئەمانە جارێ بەفەرمانڕەوایی حاکمەکانی خۆیان کوردستانەکەی عێراقیان ئیدارەکرد. لەدواییدا وازیانهێنا لەوە کەحکومەتێکی سەبەرخۆ بۆ کوردەکان دروست بکەن وەکو لەپێشانا بەلێنیاندابوو. هاتن چوار لیوایان لە کوردستانی عێراقا دروستکردو حکومەتێکی مەلیکی کوردو عەرەبیان پێکەوەنا. لەسەرئەوە کوردەکانی لیوای سلێمانی بە

سەرۆکایەتی (شێخ حەموود) ناو زەعیمێکی خۆیان شۆڕشیانکرد. سەربەخۆیی و ئازادییان داواکرد کە بیاندەنێ. ئینگلیزەکان بەتەنیا خۆیان ئەوەیان پێ نەئەکرا هیچ دەوڵەتێکی تریش هاوفکریان نەبوو پێکەوەحکومەتێکی کورد بنیات بنێن لەبەرئەوە ئەم شۆڕشە لە ١٩٢٠م ەوە تا ١٩٣٠م کەم و زۆر هەر بەردەوامبووە ئینگلیزەکان بۆئەوەی ناخۆشی بخەنە بەینی کوردو عەرەبەوە زۆرجار سوپای عیراقی عەرەبییان هێناوەو کردوویانە بەگژ ئەم شۆڕشگێڕانەدا لە لیوای سولەیمانی لەلایەکی ترەوە عێراقی عەرەبی زۆر لەدژی حکومەتە مەلیکییەکەی خۆیان بوون چونکە ئینگلیزەکان عێراقیانکردبوو بە جۆرە موستەعمەرەیەك لە شێخەکانی عەرەب و پیاوماقووڵانی ترو خوێندەوارانی سەر بەئیستعمار چینێك خەڵکیان دروستکردبوو. ئەمانە حکومەتیان بەدەستەوە بوو، وە یا خۆیان حکومەتبوون لەسایەو پەنای ئینگلیزدا حکومەتەکەیان ئەگێڕا. جا بۆ ئەوەی حکومەتەکە لە چنگ ئیستعمارو خراپە کەران رزگاربێ وە ئیدارەیەکی دیموکراتیی و ڕاستی پێکەوەبنرێت میللەت زۆر هەوڵیدا، شۆڕشەهای بەرپاکردو خوێنی ڕشت. بەڵا ڕەفیق و برادەرانی ئیستیعمارو نۆکەرەکانی و پیاوەکانی خانەدانی مەلیکیی لەپا پارمەتی ئینگلیزدا نەیانئەهێشت ئەم تەقەلایانە سەربگرێت. ئەم کێشمە کێشانە زۆر پایەدار ما هەتا ئازار کەوتە دڵی ئەفسەرە ئازاکانی سوپاوە. ئینجا ئەمان هاتنە مەیدان بەڵێنیاندا کە ئەم میللەتە لەم ئیدارە پیس و بۆگەنە ڕزگارکەن.

## ڕۆژی ئینقلاب ١٤ ی مانگی گەلاوێژ سالی ١٩٥٨ م

ئەمجا سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٤ی گەلاوێژ (تەمووز) ١٩٥٨م ئەم ئەفسەرە بەڕێزانە سوپا هەڵیانکوتایە سەرخێزانی پادشایی عێراق گشتیان کوشتن لەگەڵ پیاو فەرمانڕەوا گوناهبارەکان کە لەژوور هەموویانەوە نوری سەعید وەزیر حکومەتەکەش لەناو کوژراوەکانا بوو. بەوجۆرە حکومەتی عێراق لەخراپی ئیستیعمار ڕزگارکراو (حکومەتی کۆماری) عێراقی ئیستا لەو ڕۆژەوە دروستبو کوردەکانی عێراقیش بە ئاواتی مێژوویی خۆیان گەیشتن چونکە هەر ئەو بەیانیی

جاڕدرا کە ڕژێمی تازەی حکومەتی عێراق کۆمارییە واتە جمهوریەتە. عەرەبو کورد بە شەریکیی وەکو بـرا حکومەتەکـە ئیـدارە نەکـەن بـەپێی مـادەی (٣) هـەم لـە دەستووری موەقـەتی حکومـەتی عـێراق. وە هـەموو عێراقییـەکان مافیـان وەك یـەك وایە لەم حکومەتەدا. جا کوردەکانی عێراق پشـتیان بەستووە بـەم ئینقیلابـە، وە بـە تەمای پاشە ڕۆژی بەرزی پایەدارن.

## بێینەوە سەر هەواڵی کوردستانی ئێران:

کوردستانی ئێران کیشوەرێکی زۆر گرنگە. نیشتمانی سـەرەتایی نەتـەوەی کـوردە. لەوێوە بڵاوبوونەوە بەسەر زەمینەکانی تری کوردا. دوابەدوای کوردستانی تورکیایـە. ڕۆژهەڵاتی چیاکانی(زاگرۆس) هەمووی ئەم کوردستانی ئێرانەیە. باسو هەواڵی پێش سەدەی بیستەمی ئەم نیشتمانە لە نووسـینەکانی پێشوودا نووسـراوە. حکومەتـەکانی پێشووی ئێران لەگەڵ کوردا هیچ باش نەبوون، بە بێگانەیان ژماردوون. کە نەبوو لە ناوەڕۆکی نەتەوەی خۆیانی بژمێرن، چونکە پایەداربوونی ئێران بە سایەی کوردەوە ئـەبێت ئـەگینا ئـەبێت بـە دەوڵەتێکی بچووکی بێ مایـە. شاهەنشـایەتی ئـێران بـە کوردەوە نەبێت و نەمێنێت. حکومەتەکانی ئـێران کوردیـان زۆرهێنـاوەو بـردووە. بـە دەربـەدەری ڕەوانـەی هـەموو لایـەکیان کـردوون. کوردەکـانی ڕوسـیەو ئـەفغانو بلوجستانو هـەندێکی عـێراقو تورکستان هـەمووی سـەرەنجامی ئـەم جـۆرە ئـاوارە بوونانەن. ئینجا ئەمانە هـەمووی ڕۆیشتووەو بڕاوەتـەوە. ئێمـە لێرەدا نـاتوانین لـەو هەواڵانە بدوێین، بەڵکو باسو هەواڵی سەدەی بیستەمیان ئەنووسین.

## کۆماری مەهابادی کوردی ( ١٩٤٥ ١٩٤٦ ) م:

لـە سـەرەتای سـەدەی بیستەما جووڵانەوەیـەکی ئینقیلابـی لـە ئێرانـا پـەیدابووە. خەڵکی ئێران لەحکومەتی (شاهەنشاهی) قاجارەکانی دوایی، داوای ئازادیی و ئیدارەی دیموکراتیکرد. میللەت شۆڕشی هەڵگیرساند، شاه ئێرانی بەجێهێشتو ئەختـە ئەختـە ئازادی دیاریدا. بەڵام لە دیمەنێکی هیچ و پووچا. وا دەرئەکەوی لە ئێرانا پێشکەوتن

و بڵاوبوونەوەی زانیاریی و گەشەکردنی ئابووریی و بەرزبوونەوەی کۆمەڵایەتی زۆر بەسستی ئەرِوات ئیدارەکردنی وڵات هێشتا لەسەر رەوشتی پێشووە نەگۆڕاوە. کە جەنگی گەورەی دووەم دواییهات لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥دا کوردەکان بەیارمەتی رووسیەی سۆڤیەتی لە مەهاباد کە کەوتووەتە باکووری خۆرئاوای ئێران کۆمارێکی کوردیان دامەزراند. (قاضی محەمەد) کە یەکێك بوو لەپیاوە دیارەکانی ئەو ناوە، کرا بەسەرۆکی ئەم کۆمارە. ئەم کۆمارە بچکۆلەیە لە ژیانە کورتەکەیا زۆر هەوڵیدا کە وڵاتەکە بەرەو پێشکەوتن بەرێت و باری زانیاری و تەندروستی وڵاتەکە پێشبخا، (قاضی محەمەد) زۆرجار ئەیوت: فەرمان بەرێتی حکومەتی ئێران ئەکات و کۆمارەکەی تەنیا خاوەنی سەربەخۆیی ناوخۆی هەیە لەناوئێرانا. لەگەڵ ئەمەشا حکومەتی ئێران دانی ئەنا بەم سەربەخۆیی ناو خۆییەداو دنیایان هوروژاند بەرامبەر ئەم کۆمارەو کۆماری ئازربایجانی ئێرانی. بۆیە دەوڵەتە خۆرئاواییەکانی ئەوروپا یاریدەی حکومەتی ئێرانیاندا بەو ناوەوە کە گوایە رووسیە یاریدەی ئەو دوو حکومەتە ئەدات، لەبەرئەوە رووسیە چارەی ئەما یاریدەکەی وەستاندو سوپاکەی لە ئێران کێشایەوە. ئەمجا هێزی ئێران چووە ناو ئازەربایجانەوەو کۆمارەکەی لەناو برد لەدوای ئەوە هێزی تری ئێرانی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا چووە مەهاباد و کۆمارە بچکۆلەکەی ئەویشی لەناوبرد، وە حکومەتی ئێران لە پیاوە گەورەکانی مەهاباد لە پێش هەموویانەوە پێشەوای مەزن (قاضی محەمەد) ی خنکاندو هەرێمەکەشی خستە ژێر بەرێوەبردنێکی سەربازانەی توندوتیژ کە هەتا ئێستاش ئەم جۆرە بەرێوەبردنە هەر لەکاردایە.

### باری کوردەکان خراپە لە تورکیاو ئێران دا:

جا بەم رەنگە کوردەکان لە ئێران و تورکیادا کەوتوونە ژێر چنگی جۆر حکومەتێکەوە کە بیری باش نییە بەرامبەریان و نایانەوێ پێویستی کوردەکان جێبەجێبکەن کە ئەویش بریتییە لە پاراستنی قەبارەو زمانیان لەگەڵ خزمەتی ناوچە کوردەکان لە رووی هەڵسووراندنو تەندروستی و زانیارییەوە جیاوازی نەبێت

لەنێوان نەتەوەکاندا. یەعنی هەموو وەك یەك بژین. کەچی پیاوی دیاروخوێندەواری فارسەکان و هەموو کاربەدەستانی ئێران بۆنەوەی پیاو لە کورد هەڵنەکەوێ نایەڵن قوتابی کورد لە جامیعەکانا بخوێنن!!.

## شارستانیەتی کورد پاش ئیسلامیەت، ڕەوشت و خووی کۆمەڵایەتییان

کورد کە داوی بوو بەداوی نەتەوەی عەرەبەوەو نیشتمانەکەی داگیرکرا، ئیتر وردەوردە بوو بە ئیسلام، وە بە هۆی بەڕێوەبردن و ئایینی تازەوە ڕەوشتو خوویان زۆر گۆڕرا. لە عەرەبەکانەوە گەلێك خولق و پیشەی تازەیان وەرگرتووە. بۆیە کوردی پاش ئیسلامیەت زۆر فەرقی هەیە لەگەڵ کوردی پێشوودا. ئەگەرچی ناتوانرێت لەسەر ئەم باسە شتی زۆر بنووسرێت، چونکە ئەم حاڵەتە گۆڕاوانە کامی کۆنەو کامی تازەیە بۆمان جیا ناکرێتەوە. لەبەرئەوە بە کورتی تەبیات و ڕەفتاری ئەمانە لای خوارەوە بەیانکرا.

١- بەرودوا کوردەکان ڕەوشتیان وابوو پیاوی ئیختیار لە هۆزا سەرەکی هۆز بووە. لەمانە کامیان زۆر بەکاربووبێت کراوە بە گەورەی تایەفەکە. ئەم جۆرە ماقوولانە قسەیان فەرمانڕەوا بووە. کەس نەیتوانیوە بەجێی نەهێنێ. لە کاتی پشێوی وەیا جەنگدا کەس لە قسەیان دەرنەچووە. پشتی ئاغاوات و ئەم بەگانە قایمبووە. ڕەنگە ئەم نەریتە کرداری پێشووتریان بوو بێت.

٢- ئەوانەی لەسەر ڕەوشتی عەشیرەتیی ژیاون، بەشێکیان هێشتا لەسەر کرداری کۆچەرێتی ماون وەك باوك و باپیرەکانیان. بەڵام لەمانە بەشێکیان بەرە بەرە فێری کشتوکاڵ کردن بووەو لە دێهاتا دانیشتووە. ئەمانە ئەمجا بوون بە (دێ کان)ی کۆچەرییەکان بۆ لەوەڕ گەرمیان و کوێستانیان کردووە بە خوو. ئەوەی چووەتە ناوشار بووەتە (شارستانی).

٣- ئەوانەی لە شارا ژیاون لەگەڵ هەموو جۆرە پیشەسازیی و فەرمانی شارستانیدا خەریکبووە ئەوانی دێکانی بوون، بە کشتوکاڵ و ئاژاڵ بەخێوکردنەوە گیرۆدەبوون، وەرزێرییشیان کردووە. شارستانییەکان لەسەر تەبیاتی عەشرەتایەتی نەماون، بوون

بـه كۆمـەڵێكى شارستـانى بـەڵام دێكانييـەكان هێشتا لەسـەرخوى عەشيرەتى مـاون و نەبوون بە شارستانى بێجگە لەمە هێشتا لـە كوردا عێلانـى گەڕۆك ماوە لـە ساڵێكا بـەڕێكو پێكى گـەرميان و كوێستان ئـەكەن. يـەعنى بـۆ بـەخێوكردنى ئاژاڵـەكانيان بـەهاوينان ئـەچن بـۆ كوێستان و لەزستان ئەهاتنـەوە گـەرميان. ئەمانـە كشتوكاڵيان نەزانيوە، بـەڵكو لـە هاتوچۆ كردنـەكانيانا دێكانييـەكانيان ئازارداوەو وەرزێرەكانيـان تەنگەتاو ئـەكرد. هـەندێك عەشاير لەمانـە بـوون بـە نيـوە گـەڕۆك، بنـەيان هـەبووە كشتوكاڵيان بۆبكا. ئەمە ماناى ئەوەيە كە خەريكن واز لەگەڕۆكيەتى ئەهێنن. قەومى كورد هەندێك ڕەوشتى تايبەتى خۆى هەيە. ژن و پياويان فەرمان كەرە. گەلێك جـۆر يارى و گەمەيان هەيە وەكو هەڵپـەڕكێ و سـەما، جـەژن و سـەيران، لەگـەڵ ڕاوكـردن لەكـەژو كێـوا. لـە بابـەت ڕابواردنـى كۆمەڵايـەتى كـوردەوە، زاناكـان لـە ژيـانى عەشايرەكانيان زۆر وردبوونەتەوە گەلێك نوسراويان هەيە دەربارەيان نوسيون وەكو ئەڵێن: ئافرەتى كورد هونەروەرە لە ژيانى دێكان و گەڕۆكيدا نيوەى فـەرمانى خـێزان لەسەرشانى ئافرەتە. لە ماڵا ئافرەت هەرخۆى حيسابە. جگـە لەمانـە لـە ئيشوكارى گەورەشا ئافرەتى كورد خۆى نواندووە. گەلێك ئافرەتى ناودار هەيە لە مێژووى كوردا ناوى نوسراوە. ئافرەتى كورد ڕوو لە سفوورە. خوڵقى ژنهێنانى زۆر لـە كوردا گـەلێك كەم بووەتەوە ئەم خوڵقە لەبەر فرە ئيشيى هێشتا لـەناو خـەڵكى دێهاتا مـاوە. لـەناو شارەكانا تاكوتەرا هەيە. چۆنيەتى ناوماڵ و ژيانى نـاوخێزان لـە نەتـەوەى كوردا ڕوو لـە پێشكەوتنە. ڕووخـۆش، دڵپـاك، بـە نـامووس و ميوانپـەروەرو بـەرچاو فـەرەحن. چاوكراوەو ئـەمين و بـەوەفان. خزمايـەتييان قايمـە. پارێزگـاريى گـەورەو بچـووك ئەكـەن. كورد بـەتازايى خوڵقاوەو بـە جـەرگ و وريايـە. حـەز لـە سـواريگەريى زۆر ئەكات. هەميشە لاسايى (تقليد)ى شتى چاك و بەكەڵك ئەكاتەوە. ئامادەيە بۆ ئەريت فـێربوون و پێشـكەوتن. بـەڵام لـە زانينـدا لەدوايـە. بەشـێكى ئـەم ناتەواوييـەش لەبەرئەوەيە ئيستيعمار ناهەڵێ (كورد) بە زمانى خۆى بخوێنێ.

**ئایین و بڕوا:**

بەڕێوەبردنی سیاسیی و کۆمەڵایەتی عەرەبەکان، نەتەوەی کوردی لە (زەردەشتی)یەوە کردووە بە ئیسلام، ئەگەرچی ئەمان سەردەمێك لەگەڵ یەکا ناکۆك بوون و بەڵکو بەهاندانی موتەعصیبەکانی ئایینی پێشوو بەرامبەر ئیسلامەکان جاروبار کوردەکان یاخیەتییشیان کرد، بەڵام بە ئەنجام هۆگری موسڵمانێتی بوون، چونکە کوردەکان باش تێگەیشتن کە ئەمەیان باشترە لە ئایینەکەی پێشوو و ماقووڵترو ڕێکەوتووتریشە، وە لەدوای چەند پشتێك وایلێهات نەتەوەی کورد لە نەتەوەکانی کە ساغترو دڵسۆزتر بوو بۆ ئیسلامیەت. لە مێژووی ئیسلاما خزمەتی نەتەوەی کورد بۆ ئیسلامییەت بە ئاشکرا دیارە. لە دوای ساغبوونەوەی ئیسلامیەت) زۆربەی کوردەکان بوون بە (سوونی)و (شافیعی مەذهەب). لە تورکیاو لە ئێراندا هەندێکیان بوون بە (شیعە) وە لە شیعەکانیشا بەشێکیان بوون بە(علی اللهی)و (کاکەیی) وەیا (شەبەك). سونییەکان هەموو بڕواکانی دوایی بەباش نازانن. بێجگە لەمانە لەناوچەی موسڵ و وڵاتی ڕووسیەدا هەندێك کورد هەن (یەزیدی)یان پێ نەڵێن، موسوڵمان نین. جا لێرەدا باسی بڕوای (علی اللهی)ی و (یەزیدییەکان) بکەین بێکەڵك نییە.

**بڕوای علی اللهی:**

خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئێران، پێش ئیسلامیەت، بڕوای سەیریان بووە. کە بوون بە ئیسلامیش وازیان لەم بڕوا کۆنە نەهێناوە، بەڵکو تێکەڵاو ئیسلامەتییەکەیان کردووە. خەڵکی (ئەرنیل) وەیا (رمال) لەوەوپێش بڕوایان بە (تناسخ) بووە. لەگەڵ ئەوەشا ڕۆژیان پەرتسووە، ئەمانە کە بوون بە موسوڵمان و ناوبانگی ئازایی ئیمامی عەلییان بیستووەو چووە بە مێشکیانا وایانزانی کە بڕواکەی پێشوویان بەمە زیندوو بووەتەوە، دەستیانکردووە بە پەرستنی ئیمامی عەلی، ئەمانە لایانوایە (خوا) کە ڕۆحانییە بۆنەوەی پایەیەکی بەرز بدا بە ئینسانییەت چووەتە لەشی ئیمامی عەلییەوە، وەکو لەمەوپێشیش چوبووە لەشی (بەنیامین و مووسی و عیسا)، وە لە دوای ئیمامی عەلی چووەتە گیانی (سەلمانی فارسی و ئیمام حوسەین و

ـەفت تـەن)ەوە. بێجگە لەمـە ئـەم ئـەفام و گەوجانـە بڕوایـان وایـە کـە پێغەمبـەر
ەلایەن ئیمامی عەلییەوە نێرراوە بە پێغەمبەریی ! لەمانە (احمد) ناوێکیان وتوویـە
ـەم قورئانەی کە ئیستە بەدەستەوەیە، بـڕوای پێنـاکرێت، چونکە قورئانەکە لەمـەڕ
ئیمامی عەلی نیە کە بۆ پێغەمبەری نارد، بەڵکو ئەو قورئانەیـە کەئیمامی (ابـو بکـر،
عمـر، عثمـان) سووتاندیان و هینەکـەی ئیستـەیان ڕێکخسـت. جـا ئەمانـە لەبابـەت
قورئانەوە درۆو دەلەسەیان زۆرە، وە هەج قورئانێکیـان دەسکەوتووە سـووتاندوویانە.
ئەم بڕوا چەوتە لەخۆشەویستی ئەهلی بەیتەوە دەستیپێکردووە، بە ئـەنجام چوومـتە
سەر شڵی بەخوا دانانی ئیمامی عـەلی و لەمەشا نەوەستاوە، هاتوومتـەوە سەر بـڕوای
کۆنیـان کـە (ڕۆژ پەرسـتیی) بـووە. ئـەم نەفامانـە لایانوایـە کـە ئیمـامی عـەلی
بەرزبوومتەوە چوومتە ناو ڕۆژەوە، وە بەڕۆژ ئەڵێن (علی الله)! پێشینانیان گۆشتیان
لا حەرام بووە، ئەمانیش ئیستە گۆشت ناخۆن. بـەلاّم خواردنـی گۆشتی ئەوانـەیان لا
حەلاڵە کە (ابو بکر )و (عمر)و (عثمان) یان خۆشئەوێ !.

بڕوای (لەك)و (فەیلی) یەکانی لوڕستانیش لە (علی اللی) ئـەچێت، ئیسلامەتییان
کـزە، لـەناو عێلاتـی (کەڵـهوڕ)و (گـۆران)دا هـەندێك بـڕوای ئـایینی هەیـە لـەهی
جوولەکەو مەسیحی ئـەچێ. ئەمانـەش ئینسـانی موقەددەسـی وەك (بابـا یادگـار)و
(هەفت تـەن) بـە پێغەمبـەر دائـەنێن، ڕەنگە ئـەم بڕوایـە لـە جوولەکـەکانی (بخـت
نصر)ەوە ڕێکخرابێت کە برابوونە ئەوناوە!.

**بڕوای یەزیدی:**

هەندێ تیرەو تایەفەی کورد هەیـە (یـەزیدی)یـان پێئـەڵێن. بڕوایـەکی تایبـەتییان
هەیە. لەناوچەی (حەڵەب)و (وان)و (ئەرزڕۆم)دان. بەشـی هـەرە زۆریـان لـە ناوچـەی
(موسڵ و سنجارو شێخان)دا دانیشتوون. ڕەنگە ژمارەیان بگاتـە چارەکە ملیۆنێـك.
مێژوونووسەکان ئەڵێن ئەمناوە بۆ ئەم ئەتەوەیە لە (یەزد)وە یا لـە (یـەزدان)ەوە کـە
نـاوی(خـوا)ن بۆیـان ماوەتـەوە. ئـەبێ بـاوەڕ ببێ کـە ئـەمناوە زۆرکۆنـە. ئـەڵێن لـە
قەفقاس و چین و (کامچاتکا)شدا ئەمانە هەن، بەلاّم ناویان جیایـە. گۆیـا بناغـەی ئـەم
بڕوایـە ئەچێتـەوە بـۆ سـەردەمی (مـانی) وەیـا ئـایینی زەردەشـتی کـۆن، چونکـە

یەزیدییەکانیش بڕوایان بە دووخوا هەیە کە (ڕۆژ)و (شەیتان)ە وەکو زەردەشتییەکان کە (تاریی)و (ڕووناکی) یان پەرستووەو پێیانوتوون (هورمز)و (ئەهریمەن). ئەم یەزیدیانەش بڕوایان بە خوای خێر هەیە کە ئەڵێن بڵندیی و ڕەحمەتی ئەم خوایە قەت دوایی نایەت و بڕوایان بە شەیتانیش وایە کە مادەم هەموو خراپەیەك لەوەوەیە پێویستە پەرستش بکرێ تاوەکو ئادەمیزاد لە شەڕوخراپەی دوورکەوێ وە ئەڵێن چونکە خوای خێر، قەت خراپەی نابێت، ئاتاجی پەرستش نییە. بەڵام ئەگەرخوای خراپە نەپەرستڕێ دەستئەوەشێنێ، هەرچی خراپەو مەینەتێ هەیە بەسەرمان دەهێنێ...لەبەرئەوە ئەم ئەفامانە بەناوی مەلیکی گەورەوە شەیتان ئەپەرستن و ئەڵێن چەند هەزارساڵێك ئەم پیشەیە دەوام ئەکا، لەپاشا هەردوو خواکە ئەکەونە جەنگەوە، وە لەئەنجامی شەڕەکەیانا ئەگەرخوای خراپە سەرئەکەوت، لەگەڵ خوای خێرا ڕێکئەکەوێ. کەواتە لەهەردووحاڵەکەدا دەستەوداپەرەی ئەم خوایە ئەبیاتەوە. ئەم قەومە گەورەیەکی هەیە (میری شێخان)ی پێئەڵێن و لە(شێخان) دائەنیشێ. دەستەڵاتی تەواوی بەسەر قەومەکەداو لەخۆی بچووکتر هەیەو پیاوماقووڵیشی هەیە. فەرمانەکانی شێخ ئەمانە بەجێی ئەهێنن. سەرۆکی ئایینەکە جیایە ناوی (بابە شێخ)ە، نوێژو ڕۆژوو بەدەست ئەمە. هەندێ وردە شێخی لەژێردەستایە فەرموودەکانی ئەم شێخە بەجێئەهێنن. هەر بابەشێخە، کەبتوانێ (فتوا) بداو ماوەی نوێژو ڕۆژوو حەرام وحەڵاڵ دانێ. ئەم دوو مەرتەبە گەورەیە کە باسمان کردن میراتییە. ئەم یەزیدییانە خۆیان وەها ئەنوێنن کە بڕوایان بە ئایینەکانی تریش هەیەو ئەڵێن (مەزهەبی مانی) ڕاستە. لەکاتی هەڵاتن‌و ئاوا بوونا (سەجدە) ئەبەنە بەر ڕۆژو لەڕۆژی خۆیا، گای بۆنەکەن بەقوربانی. لایانوایە خواردنی گۆشتی (زیندەوەر) و بڕینی داری (دۆڵی موبارەك) گوناهە. ژن و ژنخوازی هەر بۆ خۆیان ئەبێت کچ نادەن بە بێگانە. بە کەسێکی بێگانە مەزهەب ناڵێن (برا)، بەڵکو پێیئەڵێن (صاحب)، هەندێك پیشەی سەیریان هەیە، ڕقیان لە ڕەنگی (شین)و (کاهوو) زۆرە، پیتی (ط)و (ش) بەکار ناهێنن، ئەسپ و ماین بار ناکەن. ڕۆژی جەژن‌و زیارەتکردنیان زۆرە وەکو هەموو یەکەم چوارشەممەی مانگی نیسان بە

دەهۆڵ و زورناوە ئەچن بۆ سەر گۆڕستان. لەوێ ئەخۆن و ئەخۆنەوەو نان بەفەقیر ئەدەن. لەهەندێ ڕۆژی جومعەدا بۆ سەماکردن لە (بەعشیقە)وە لەسەر گۆڕی (حسن فردوش) کۆ ئەبنەوەو جومعەی دوایی بە دەهۆڵ و زورناوە ئەچن بۆ سەر گۆڕی (شێخ بابەکر) وە ساڵیی (٣) ڕۆژیش بە ڕۆژوو ئەبن!.

یەزیدییەکان سوجدە ئەبەنە بەر(بت)ێک کە لە شکڵی (باڵندە)دایە، (مەلەکە تاووس)ی پێئەڵێن. وتەی (تاووس) لە وتەی (تیئۆس)ی یۆنانییەکانەوە هاتووە کەناوی خوایەك بووە لای ئەوان. لە دواییدا ئەمان لە مەسیحییەکانەوە وەریانگرتووە. یەزیدییەکان لایانوایە ئەم خوایە لەپێش هەموو شتێکا هەبووەو لە هەموو شوێنێکیشا هەیە، وە بەردەستەکانی بەهەموو لایەکا ئەنێرێ کە چاکوخراپ لەیەك جیابکەنەوە. وەلایان وایە (تناسخی ارواح) ڕاستە وە لەوەوە بڕوایان وایە کە لەهەمووکاتێکا پیاوی گەورەی ئاینییان هەبووە. (شێخ عەدی) لەگەڵ (مەلەکە تاووس) بەیەك دائەنێن. بڕوایان بە (دۆزەخ) و (شیاطین) نییە. وە لایانوایە نەخۆشیی تاعوون و گرانیی و مردن ئافاتی سروشتیین. دوو کتێبی موقەددەسیان هەیە یەکەمینیان (جلیوە)ی ناوە، وە (شێخ عەدی) دایناوە باسی هەواڵی کۆنی یەزیدییەکان ئەکا. دووهەم (کتێبی ڕەش)ی ناوە لە (٧٤٣هـ ١٣٤٢م) دا نوسراوە باسی پەیدابوونی یەزیدییەکانی ئێستا ئەکا. ئەم دوو کتێبە هەردوکیان بە زمانی کوردی نوسراوە؟

**مێژووی گەلی کورد**

**تەواو**

# نەتەوەی کورد تورکمان نیە

## وەڵامی وتارە مێژوویەکەی مامۆستا شاکر عمر- کرکوك

پێشکەش بە ڕۆڵەی گەل و تەنها خۆشەویستی کوردو عەرەب قارەمانی نەبەز عبدالکریم قاسم

وەڵام :

ماوەیەك لەمەوبەر لەرۆژنامەی (الاهالی) خۆشەویستدا ژمارە ٢٠١-٩٥٩ بەسەر لەوحەی ( تاریخ الأقوام في العراق )بەخامەی مامۆستا شاکرعمر- کرکوك- ناو وتارێکی مێژوویم خوێندەوە بەونیازەی وتارێکی مێژوویی بەنرخە و کەڵکی لێوەرنەگرم ، بەڵام داخمناچێ کەنەوناواتەم نەهاتەدی چونکە وتارێکی ناتەواوی نارێکە بەهیچ جۆرێك بەمێژوودا نالکێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی بۆمدەرکەوت بەبەراوردکردنی وتارەکەی لەگەڵ ئەو نوسراوەمێژووییانەی کە شارەزاییم تیایانا هەیە ئەوسا بۆم ساغبووە کەوتارەکەی لە گۆترە نوسیوە، چونکە ڕەگەزوبناغەی نەتەوایەتی ئەوقەومانەی ناویبردوون بەئارەزووی خۆی گۆڕیونی وەکو ؛ جنسیەتی ئەونەتەوانەی کە لەعیراقدا دانیشتوون ومیان خۆی ویستویەتی بەدانیشتوانی بزمێرێت بەبێ مەبەستێکی مێژوویی جنسیەتەکەی گۆڕیون، جنسی (قۆقاس) ومیا (ئاری) کردووە بە (تووڕانی) سەرگوزشتەی چەند نەتەوەیەکی ناونووسکردووە کە هیچ نەهاتوونەتە عیراق هەندێ ڕووداویش ئەنووسێت کە لەنێو دوونەتەوەدا ڕوویدابێت کەچی ئەونەتەوانە تەنانەت هاوسەدەی یەکیش نین . بە کورتی بۆمدەرکەوت کە وتارەکەی بۆ نیازێکی تایبەتی و نابەجێ وە تێکەڵ و پێکەڵ نوسیوە ، جا بۆئەوەی خوێنەوارانی بەڕێز ناوەرۆك و چۆنیەتی وتارەکەیان لا ڕوونبێتەوە لەلای خوارەوە وتارەکە بە زبانی عەرەبی نوسراوە پارچە پارچە ئەینوسم وەك لەژێریا خۆمان ئەیخەینە پێش چاو:-

ماموّستا شاكر ئەلّێت:

(تأريخ الأنسان في العراق (ميزوبوتاميا) او حضارة مابين النهرين، تأريخ الاتراك الهونيون (التركمان) تاريخ الاتراك السومريون (التركمان) متى يبدأ التأريخ؟.

لقد هاجرت جماعة من الاتراك (التركمان)الهونيون من اواسط اسيا اي توركستان فكونومدينة تركية(تركمانية) قديمة سموها بالمدينة الهونية (هون- اون) اي الدقيق. وبعدها هاجرت جماعة من الآتراك (التركمان) الاسكيتين الى العراق القديم فكونو المدينة التركية (التركمانية) الاسكيتية وبعدها تشكلت المدينة السومرية في جنوب العراق وشيدوا المدن التركية القديمة، اور، اوران، لاغاش..!متى يبدأ التاريخ القديم؟. يبدأ التأريخ بأيجاد الكتابة من قبل الآتراك (التركمان) السومريين في العراق (ميزوبوتاميا) ولقد اوجدوا الكتابة والأحرف قبل عصرنا هذا بسته آلاف سنة، فعمر الانسان في التأريخ قليل جداً بالنسبة لعمره ما قبل التأريخ حيث ان الأرض والشمس والنجوم والقمر والجاذبية اي الفلك والمجموعة الشمسية قديم جداً و يقدر بملايين السنين.

ومعنى السومر باللغة التركية (سومر) (مص).

*********

ناوی وتارەکانی کاك شاكر (تأريخ الأقوام في العراق) وایلێکردم چاوەڕوانی ئەوەبم کە مێژووی کۆنی عیراق ئەنووسێت وە ئەونەتەوە کۆنانەی عیراق ناونووس ئەکا، باسی(سۆمەری‌وئاکاد)ییەکان و نەتەوەکانی تری ناوچەی شاخەکانی شیمال‌و شیمال شەرقی ئەکات، جنس‌و ڕەگەز و کۆچ و دامەزراندن و پەیدابوونی شارەکانیان‌و..هەراوهۆریاو بەیەکاچوونی ئەونەتەوانە ئەنووسێت وەك ئەبینین و ئەیخوێنینەوە لە ناو ئەو نوسراوە مێژووییانەی کە ئیمڕۆ گشتمان ئەیخوێنینەوە لە قوتابخانەکان‌و دانیشگاکانی جیهاندا لەژێرچاودێریی ماموّستاومێژوونووسەکان ئەخوێنرێت..ئەونوسراوانەی کە ئێمە مافی دەستکاریی وگۆڕین و هەڵگێرانەوەمان نیە هەرچەندە ئەملاوئەولامان کردو کون‌وقوژبنی وتارەکەیمان پشکنی بەوئیازە باسێکی مێژوویی نوێ کە تۆسقاڵێك ڕووناکیی تیابێت تاچەند لاپەڕەیەك

ئەومێژووە تاریکە ڕووناك بکاتەوە..چاوەڕوانی ئەوە بووین کە مامۆستا شاکر لە وتارەکەیدا ڕووداوێك یان بەڵگەیەکی مێژوویی ونبوو بدۆزێتەوە و بیخاتە کایەوە، کەچی داخیگرانم ئەمانەمان هیچی نەدی ، لەوە بەولاوە کە ناوی تورك‌و تورکمان بێنێو هەموو جنس‌و نەتەوەکانی کۆنی عیراق بە ئارەزووی خۆی بکاتە تورك هیچی ترمان نەهاتە بەرچاو . وە بۆ شارەزایی وا وتارەکە کە بەشی یەکەمیان بە عەرەبی نوسی ئەیکەین بە کوردی:-

ئەڵێت:-

کۆمەڵێك لە ناوەندی ئاسیاوە لە تورك‌و تورکمان کەنەتەوەی (هونی)یان پێئەڵێن هاتوون وە شارەوانیەتێکی تورکمانی کۆنیان پێکەوەناو ناویاننا (شارەوانی-هۆن) کە بەزمانی تورکی مانای (آرد)ە کە ئەکرێت بە ((نان)) وە لەپاشا کۆمەڵێکی تر هاتن بۆ عیراق دیسان لە تورکەکان کە (سکیت)یان ناوە وە شارەوانی (مەدەنیەت) (اسکیت)یان پێکەوەنا لەپاش ئەمانە..شارەوانێتییەکی تر دروستبوو کە شارەوانێتی (سۆمەر) ی پێئەڵێن لە جنووبی عیراقدا. ئەمانە گەلێك شاری تورکیان دروستکردوە وەکو (أور، أوران، لاغاش).

لێرەدا وتارەکە ئەپچڕم وە ئەڵێم مامۆستا شاکر هەوڵئەدات کە وشەی (سۆمر) بکات بە تورکی ئەڵێت (سۆمر) لە (سومرمك)ی تورکیەوە کە بە کوردی یەعنی ((مژین)) تا ئێستا هیچ مێژوونووسێك باسی ئەمەی نەکردووە وە ئەم باسە لە دەستکردی تورکەکان بەولاوە هی کەسی تر نییە!.

ئەمجا ئەڵێت: کەی مێژوو دەستیپێکرد؟ وەڵام ئەداتەوە مێژوو لەوڕۆژەوە دەستیپێکرد کە سۆمەرە تورکمانەکانی عیراقی دۆزیانەوە ئەمانە نووسین‌و پیتیان پێش ئەم سەدەیەی ئێمە تیا ئەژین بە شەش هەزار ساڵ لەمەوپێش دۆزیوەتەوە..وە تەمەنی ئادەمیزاد لە مێژوودا زۆر کورتە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ تەمەنی پێش مێژوو چونکە تەمەنی مانگ‌و ڕۆژ و ئەستێرەو زەوی‌و جازبیەت زۆر کۆن‌و درێژە ئەگاتە ملیۆنەها ساڵ. ئینجا بابێینەوە سەر چەند بەڵگەیەکی مێژوویی..ئەم وتارەی مامۆستا شاکر وا ئەگەیەنێ کە مامۆستا هیچ شارەزایی لە مێژوودا نییە.

بـەڵكوو زۆر هـەزارو بێدەسـەڵاتو پەككەوتەیــە لــە مــەیدانی مێـژوودا. (هــۆن نەتەوەیـەكن لــەمێژوودا ناویــان بـەكردگاری پـڕ دڕندەیــەتیو كوشــتارو بڕیــز دەركردووە..ناوچەی اوراسیایان وێرانكردو تەختو تاراجیان تێكدا. بەڕەگـەز (تـورك مەغۆل) تێكەڵاون بـەڵكوو بە بناغـە لـە تیرەی توركمانـەكانن وە لـە ئاسیای نـاوەند ژیاون . هۆزێ لە خۆیان دڕو بەهێزتر پەلاماریدان ئەمانیش لە تاوانا بەرەو رۆژئاوا هەڵهاتن وە كۆچیانكرد. سـەردەمێك لـە جنووبـی روسیای ئێسـتە ئارامیـانگرت نیشتەجێبوون ، لە سـاڵی ٤٤٥ ی میلادییا (اتیلا) سـەرۆكی بـەناوبانگیان لـە مێـژوود پەیدابووە ئـەم سـەرۆكە لـە مێـژووی ئـەوروپادا زۆر بەناوبانگـە ، لـە (فولگـا) وەتـ روباری (راین) كە رۆژئـاوای ئەوروپایـە داگیریكردووە ، وە لـە رۆژهەڵاتیشا قفقاس ئـەنادۆڵی گرتـووە ، وە لـەپاش كوشـتنو بڕینێكی زۆر ئـەم ناوچەیـەی بەجێهێشــتو ئەوروپای كرد بەمەركەزی ئیمپراتۆریەتەكەی لە وڵاتانی مجارستانی ئیستەدا وە هەر لەوێ لە ساڵی ٤٥٣دا مردووە..لەپاش مردنی ئەو، ئەم ئیمپراتۆرییەتە گەورەیە پەرش بڵاوبوەوە هەر هۆزوتیرەیەك ئاڵای سەربەستیی هەڵكرد وجیابووەوە . سەروبەر هـە مجارستانی ئیستە ماوە كە جێگاگری ئەوان بێت هەتا مجارستان ناوی ئەوانی لێـدراو وە ئیستە (هونگاریاشی) پێئەڵێن .

جا كردەوەی تأریخی ئەم هونانە لە مێژوودا بە تەنیا ئەوەیە بوونە هۆی لـەناوبردن ئیمپراتۆریـەتی رۆمـای كۆن وە پـەیدابوونی حكومـەتی ئــەوروپای ئیسـتە . چونكـ هێرشــی هونــەكان خێڵوهــۆزی (جێرمانــەكانی) ئــەوروپای تیكوپێكـدا هەریەكـ بەلایــەكدا بــەرەو رۆژئــاوای ئــەوروپا هەڵــهاتن..وە دەوڵــەتی رۆمــاش بــو بەژێردەستوپێوە. جا ئەم رووداوانە پەیوەندیی چیە بەسەر مێژووی كۆنی عیراقەو مێژووی هون بۆچی بێتە ناو سۆمەرەوە كەوا لەپێش مێژوودا لە عیراقدا بوون وە لـ (٢٥٠٠) پێش لەدایكبوونی مەسیحدا لە عیراقدا پێشكەوتووبوون گەلێك شاری رازاوە ئاوەدانیان پێكهێناوە. وە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییان بە (هونەكانی) كاك شاكرەو نیە. لە كاتێكا سۆمەریەكان لەوپەڕی پلەی مەدەنییەتانـەژیان،هونـەكان لـەتاریكی نەزانینودواكەوتنا پەلەقاژێیان بوو، بەڵكو هەتا ئیمپراتۆرییەتەكەشیان تلیسایەوە ب مردنی ئەتیلای سەرۆكیان.

جا مامۆستا شاكر نەیەوێت بە زۆر مێژوو سەرەوژێر بكاتو سۆمەرو هون لەیەك نزیك بخاتەوە هەتا دەنگی شارەوانێتی توركمان بلاوبێتەوە..

كاك شاكر ئەڵێت: ناوی هون لە (أونی) توركییەوەیە كە بە كوردی یەعنی (نارد) وە هەر بەمەدادیارە كە كورد خزمی هون نیە چونكە لە جێیەكی تردا هەر بۆنەوەی ناشارەزایی خۆی دەرخات ئەڵێت كە گوایە كوردیش لە جنسی توركە واتە كوردو هون دووتیرەن لەتورك . ئنجا ئەڵێت دوایی ئەم هونانە ئەسكیتیەكان هاتن بۆ عیراق لەگەڵ ئەوەشا كەپێچەوانەی قسەكەی مامۆستا ئەسكیتیەكان پێش هۆنەكان هاتوونەتە عیراقەوە . نازانم مامۆستا شاكر بۆچی هەر خەریكی ئەوەیە هۆزو تیرەو دڕندەكان بكات بە خزمو هاوخوێنی خۆی..وادیارە خوویەكی كۆنە لە خوێنیایە رزگاربوونی لێی نییە .

هەرچەندە مێژوو نووسەكان بە تەواوی نەژادی ئەم تیرەیەیان ساغنەكردۆتەوە بەلام با ئێمە وا بلێین كە ئەمانەش (توركمان) بوون..بەلام لەلایەن كردەوەیانەوە لە هونەكانی خزمیان دڕترو خوێنرێژتر بوون.. جوولەكەكان لە نوسراوە ئایینیە كۆنەكانیانا ئەڵێن:- ئەم نەتەوەیە زۆر خوێنرێژ بوون بەڵكو هەتا نەتەوە مەدەنیەكانی ئەوسا وەك ئاشووریەكان ومادیەكان( باووباپیری كورد) وە فارسەكانو ئەرمەنیەكان بەرەودوا لەگەڵ ئەم تیرەیەدا بەجەنگ هاتوون و خوێنیان لەیەك رشتوە لەماوەی ٦٠٠-٥٠٠پێش میلادەوە تا لەناویان بردوون لە ناوچەكانی كوردستانی توركیای ئیستە . بە مەرجێكیش هێرشو شەری ئەم تیرەیە بۆ تالانو تێكدانی تەختی عیراق بووە . خوا بەوەی باشكرد لەگەڵ لەناوچوونی ئەسكیتیەكاندا ئاشووریە زۆردارەكانیش لەناوچوون.

كاك شاكر باسی مەدەنییەتی (سۆمەری) خستووەتە دوای ئەم (سكیتییانە) بەوەمەرجەی سۆمەرو شارەكانیان كراون بە توركمان . كەچی بەپێی مێژووی جیهانی ئەوكاتە لەودەمەدا سۆمەرییەكان لە عیراقدا ژیاون هێشتا تورك و توركمانێتی دروستنەبووە. وە هەتا ئێستا جنسیەتی سۆمەرییەكان لای مێژوونووسەكان ساغنەبۆتەوە.

ههموویان وتوویانه وه ئهڵێن که جنسیهتی (سۆمهر) دیار نیه . ههندێکیان ئهڵێن که سۆمهرییهکان له بهرهی (قفقاس)ن وه ههندێکی تریشیان ئهڵێن که سۆمهریهکان هاتوونهته عیراق واته (ئهرزی شنعار)) وه دامهزراون له دهوری پێش مێژوودا بوون وه لهوێ واته له عیراق چوونهته دهوری مێژووهوه. ههروهها سۆمهرییهکانیش نهیانوتووه که لهکام جنسن؟ . لهبهرئهمه ناتوانرێت جنسیهتیان بۆدابنرێت. کهواته کردنی سۆمهریهکان به تورکمان لهلایهن کاك شاکرموه شتێکی نارهواو ناتهواوهو لهجێی خۆیدا نییه . تورانیهتیی و تورکمانێتی له جنسی مهغۆلن خزمیی هۆلاکۆو هاوخوێنی جهنگیزخانن له ناوچهی (مهغۆلستان) جێگایان بۆتهوه ههر تورکهکانی تورکیای ئێسته تورکمانێتییان راسته..بهتهنها بۆ ئهوان ساغبۆتهوهو پڕ به پێستی خۆیانه .

مێژووی سهدهکانی کۆنی (برستید) وه مێژووی (طه باقر) ههردووکیان لهوهدا یهکن بۆ ساغنهبوونهوهی جنسیهتی سۆمهر . برستید ئهڵێت : ئهگهر ههر جنسیهتێکیان بۆ دابنرێت بهپێی سهروسیماو سهکوتداو ناساری دهرکهوتوویان ئهبێ سۆمهریهکان له جنسی سپی قافقاس بن ئهگینا هیچ جنسێکی تر نین.

مێژووه گهورهکهی احمدرفیق که ههرچهنده جێی باوهڕ نیه ئهڵێت: نهتهوه ههره کۆنهکانی عیراق(سۆمهرو ئهکاد)ن که ئهمانهش تورانین . وه له رۆژههڵاتی دیجلهدا کاشیهکان دانیشتوون که نهژادی کوردهکانی ئیستهن وه له جنسی (هیندو ئهوروپایه) واته( ئاریی)ن.

ههتا ئیمرۆ به تایبهتی به ناو و زبانو ئاییندا ساغبۆتهوه که (آکادهکان) له جنسی سامیو تورانی نین . بهراستی له مێژووی کۆندا هیچ کاتێك نهتهوهکانی تورانی نههاتوونهته عیراقهوه لهوێ نیشتهجێ نهبووه . بهڵکو ههموو کات سهرمڕێی جهولانگای نهتهوهکانی سامیو هیندۆئهوروپی بووه. وه پێویسته بزانین که تورکمان ههوڵ زۆر ئهدهن بۆئهوهی ههرچی نهتهوهکانی ئهوروپا و آسیا ههیه بیانکهن به تورك و ناوی تورکمانی بخهنهسهر وهکو بهم یاریکردنه به مێژوو بهڵکوو به دزین و تێکدانی مێژوو بهرز ئهبنهوهو شتێکی لێئهسێنن .

ئینجا با بێینەوە سەر چەند دێڕێکی وتارەکەی مامۆستا شاکر کە ئەڵێت:-

(اما في شمال العراق فقد تشكلت مدينة كوردية وهم فرع من فروع الأتراك (التركمان) القديم فتخالفوا في ما بينهم وتفرقوا عنهم فكونوا مدينة كوردية مستقلة و شكلوا الدولة العيلامية اى المدنية العيلامية (ال -- آم) وشيدوا عاصمتهم وهي مدينة (سوس) الكردية فيعني لكلتا اللغتين الكردية القديمة والتركية القديمة (الزينة) وهم من نفس الجنس والعرق فكلاهما آريون.

واما بعدها فقد هاجرت جماعة اخرى وهم قوم ساميون ويعتبرون جد العرب فكونوا ملكية سموها بالملكية الأكدية ومن اهم مدنها مدنية اكد وبابل العربية.

وبعدها تشكلت دولة سامية عربية سموها بالدولة الآسورية من اهم مدنها نينوى العربية . وبعدها تشكلت الأمبراطورية الأيثية بأواسط الأناضول (المدنية الأيثية ) اي (المدنية اللحمية).

کاك شاکر لەسەرەتای باسەکەیدا لە گەڵ جێگادا ناوی(مسیو پوتامیا) نەهێنێت بێنەوەی لە بنوبنچینەی وشەکان بکۆڵێتەوە..وادیارە کە ئەم وشانەی بیستووە بەبێ شارەزایی دایهێنێت . وە لەجێگایەکدا ئەڵێت (حضارة ما بين الرافدين) وە لێیونبوە کە ئەم وشەیە اصطلاحێکی یۆنانیە و پێکهاتووە لە دوو وشە (میسو) بەمانای بین وە (پوتامیە) بە مانای (دوو رووبار) واتە ( بەینی دوو روبار ) یۆنانیەکان بە ناوێکی جغرافیەوە ئەم ناوەیان ناوە چونکە هاتوچۆیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا زۆر کردوە وە بەناوی هەلکەوتی شکلی زەوییەکەوە ناویانناوە تەنانەت عەرەبەکانیش پێینەڵێن (الجزيرة).

ئینجا بابێینەوە سەر باسە عەرەبییەکەی لای سەرووی کاك شاکر کە ئەڵێت:

لە شیمالی عیراقدا شارەوانیەتێکی کوردی کۆن پەیدابووە کە ئەم کوردانەش تیرەیەکن لە تیرەکانی (تورك ، تورکمان)ی کۆن بەلام نارێکیی کەوتە ناویانەوە لێکجیابوونەوە هاتن شارەوانییەتی عیلامی (آل- ام) یان دروستکرد ئەمانە پایتەختی خۆیان دروستکردووە کە شاری (سوسی) کوردییە . بە هەردوو زمانەکە کوردی کۆنو تورکی کۆن یەعنی (رازاننەوە) کە هەردووکیان یەك جنسو یەك ڕەگەزن کە ((ئاری))یە.

لێرەدا کاك شاکر نازانێت ئەڵێ چی؟ لەلایەکەوە عیلامی وکورد دائەنێت بە دووتیر لەکوردوتورك لەلایەکی تریشەوە هەردووکیان ئەکات بە ئاری. سەیرە کاك شاکر وەکو سەری لەخۆی تێکداوە نیازی هەیە بەم مێژوونوسینە سەر لەئێمەش تێك بدات تێناگەم ئەم نووسەرە لە کوێوە پەیدابووە ، هیچ شوێنێکی تری نەدۆزیوەتەوە توخنی بکەوێت مێژوونەبێت . بە نوسینەکانیا کە هەرچەندە لە نووسین ناکات یەك شتم بۆدەرکەوتووە کەمامۆستا هەوڵوتەقەلا ئەدا هەتا دەستی بڕوا لە هەموو لایەك پارچەیەك دادڕێتوو بیکا بە تورك و تورکمان .

بە درێژایی وتارەکەی ناوی مێژوونووسێك نابات ..وە نالێت ئەم مێژوونوسە ئەڵێت و ئەویتریان وەها ..وەکو لەوەبترسێت بەدرۆبکەوێتەوە..! لەبەرئەوە هەرچەندە وتارەکەی نەوەناهێنێت وەلآم بدرێتەوە بەلآم لەبەر روونبوونەوەی مێژو چەند بەڵگەیەك و رووداوێکی مێژوویی ئەخەینە بەرچاو هەتا مامۆستا شاکر پەندی لێوەرگرێت.

کاك شاکر ئەڵێت کورد وعیلام لە جنسی تورکمانن وە پێکەوەبوون، کورد لە شیمال وە عیلامیش لە جنوبدا لە (عیراق ) . بەلآم ئەوەی شایانی باس بێت و هەتائێستا ساغبووبێتەوە بۆ هەموومێژوو نووسەکان کە ئەم دوو نەتەوەیە هاوسەدەی یەك نین . بەڵکو عیلامیەکان هاوسەدەی سۆمەریەکانن . کەچی کاك شاکر ئەڵێت ئە دووتیرەیە ناکۆکی کەوتە نێویان و لەیەکجیابوونەوە . نیشتمانی عیلامیەکان حەوزی رووباری کارون لای وڵاتی سۆمەرەکانی عیراق کە بە هەزارەها ساڵ دراوسێیان بوو لەکاتێکدا بەرە نەتەوەکانی ( کوردو ماد ) هێشتا نەهاتبوون وە پەیدانەبووبوو بەڵکو لەلای رۆژهەلآتی دەریای خەزەرەوە خەریکی مەڕومالآت بوون وە ناوبانگ یەکتریان نەبیستووە کەچی عیلامییەکان هەمیشە لەگەڵ سۆمەرو ئەکادەکان خەریکی شەڕو جەنگ بوون . ئەم شەڕو جەنگانە لەبەینیانا نەبڕایەوە بەڵکو لەگەڵ ئاشوورییەکانیشا بەیەکداچوون ئەم شەڕانە ۳ هەزار ساڵ پێش میلاد دەستپێکردە هەتا (٦٥٠)پێش میلاد لەکاتێکا پاشای ئاشوورییەکان (کە ئاشوور بانیپاڵ)بە پەلاماری عیلامییەکانیداو پایتەختە جوانەکەیان (سوس) ی گرتو وێرانیکرد

هەتا ئیستەش کەس نەیدیوە لە مێژوودا بوترێت کە کورد لای عیلامیەکانەوە بووە .
بێجگە لەمە کورد وعیلام لەیەك تیرە نین چونکە هەتائێستا زبانی عیلامی نەزانراوە چیبووەو ساغنەبۆتەوە بنچینەکەی چی وچۆن بووە؟ کەچی زبانی کوردی لەکۆنەوە ساغبۆتەوە کە لەکۆمەڵە زبانەکانی (ئاری )یە ئەمە بەڵگەیەکی مێژووییە. وە کەس ناتوانێ چاوی لێ بپۆشێتو بەدووری بخاتەوە . زبانە ئارییەکان وەکو هەموو مێژووناسەکانی رۆژهەلاتو رۆژئاوا ئەڵێن ئەچنەوە سەر یەك. وە لەبەرئەوەی زبانی کوردی لە تورکی ناچێتو ناچنەوە سەر یەك کەواتە هیچ کاتێك کورد تورك نەبووەو نییە . بە کورتی نەکورد، نە سۆمەر نە عیلام، تورکو تورکمان نین . وە ئەگەر مامۆستا شاکر نوسراوێکی مێژوویی وە یا بەڵگەیەکی مێژوویی هەیە ئەم قسانەمان بەدرۆ بخاتەوە زۆر سوپاسی ئەکەین کە بیخاتە پێشچاو هەتا پەشیمانبینەوەو ئەو شارەزاییەی لە مێژووشا هەمانە بیگۆڕین

با بێینەوە سەر وتارەکەی کە ئەڵێت:-

لەدوای ئەمانە کۆمەڵێکی تر هاتۆتە عیراق لە نەتەوەی (سامین ) وە بە بنچینە بەنەتەوەی عەرەب ئەژمێررین دەوڵەتێکیان دروستکرد کە ناوی (اکد) بو وە شارە بەناوبانگەکانیان (اکدو بابل)ی عەرەبین لە دوای ئەمانیش دەوڵەتێکی تری سامی عەرەبی دروستبووە کە ناوی (ئاشووریە) وە جێگایان شاری (نەینەوای) عەرەبییە .
لەدوای ئەمانیش ئیمپراتۆرییەتێك پێکهاتووە لە ناوەندی ئەنادۆڵ کە پێیئەڵێن دەوڵەتی (اینی) وە یا (حث..هیت) کە کاك شاکر (اللحمی)یشیان پێئەڵێت کە من ئەم ناوەم نەبیستووە.

کاك شاکر لەسەر وتارەکەی ئەروات و ئەڵێت:-

(وفي تلك الأونة كانت تحكم مصر ملكية قويه جداً وكان ملكها رعميس الثاني ، واما سورية فكانت ، مطمع الأنظار الدولية فهاجمت الدولة الأيثية المصرية القدماء في زمن ملكها (مواناليش) وكانت الجيوش الأيثية مؤلفة من ثلاثة الاف عربة للقتال مع عشرون الف جندي ليستولوا على سوريا فانهرمت الجيوش المصرية وبعدها اعلنو الهدنة في مدينة (كاداش) في اواسط سوريا سموها (بالمعاهده الكاداشية)اي المعاهدة

الأخوية وهي اقدم المعاهدات والصداقة التي نعرفها عن التأريخ ويمكننا ان نفهم بنود المعاهدات عن اللوحات المكتوبة والموجودة في كل من مصر وفي بوغاز كوي بتركيا اي قرية الحنجرة وهي الآن مترجمة الى اللغة التركية الحالية .!انظر كتاب الفيلسوف التركي الشهيد العلامة شمس الدين كون الطاي (شمس) (الدين) (الطاي) الشرق القريب صحيفة (١١١ودومه) وهذه الصداقة و الأخوة لم تتزعزع الى انهيار المدنية الأيثية . وحتى تزوج ملك مصر بنت الملك الأيثي.

و اما العبرانيون اي الأسرائليون او اليهود منهم قوم ساميون وقد سكنوا بين العراق و سوريا في حالة رحالة ثم اتى نبيهم (موسى ) عليه السلام فذهبوا الى فلسطين الحالية (الأرض الموعود) وذهبوا ايضاً الى مصر ثم رجعوا الى فلسطين وهاهم يعيشون في فلسطين .

كاك شاكر ئەڵێت لەوكاتەدا لە مصر دەوڵەتێكی بەهێزی بەدەسەلات پەیدابوو فرعەونەكەیان ناوی (رەعمیسی دوهەم بوو) ولاتی سوریە كە لەبەینی ئەم دوو دەوڵەتەدا بووە واتە (حیث و مصریەكان ) بۆتە مەبەستی شەڕ و هەرا لەسەر دەستكێشان بەسەریاو داگیركردنی . (حیث)یەكان لە زەمانی (موتالیش) ی شاباز پەلاماری مسریەكانیاندا ، لەشكرەكەیان پێكهاتبوو لە ٣هەزار گالیسكەی جەنگ و ٢٠هەزار سەربازی چەكدار . وەخت بوو میسریەكان شپرزە بكەن و بیانشكێنن لەمكاتەدا دەوڵەتی آسوریەكان

پەرمیسەندبوو ترسی خستبووە كایەوە، لەبەرئەوە هەردولا ڕێككەوتن وە لە شاری (كادەش ) لە ناوەندی سوریادا (پەیمانیان) بەستو ناویان نا پەیمانی (كادەش).

ئەم باسەی مصرو (حیث)یەكان پێویست نەبوو كاك شاكر بینوسێت چونكە باسەكانی لە مێژووی كۆنی عراق ئەدوێت نابێت باسی شوێنێكی تر بكاتەوە پەیوەندی نیە هیچ بە مێژووی كۆنی میسرەوە بەلام بلێین چی مامۆستا شاكر چەقۆی هەلگرتووەو كەوتووەتە گیانی مێژوو لە هەموو لایەكەوە دەلاقەی تێكردوو ..ئێمەش هەر بەوەدا ئەگەین بیدوورینەوە و پینەی بكەین بەلام ئەمەی بۆچی

کردووە؟ لەبەرچی لــە سـنوری وتارەکـەی دەرنـەچێت؟ بێگومـان مامۆسـتا هـەروا فێربووە کە زانستیی‌و زانیاریی لەبازاڕی مەرامی خۆیدا بە فرۆشتن بدات .
بەراستی لەبەینی میسری و حیثیەکاندا لەسەر داگیرکردنی سوریە گەلێك شەڕوشۆڕ وهەرابووە، فیرعەونـەکان زۆر بــەهێزبوون هـەروەها حیثیـەکانیش ، مسـریەکانیش لەشکرەکەیان بە چۆڵی سینادا کێش نەکرد بۆسەر سوریا لـە ڕێگا ئەزیـەتو نـازارێکی زۆریان کێشا ...هەتا کە تووشی شەڕبوون لەگەڵ حیثیەکان دەرەقەت نەهاتن‌و شکان .
لەمکاتەدا وەکو وتمان ئاشووریەکان سەریان دەرهێنـابوو پـەرەیان سەندبوو بازوویـان بـەهێز بووبـو ترسـیان خستبووە ئەوناوچەیـەوە وە لەترسـی آشـوورییەکان مسـری‌و (حیث)یەکان کەوتنە گفتوگۆ و لەیەك نزیکبوونەوە وە پەیمانی ئاشتییان لە(قادەش ) بەست بۆ بەرهەڵست‌و بەربەرەکانیی ئاشوریەکان . لە ساڵی ١٢٦٠-١٢٦٨دا
کاك شاکر ئەڵێت کە ئەم پەیمانە برایانە بووە و وائەزانێت کە (قادەشی) لە (قارداشی )ەوە هاتووە واتە (هاوڕێ –برا) وە ئـەم قسـەیەی بۆنـی ئـەوەی لێدێت بـەڵکوو واشـی داناوە کە حیثیەکان (تورکن) . بەڵام ئـەوی راسـت بێـت شوێنەکە نـاوی (قادەشـە) وە پەیمانەکەش بەو شوێنەوە کە لێیگیراوە ناونراوە . وە بووەتە (پەیمانی قادەش) .
مامۆستا شاکر لەوتارەکەیدا کات و ساڵی مێژوو نانووسێت..ڕووداوەکانیشی بـە تـأریخ لەیەك جیاناکاتەوە کە ئەمە بنچینەیەکە هەموو مێژوونووسێك لەسەری رۆیشتووە .
چونکە ئەگەر وەها نەبێت مێژوو نەبێتە سەرگوزشتەی منداڵان . هەر لەبەرئەوەبوو کە ئەو تأریخانەم داناوە ئایا مامۆستا مێژووی نێو ئەم دوو دەوڵەتە کە پـتر لـە (٥٠٠) ساڵە بۆچی بەتـەنیا ئەم رووداوەی هەڵبژاردووە کە هیچ پێویسـت نییـە چونکـە هیـچ جـۆرە پەیوەندییـەکی بـەمێژووی عیراقـەوە نییـە، لاموایـە هەرلەبەرئەوەیـە کـە مێژوونووسەکانی ئیمـڕۆی تـورك (حیثیەکان) بـە تورکمـان دائـەنێن . ئەمانـەی لـە ئەنادۆڵی ئیستەدا ژیاون وە پەیمانی (قادەش ) لە مێژوودا نرخێکـی بـەرزی هەیـە وە وێنەیـەکی ئـەم پەیمانـە لای حیثیـەکان بـووە لـە (بوغـاز کـوی) کـەلای (سیواسـی )ئیستەوەیە گوایە ئەم پەیمانەش گۆڕاوە بۆ زبانی تورکـی . لەبەرئەمەیـە کـاك شـاکر ئەم تایبەتییە ئەدا بەم پەیمانە- وەکو کاك شاکر ئەڵێت- کۆنترین پەیمانی مێژوو نیە

. چونکە پەیوەندی مێژووی عیراق‌و میصر زۆر لەم پەیمانە کۆنترە ئەچێتەوە
هەزار ساڵ پێش میلاد وە لەو کاتەدا لەهەردوو لا واتە (مصرو عیراق) نووسیر
داهاتووە. گەلێك کاروباری سیاسی‌و ئابووری وعەسکەری پێنوسرابوو . هەروەها
گەلێك شەروهەراو هوریا کە لە مێژووی کۆندا ڕوویداوە بە بەستنی پەیمان کۆتایی
پێهاتووە . کە هەموو ئەو پەیمانانە لە پەیمانی (قادەش) کۆنترن .
لەم لایەنەوە ئاشکرا دەرئەکەوێت کەنوسینەکەی کاك شاکر بێبەشە لە هەموو جۆر
نرخێکی مێژوویی .
لەدوای ئەمە با بێینەوە سەر باسی جنسیەتی (حیثیەکان -هێت- ایپییە) کان هەت
ئێستا لەمێژوودا دان بەوەدا نەنراوە کە ئەمانە تورانین ..وهەموو مێژوونووسەکان
ئەڵێن.. جنسیان ونەو وئاشکرا نییە ! بەلام هێندێکیان ئەڵێن (قەفقاسی)ن تەنانەت
هێندێك نوسراویان دۆزراوەتەوە کە بەخەتی هیرۆگلیفی نوسراون بەلام هەتائێستا
نەخوێندراوەتەوە . هەروەهابەخەتی(مسماری)ش نوسراویان هەیە دیسان
دەرنەکەوتووە کە حەل بووە یان نە ..لەمە بەولاوە بەڵگەی تر نییە کە بزانین چین
! لە مێژووی (مصرو ئاشور )دا زۆر ناویان هێناون و باسیانکردوون ، بێنەوەی باسی
ڕەگەزو جنسیان بکەن ..وە ئەگەر ئەم نوسینانەی مصرو ئاشووریەکان نەبوایە
ناونیشانمان نەئەزانی ئنجا نازانم نوسراوێکی مێژوویی تایبەتی لای مامۆستا شاکر
هەبێت یان نا کە ئەمانە بەتورانیی دابنێت . ئاخۆ فەیلەسوفی بەناوبانگی تورا
(شمس الدین گون الطای) لە نوسراوەکەیدا لە جنسیەتی حیثیەکان و هەموو ئە
نەتەوانەی کاك شاکر باسی کردون دواوە یان نا ؟ کاشکی ئەو نوسراوە بەنرخەما
دەستبکەوتایە .
کاك شاکر لە بابەت مێژووی (جوولەکە )شەوە لەژێرپەردەی هەندێ وشەی بێمانا
داپۆشراودا خۆی شاردۆتەوە . ئەبوایە کەمێك لە مێژووی کۆنی ئەم میللەتە بدوایە
چونکە ئەم خێڵە بەدبەختە زۆر نوشوستی دیوە گەلێجار هیجرەتیان پێکردوون
بەڵکو هەتا عیراقیش بەشداربووە لە موهاجرینی جوولەکە ..لە ئالەباری خۆیانەوە
توشی گەلێك مەینەت بوون .

دەوری کۆچەری (جوولەکە) کە هێشتا (بدو-رەوەکیی ) بوون لە دەشتی شامدا لە بەینی عیراق‌و سوریەدا هاتوچۆیان کردووە . بەراستی مێژووی ئەم کۆچ‌و رەومیان زۆر روونناك نییە . مەگەر (تەورات) ی خۆیان بیگێڕێتەوە کە پڕە لەئەفسانە . ئەگینا مێژووی ئیمرۆ ئەو رۆژانەی ئەنوسیوە . چونکە بەلگەکانیان هەموو قسەو گێڕانەوەیە کە جێی باوەڕ نییە .

وەکو لە مێژوودا باسکراوە بنچینەی (جوولەکە) لە حەزرەتی (ابراهیم)ەوەیە. کە بەخێڵەکەیەوە لەلای (اور المقیر) لە عیراقەوە هەلاتون بۆ لای (سوریە ) لە دەوروپشتی (١٥٠٠) سالْ پێش میلاد ..وە لە ئاخرو ئۆخری ئەم دەورەدا هاتوونەتە ولاتی (فلستین) لای (اوردون) دانیشتون نزیك سنوری دەشتی شام لێرەدا دانیشتوانی ئەوناوچەیە ناویاننناون (عبرانی) وە وا ئەزانم کە تیرەیەکن لە عمۆریەکان، لەو رۆژانەدا ئەوناوچەیە پڕبووە لە نەتەوەی سامییەکان وەکو (ئارامییەکان ، کەنعانییەکان، فینیقییەکان ، ئادوم و ئامون، عمالقە وفەلەستینییەکان ) جوولەکەکان بۆ خۆژیاندن لەوناوەدا خەریکبوون ، جارجاریش گەلێکیان لیْ ئەرۆیشت بەرەو مصر هیجرەتیان ئەکرد ، تەنانەت سەرگوزشتەی حەزرەتی (یوسف)وە مهاجەرەتی خۆی و براو کەسەکانی لەمْ دەورەیەدا بووە . بەمجۆرە جوولەکە لە مصردا پەرەیسەندووە ژمارەیان زیادبووە . لەوبەینەشا مصرییەکان رۆژی دەسەلاتو دەستداریبان بوو فیرعەون رعمسیسی دووەم پادشایان بووە ئەمە پێش میلاد لە دەوری (١٢٠٠-١١٠٠)دا.

مصریەکان حەزیان لە نەتەوەی بێگانە نەئەکرد لەبەرئەوە بەتایبەتی جوولەکەکان کە ئیشکەروخاوەن سامان بوون مصریەکان رقیان لێیان بوو وە زۆر ئازاریان ئەدان وە گەلێك جار ئەیانکوشتن ! ئنجا (موسا پێغەمبەر) پەیا بوو وە ئەمانەی لە دەردو ئازار رزگارکرد وە لەمصر دەریهێنان بردنی بۆ فەلەستین واتە (ئەرزی مەوعود) ئەم هجرەتە تازمیەشیان پڕ لەئەرك‌و مەینەت بوو دەردو ئازاریان زۆرکێشا هەتا گەیشتنە فەلەستین.

جا لێره بەدواوه جوولەکەکان بوون بە نەتەوه . بە شەرو بەزۆر جێگای خۆیان کردەوه نەتەوەکانی ئەو ناوەیان شکاند خۆیان لەفەلەستین نیشتەجێکردو دامەزراند . دوا بەدوای ئەمەش دەوڵەتە بەناوبانگەکەی حەزرەتی (داودو سلیمان) پەیدابووه و شاری (قدس) کراوه بەپایتەخت (٩٥٠) ساڵ پێش میلاد .جوولەکەکان دوای ئەمە کەوتنە زرمە زڵ و ئاژاوه لەناوخۆیاندا . لە ئەنجامدا جیابوونەوه بوون بەدوو حکومەت . دەوڵەتی یەهود لە جنووبدا لە (قدس) وەدەوڵەتی اسرائیل لە شیمالدا لە شاری (سامزی)یە .

ساڵی (٩٣٠) پێش میلاد . تا حەزیو دووبەرەکی هەردوو لایانی بێ هێزو بێ دەسەڵات کرد ، لەدواییدا دەوڵەتی (اسرائیل ) بە هێرشی لەشکری ئاشوریی لەناوچوو لەساڵی (٧٢٢)ی پێش میلاد، وە ساڵی (٥٨٦)ی پێش میلادیشا (نبوخذ نصر)ی مەلیکی (بابل) شاری قدسی زەوتکردو وێرانی کرد وە بەمە دەوڵەتی یەهودیش لەناوچوو.

لەمانە ١٠٠هەزار کەسێك پتر بە یەخسیری برانە بابل لە عیراق . وە هەرچەندە (کەیخەسرەوی گەوره) کە جوولەکەکان (کورشی) پێ ئەڵێن کاتێك هاتوو بابلی داگیرکرد ئەم جولەکانەی ئازادکردو ناردنیەوه بۆ فەلەستین بەلام جوولەکەکان جارێکیتر یەکیان نەگرتەوه و سەربەخۆییان نەدیوەتەوه لە کارەساتی بابلەوه (٢٥٣٥ ساڵ جوولەکە بە ولاتەکانی چواردەوری دەریای سپیدا بلاوبۆتەوه بە ئازارو سەرگەردانی رایبواردووه . وە ئێستە بەناو هەموو ولاتانی سەر زەمیند بلاوبوونەتەوه تێکەڵ بە نەتەوەکانی جیهان بوون بەلام لە پەرشوو بلاویو مەینەت رزگارنەبوون هەتا ساڵی ١٩٤٨م بەزەبرو کوتەکی ئەمەریکاو ئینگلیز هێنرانەو فەلەستین دوای ئەوەی عەرەبەکانی ئەوێیان بە زوڵم و بە زۆر ئاواره کرد ..جوولەک لە فەلەستین دامەزراو حکومەتیان بۆ دروستکرا لەژێر پاسەوانێتی چەکو جبەخانەی ئەمەریکاو ئینگلیزدا بەلام هێشتا ناتوانین دوارۆژ بخوێنینەوه ..وە نازانین ئە مەسئەلەیە چۆن ساغنەبێتەوه، چونکە عەرەبەکان داوای مافی خۆیان ئەکەن لەدوای باسی جوولەکەکان کاك شاکر لە مێژووی (هەولێر اربیل) ئەدوێ بەبۆنەی باسی ئەسکەندەری گەورەوه ئەڵێت:

( وبعد ذلك هاجم جيوش الأسكندر الكبير المكدوني (جنا قلعة)_بوغازايجي- في استانبول بتركيا ومنها دخلوا العراق (ميزوبوتاميا) في عهد الملكية الفريكية وقد حاربه الملك (بيرس) لكي لا يدخل الأراضي السورية ولكنه دخل ثم حاربه الملك داريوس في مدينة (اربيل) العراقية الحالية ولكنها خضعت الى الملك الأسكندر المقدوني الكبير ، وتقدم الأسكندر الكبير على مدينة بابل ودخل مدينة (سوس ) الايرانية واعلن نفسه ملكا على الأمبراطورية (البيرسية) وعندما دخل بابل اعلن من قبل جيوشه بملك آسيا .

وبعد ان ضبط الأسكندرية مدنية اربيل التركية الحالية (آر-بيل) متركبة من كلمتين توركيتين (آر-((الجندي))- او (الرجل ))- او (الزوج) او السيد او ((افندي)) و ((بيل- اعرف) وبعد ذلك اراد ان يفتح بلاد توركستان في اواسط آسيا الكبرى مواطن الأتراك الأصلي وامهم الحنون ووطنهم الأقدم . ففتح مدينة (سمرقند)) التركية الحالية وبعد ان تعاهد معهم أراد أن يفتح بلاد الهند ولكن جيوشة عصوا عنه وثاروا عليه لأنهم ابعدوا عن ديارهم مدة ستة سنوات فرجعوا ثانية الى مدينة بابل بعد ان خسروا كثيرا من الجند والديار . وبعد ذلك هاجم (الهونيون الأتراك) الى الغرب فكونوا امبراطورية هونية تركية قديمة في الغرب تحت قيادة ملكها (أتيلا).

كاك شاكر ئەڵێت: دواى ئەوە ئەسكەندەرى گەورەى مەكدۆنى بە لەشكرەكەيەوە لە گەروى (بوغازايچى) پەڕییەوە بەرى ئەنادۆڵ، ئەوكاتە ئەستانبۆڵ هێشتا نەبوو ، بێجگە لەوەی اسكندر لە بوغازایچییەوە نەپەڕییەوە بەڵكو لە چەناقلعە پەڕییەوە ئنجا چونكە كاك شاكر تەقەی سەری دێت لەمەیدانی مێژوودا هەر لەبەرئەوەی گەلێك نەتەوەو شوێن بكات بە توركو توركمان ئەم ئەركە قورسەی خستە سەر شانی و ئەم وتارەی نوسیوە . باشتر ئەوە بوو یەكسەر بیوتایە هەموو نەتەوەكانو جیهان توركن و نیشتمانی توركە چاتر بوو .ئنجا اسكندر كە پەڕییەوە بەری ئەنادۆڵ لەگەڵ لەشكری ئێراندا بەشەڕهات ، لەشكری ئیران شكا لە (٣٣٤پێش میلادا) وە ئەنادۆڵی ئەمجا بڕی وە بۆجاری دووهەم لەگەڵ لەشكری دارا لە سنوری سوریەدا لە شەڕی (ایسوس) بەشەڕ هاتو لەشكری دارای شكان (٣٣٣پێش میلاد) لەوە بەدواوە مصرو سوریەی گرت وە شاری ئەسكەندەریەی لە مصر دروستكرد لەباتی شاری (صور) كە

ئەختو تاراجی تێکدابوو لە سوریە. ئەمجا وە ڕوویکردە عراق وە لە ساڵی (٣٣١) پێش میلاد لە (اربیل- هەولێر) بۆ جاری سێیەم لەگەڵ لەشکری دارا بەشەڕ هاتو شکاندی وە بەم شکاندنو تەفروتونایە دەوڵەتی (ئەخمینی) لە ایران لەناوچوو ، وە لە شاری (بابل) دا لەلایەن لەشکرەکەیەوە بانگیشاهێتی ئاسیای بۆ درا. لەدوای ئەمە مامۆستا شاکر دێتەوە سەر بنچینەی وتارەکەی کە مەبەستی ئەوەیە هەموو شوێنێك وە ئەتەوەیەك بکاتە تورك ئەڵێت: -شاری (اربیل- هەولێر) کە شارێکی تورکە بەناوەکەیدا کە پێکهاتووە لە (أر) یەعنی (پیاو، افندی، جندی) وە (بیل یەعنی (اعرف) بە کوردی (بزانە، تێبیگە) واتە مانای شاری أربیل (جندی-اعرف) ئەگرێتەوە، ئا بەم قسە پڕوپووچانە کاك شاکر ئەیەوێت شارێکی کوردی کۆن بکات بە تورکی . لەکاك شاکر ئەپرسین..ئایا ئەونەتەوە تورکەی ئەم شارەی دروستکردو ناوینا (جندی- اعرف) (سەرباز-بزانە) چییان لێهاتو ناویان چیەو چۆن ئێستە هەموو بە کوردی قسە ئەکەن ! ئەوەی جێی بڕوایە ئەوەیە کە زبانی کوردی لە تورکیەوە دوورەو لەیەك ناگەن..کەواتە چۆن دانیشتوانی ئەم شارە هەموویان بوون بە کوردو فێری قسەکردن بوون بەکوردی . وادیارە لای کاك شاکر بە تەلیسە گۆڕاون..چونکە وتارە پڕئەفسانەکەی کاك شاکر لە تەلیسمەوە زۆر نزیکە . لەو بڕوایەدام ئەگەر مامۆستا شاکر باش وردبێتەوە وە لەمێژوو تێبگات و شارەزایی تێ پەیدابکات زۆر پێکەنینی بە وتارەکەی دێت.

هەرچی ڕاست بێت وە بۆ مێژوو نووسەکان ساغبوبێتەوە ئەمەیە کە ئاشوورییەکان (أربا أیلو)یان بە (أربیل- هەولێر)ی ئێستە وتووە . ئەم وشەیە بە زمانی سامی (ئەربا یەعنی- أربعە- چوار)) وە ناوی (ایللو) کە ناوی خوایە (بت) پێکهاتووە واتە شاری چواربتەکان . چونکە بتپەرست بوون وە لە بتخانەکەیان هەر ئەو چوار بتەیان تیاداناوە کە زۆر لایان مقدس بووە. وە بۆ سوککردنی ئەم وشەیە لەسەر زبان بۆتە (اربللو)..وە دوایی بۆتە أربیل. وە کوردەکان کردوویانە بە (هەولێر) .(١)

---

(١) چونکە لەشکری (ماد) کە هەڵمەتی بردو شاری ئەینەوای داگیر کرد وە دەوڵەتی ئاسوری لەناو برد . دەستە لەشکری (کوردوخ) ی مادیش ڕوویکردە (اربللو) شارەکەی

پێچاوە و داگیریکرد لە سالی (٦١٢)ی پێش میلادا. ئنجا کورد لەوحەلەوە لە شاری (أربللو)دا دانیشتووە بە درێژی وەخت ناوی (أربللو) بەدەم خەلقەوە بۆتە (أربیل) وە لە دوایپیدا سووکتر کراوە کوردەکانی لادێ کردوویانە بە (هەولێر) .

ئەومتی کوردۆخییەکان کە نەژادی کوردن (اربیل)یان داگیرکردووە لە تأریخ ی (٦١٢)ی پ.ز دا تا ئێستا (٢٥٧١) سالە کوردەکان شاری أربیل و ولاتەکەیان بەدەستەوەیە کە کونوقوژبنی هەموو بۆتە کورد دەخلی تورکمانێتیی بەهیچ جۆرێك تیانییەو تیانەبووە ئنجا قەومایەتی ولاتی (أربیل) لە ئاسورێتییەوە بۆ نەتەوەی (کوردایەتی) بەمجۆرە وەرگەڕاوە و ساغبووەتەوە...

---

ئیمڕۆ کورد لای سووك و ناشرینە شاری أربیل بەدەستکردی خۆی بزانێت چونکە لەکاتێکا شاری أربیل بنیاتکراوە ئەوکاتە هێشتا کورد نەهاتبووە ئەوناوچەیە. کاشکی مامۆستا شاکر ئەم خووە لە کوردەوە فێر ببوایە . لەدوای باسی هەولێر کاك شاکر ئەگەڕێتەوە سەر باسی ئەسکەندەر ئەڵێت :-

ئەسکەندەر بە لەشکرەکەیەوە چوو بۆ تورکستان نیشتمانی باووباپیری تورك وە ئەو ولاتانەی داگیرکرد وە پەیمانی لەگەلْ نەتەوەکانی ئەو ناوەبەست.

ئەمانە ڕاستە نیشتمانی تورکە، کەس لاری لەمە نییە وە بە درۆی ناخاتەوە . ئینجا ئەسکەندەر گەلێك شاری تازەی لەوناوەدا دروستکردووە لەسەر ڕووبارورێبازەکان جا پێویستە بۆ زانین تەماشای نەخشەی مێژوویی ئەم داگیرکردنەی ئەسکەندەر بکەین تا شوێنی ئەو شارانە ببینین.

هەروەها چونە هندستانیش ڕاستە لەویْ لەشکرەکەی مانی لێگرت نەچوون لەگەلی لەسەر ئەوە بە چۆلی جنوبی ئێراندا وە بە دەریای هیندیدا گەڕایەوە بابل . لە گەڕانەوەدا لەشکرەکەی تووشی ئەندێشەو زیانێکی زۆربوو ئەمجا کاك شاکر جارێکیتر بانەداتەوە سەر باسی هونەکان، کە بە دوورو درێژی باسمان کردولێیدوایین . بەلام مامۆستا وازناهێنێت وە لەسەر ئیمپراتۆرییەتەکەی (ئاتیلا) ئەڕوات کە بریتییە لە سەردەمێکی کەم وە ماوەیەکی بچوك . ئەویش هەر ئەوەیە هەتا (ئاتیلا) مرد ئەوسا

ئیمپراتۆریەتەکەشی پەرش‌وبڵاوبووەوە . هەر شوێنە حکومەتێکی محلی سەربەخۆی تیا دروستبوو . قەومەکەشی کە هونەکان بوون، بەرەو رۆژهەڵات گەڕانەوە وچوون بۆ لای رووسیەی ئیستە تێکەڵ بە بلغارو ئاوارەکانی لای روباری ڤۆلگا بوون . بەکورتی دوای ئەم شەڕو تەقەلایە تەنانەت ناوو نیشانیشیان نەما. ئنجا نەتەوەکانی (تورك ومەغۆل وتاتار) لەهەموو جێیەکا ئەمە ئەنجامیان بووە.بەهەرچی شوێنێکا رۆیشتبن ژێرەوزەبەریان کردووە هەتا دوایی ئنجا خۆیان لەناوچوون. مێژوو ئەمە بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە لە (٤٣٣ – ٤٥٣م)دا ئەو کاتە سەردەمی ئیمپراتۆریەتەکەی ئاتیلایە. ئنجا مامۆستا شاکر ئەڵێت﴿ ثم تشكلت امبراطورية الأتراك الزرقاء " كوك تورك امپراتوريتى" فامتدت من سيبيريا الى العراق وحتى حدود الصين والهند والتبت وفي المرة الثانية مشى الأتراك(الاويكوريون) " اويكورلر توركلرى" الى الغرب فكونوا امبراطوريتهم،فقد هاجرو ايظا الى الصين فكونوا امبراطورية وهم قوم من المغول فقد تعاونوا وتاجروا مع الصين والهند وايران.

وقد قبل الأتراك الغربيون الدين الأسلامي الحنيف أولاً ثم بعدهم بأزمان طويلة قبلو الدين الأسلامي الأتراك(الاويكوريون)وبعدهم دخلوا ضمن الأمبراطورية المغولية واليوم يوجد ملايين من الأتراك في الصين وهم من نفس القوم والجنس والنسل وقد ذهب الأتراك مرة ثانية الى الغرب وهم " اوارلر ،بولغارلر، ماجارلر، پچنكلر، اوتموزلر كومابنكر" .

مامۆستاشاکر لەوتارەکەیدا وەکو وەکو لەلای سەرەوە نوسراوە،بەناسانی وبە خاوێنی وبێگرێ باسی عەشایەری تورکەکان ئەکاو ئەڵێت: ئیمپراتۆریەتی تورکی زەرقا (گوگ تورك) ئیمپراتۆریەتی پەیدابووە لەهەموو مێژووەکانی رۆژئاوادا وەلەهەموو نوسراوە مێژوویەکانی رۆژهەڵاتدا کەلە ڤوتابخانەوکۆلیج ودانشگاکان ئەخوێنرێت، ئەوە وشەیە نەخوێنراوەو باسی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی وەها جیهانگیرانە نەبیستراوە هەرچی هەیە ونیە ئیمپراتۆریەتە خەیاڵییەکەی( اوغوزخان)ی باپیری تورکەکانە بێگومان نیازی ئیمپراتۆریەتەکەی (جەنگیزخان) نیە چونکە جەنگیزخان مەغۆلە تورك نیە. کاك شاکر ئیمپراتۆریەتی زەرقا بە تورك دادەنێت و اوغوزخانیش زۆر

کۆنە لەپێش میلاددا بە هەزاران ساڵ پەیدا بووە. باسەکانی گشتی خەیاڵیین.. بەکورتی ناتوانین پتر لەمە لەو ئیمپراتۆریەتە جیهانگیرە بدوێین کەهەموو جیهانی ئەوسەردەمەی تێکەوە پێچابێ.

اویغورەکان مەغۆل وتورك تێکەڵاون نەتەوەیەکی ماقول بوون لای اوغزخان وە لە کیشوەری تورکستانی چینی ئێستەدا دانیشتوون ونەتەوەیەکی مەدەنییان لێدەرچووەوئاسەواری جوانیان بەجێهێشتووە، مەرکەزیان شاری (تورفان) بووە، سەربەخۆبوون ولەکاتی(٨٥٠)ی میلادیدا هێزو دەسەڵاتیان پەرمیسەندووە، وە لە شیمالی دەریای (خەزەر) لە تورەی (قیچاق) دەوڵەتی (ئالتون ئەردۆ) دروستبووە .

ئەوسا رووسەکان هێشتا هیچ نەبوون نەیانئەتوانی لە دەشتە ساردەکانی رووسیا بێنەخوارەوە لەتاو عەشایەرە دڕندەکانی تورك‌و مەغۆلی ئەوسەردەمە سەددە(شورا)ی چینی بەناوبانگ لەتاو پرکێشیی‌و هەڵمەتی عەشایری تورکمان . خاقانەکانی چین دروستیانکردووە بۆئەوەی بەربەست بکرێن نەچنە ناو چینەوە لە دەوری ٢٢٠ی پ.ز.م دا سەددەکە تەواوبوو .

وە ئەم سەددەیەش هەر بەینێك کەڵکی بووە لەدوای بەینەکە تورك‌ومەغۆلەکان دڕیویانەو هێرشیان بردۆتە ناو چین . بە کورتی لە زەدو خوردو لەشکر ئاراییو حوکم‌کردن و سەرکەوتنا تورکەکان مانەندیان نەبووە و دەستێکی باڵایان هەبووە، بەڵام لەپێشکەوتن و ئاوەدانکردنەوەدا بێکەڵك و بێبایەخ بوون . لە جیهانگیرییدا هیچ قەومێك لەبەریانا نەوەستاوە لە ناوەندی ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا لە ژمارە نایەت ئەوەندە حکومات ونیداراتی چەتەگەرییان پێکەوەناوە بەڵام لەئەنجامی کارا هیچ دەوڵەتێکیان نەگەیشتۆتە ئیمڕۆ هەمووی لەناوچووە، تورکیای ئێستە نەبێت ئەویش گەورە نەبووە بەڵکو بچوکتربۆتەوە مجارستانیش کە چووە سەر ئاپینی (عیسی) تامێ مەدەنییەتی تێگەڕا و نەفەوتا چونکە تورك هەر جەنگی لەدەستدێ . وە لە دوا ڕۆژدا بچوکتریش ئەبێت ..

لەپاش ئەم هەموو گردەوبردەیە کە ئیسلامییەت پەیدابووە لە سەدەی دووەمی هجری بەدواوە( کە ٨٥٠ی میلادی ئەگرێتەوە) بەرەبەرە ئەبوون بەئیسلام. ئەوسا

نەهاتنە ولاتی ئیسلامەوە..نەبوونە سەربازو نەچوونە لەشکری حکومەت ئیسلامییەکانەوە ! هەرچەندە لەپێشەوە خزمەتی خەلیفەکانی عەباسییان کردوو بەلام لەدواییدا بوونە بەلاو چوونە ملی دەولەتی میللەتە ئیسلامەکانەوە، کار دەسەلاتێکیان خستە ژێردەست خۆیان ..خەلافەت نرخی نەماو لەناوچوو ئەوس کۆمەل کۆمەل بەخێل و سەروماڵیانەوە رژانە ولاتە ئیسلامەکان و هەموو تورکستا و ئێران وعیراق ونەنادۆلیان خستە ژێرچنگیانەوە هەر ئەمانە بوون دەرەبەگیا پەرە پێداو دروستیانکرد (دەوری ئالتونی) عەباسیەکان تەفروتوونا بوو، ئیسلامییە قازانجی لەمان نەدی لەسزا و زیان بەولاوە . تەنانەت لە دەوری جەنگیزخان نەتەوەکانی کە لەمەغۆلەکانن وە تەیموری لەنگ کە تورکە هەموو نەتەوە ئیسلامییەکان ئەو حەلە کە رۆژئاوای نزیكو ناوەند نەگرێتەوە پەرێشان سەرگەردان بوون . ئەمانە لە کوشتار بەولاوە هیچیتریان نەئەزانی لە کەللەسەر ئادەمیزاد منارەیان دروست نەکرد..وە ئەمەش بە شانازییەوە ئەینووسن ئەگێرنەوە . کەوتن و لەناوچوونی مەدەنیەتی بەرزی ئیسلامییەت لە کردەو ناپەسەندەکانی ئەم تازە موسولمانانە بووە بە لایەنی کەمەوە نزیکەی ٢٠ ملیۆ ئادەمیزادیان کوشتووە . دەستیان لە مندالو پیرو پەککەوتەو ئافرەت نەپاراستوو بەلکو ئەیانکوشتن چونکە هێندە چاوبرسی و بەرچاوتەنگ بوون . ئەمانەیا ئەکوشت هەتا ئانخۆر نەمێنێو هەمووی بۆ ورگی خۆیان بێت .

ئەنجا با بێینەوە سەر باسی (مجارو ئاوار) ئەمانە دوو تیرەی ترن لە جنوبی روسیە ئیستە لای رووباری فۆلگاو دینیەپەرادا ژیاون ئەمانە بە رەگەز وجنسیەت تورکمان وە تێکەلاو بەیەکتری بوون، وە نەتەوەی ((خەزەر) یش هەر تێکەل بە مجار بوو لەکاتی ئارامگرتنو کۆچ و رەوی دەشتەکانی جنوبی رووسیەدا لە (٨٩٠) میلادی .

زۆری نەبرد کۆمەلی عیلانی (پەچەنك) پەلاماری ئەمانەیداوە، ئەمانە لەترس پەچەنکەکان بەرەو رووباری طونە ((دانوب رایانکردووە وە لەوێوە چوونەت مجارستانی ئێستە لەوێ گیرساونەتەوە. تا ئێستا نەزانراوە کە ناوی مجار لە چییەو هاتووە، ئەلێن مجارەکان خۆیان بە خۆیان وتوە مجار (٩٠٧) میلاد.

ئەو حەلە ئەمانە درندە و كێویی و كۆچەر بوون ، تەنانەت لە مجارستانیشا ماوەیەكی زۆر هەر لەژێر هەواردا ژیاون . گۆشتیان بە ئاگر گەرم ئەكردو ئەیانخوارد وە ((٥٠)) ساڵێك بە تاڵان و هێرش بردن ئەوروپای ناوەندیان پەرێشانكردوە ئەمانە ساڵی (٨٧٠) میلادی چوونە سەر ئایینی عیسایی وە لە سایەی ئەم ئایینەوە هێمن بوونەوە و گروكفی كێوێتییان كەمبووەوە دامەزرانو تێكەڵاو بەنەتەوەكانی ئەوروپا بوون و وەك هۆنەكانی خزمیان بەسەرهات . كە ئەتیللا مرد پەرشوبڵاوبوونەوە و كەس بە سەروشوێنی نەزانین كەمێكیان نەبێت كە خۆیان گەیاندەوە ڕووباری ڤۆلگا لە شیمالی دەریای خەزەردا بەڵام بولغارەكان كە ئەمانیش تورانین سەردەمێك لە شیمالی دەریای (خەزەر)دا ژیاون وە لەتاو هەڵمەتی تیرەكانی لای ڕۆژهەڵاتیان ڕوویان كردۆتە ڕوباری گونە (دانوب) وە لێی پەڕیونەتەوە بۆ بەری باڵقانەكان وە لە بولغارستانی ئیستەدا دامەزراون (٦٨٠) میلادی.

ئەم بولغارانە ئەگەرچی بەرەگەز توركن، بەڵام لەگەڵ سلاڤەكاندا زۆر پێكەوەژیاون ..خوورەوشتی ئەوانیان هەلگرتووە ...بەرە بەرە هەتا زمانیشیان گۆڕاوە چۆتەسەر زمانی سلاڤەكان، بەم چەشنە بولغاریەكان ئەگەرچی بەرەگەز توركن بەڵام بە زبان سلاڤن وە هیچ ئاساری توركیان تیانەماوە بوونەتە تیرەیەك لە سلاڤەكانی باڵقان. سەردەمێك بەهێز بوون بەڵام بیزانسەكان كزیانكردن وە نیستە خۆشیان شانازی بەرەگەزی سلاڤەوە ئەكەن.

# نـاوەڕۆك


| ژ | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١ | زمان | ١١٨ |
| ٢ | كورد لە چەرخی بیستەما | ٢٩٤ |
| ٢ | پەیدا بوونی حكومەتی هەرە كۆنی زاغرۆس | ٤١ |
| ٣ | شۆڕشی ئاگری داخ | ٢٩٨ |
| ٤ | مـادو فورس | ٨١ |
| ٥ | سەرەتا | ٧ |
| ٦ | كورتەی تگوراتی مێژوویی زمانی كوردی | ١٢١ |
| ٧ | حكومەتی بەرزیكانی | ١٦٨ |
| ٨ | قەڵاچۆی خێلاتی موكریان | ٢٧٣ |
| ٩ | شارستانییەتی كورد پاش ئیسلامیەت | ٣٠٤ |
| ١٠ | نەتەوەی كورد توركمان نیە | ٣٣٨ |
| ١١ | ناوەڕۆك | ٣٦٢ |
| ١٢ | پێش ڕەو | ٩ |
| ١٣ | سەرەتای پەیدا بوونی ئادەمیزاد لە سەرزەمین | ١١ |
| ١٤ | ئینسانی پێش مێژوو چۆن ژیاوە | ١٥ |
| ١٥ | كوردستان كوێیە | ٢٠ |
| ١٦ | باسی جوغرافیای كوردستان و نەتەوەكانی | ٢٢ |
| ١٧ | هەڵكەوتنی سروشتی مەڵبەندی كوردستان و تەئبیر كردنی لەگیانی كوردا | ٢٧ |
| ١٨ | ئاوو هەوای كوردستان | ٣١ |
| ١٩ | كورد لە كوردستانا پەیدا بووە | ٣٥ |
| ٢٠ | نەتەوە هەرە كۆنەكانی ڕۆژاوای ئێران و ڕۆژهەڵاتی عێراق | ٣٧ |
| ٢١ | رەگەزی نەتەوە كۆنەكانی عێراق و پەیابوونی مەدەنیەت | ٤٢ |
| ٢٢ | شارستانیەت مەدەنیتی ( عیلام ) | ٤٩ |
| ٢٣ | مەدەنیەتی لۆللۆ و گۆتۆ | ٥٩ |
| ٢٤ | دەوری بەرز بوونەوەی كاسی | ٦٢ |
| ٢٥ | دەوری نوشوست | ٦٣ |

| ژ | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٢٦ | مەدەنیەتی کاسیەکان | ٦٥ |
| ٢٧ | مەدەنیەتی میتانیەکان | ٦٨ |
| ٢٨ | ئەهالی کۆنی رۆژهەلاتی ( ئەنەدۆل ) | ٧٠ |
| ٢٩ | کۆچ و رەوی دوایی هاتنی ئەقوامی ئاری تازە | ٧٦ |
| ٣٠ | ووتاری تەئریخی | ٧٨ |
| ٣١ | وەستاندنی کۆچ و رەوو پەیدابوونی ئەتەوەی دوایی ( ئاری) ی ئێستا | ٨٠ |
| ٣٢ | حکومەتی مـاد ( ٨٦٠ – ٥٥٠ ) پ . م | ٨٤ |
| ٣٣ | پشێوی وولاتی مادو هەلسانی قەومی ( پارس – فورس ) | ٩٢ |
| ٣٤ | لەناوچوونی مێدیە | ٩٢ |
| ٣٥ | حکومەتی ( فارس – ئێران ) ی کۆن ( ٥٥٠ پ . م ) | ٩٦ |
| ٣٦ | ناوی کورد چۆن ساغ بووەتەوە | ٩٧ |
| ٣٧ | دوای لەناوچوونی (ماد) مێژووی کورد | ٩٩ |
| ٣٨ | مادی بچوک | ١٠٤ |
| ٣٩ | مەدەنیەت و نەژادی کورد | ١٠٥ |
| ٤٠ | ئایین و بروا | ١٠٨ |
| ٤١ | زەردەشت | ١١٣ |
| ٤٢ | پەیدا بوونی ئاینی ئیسلام و لەناو چوونی کەیانی ئاری کۆن | ١٢٦ |
| ٤٣ | رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئێران | ١٢٨ |
| ٤٤ | سەرنەواندنی کوردستان | ١٣٩ |
| ٤٥ | موسولمان بوونی قەومی کورد | ١٤٢ |
| ٤٦ | دوای ئیسلامەتی هەوالی مێژوویی کوردو کوردستان | ١٤٥ |
| ٤٧ | دەوری سەربەخۆیی کورد | ١٤٨ |
| ٤٨ | حکومەتی سالاریە | ١٤٩ |
| ٤٩ | حکومەتی روادی لە ئازەربایجان | ١٥٠ |
| ٥٠ | حکومەتی دۆستەکی و مەروانی | ١٥٩ |
| ٥١ | حکومەتی ئەیوبی | ١٧٤ |
| ٥٢ | حکومەتی وردەلەکانی کورد | ٢٠٧ |
| ٥٣ | حکومەتی زەند | ٢١٠ |

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا :

- ساڵی ١٨٨٥ لەسلێمانی لەدایك بووە.
- قوتابخانەی روشدییەی عەسکەریی لەسلێمانی تەواو کردووە.
- ئامادەیی عەسکەریی لەبەغدا تەواو کردووە.
- کۆلێژی عەسکەریی سوڵتانی لە ئەستەنبوڵ تەواو کردووە.
- لەسوپای عوسمانیدا بووە بە ئەفسەر، لەکۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا مولازمی یەکەم بوو کە خانەنشین کرا.
- لەسەردەمی پێکهاتنی حکومەتی شێخ مەحمودا بووە بەمامۆستای جوگرافیا و مێژوو لە قوتابخانەی مەحمودیە.
- بەڕێوەبەری قوتابخانەی فەیسەڵیە بووە. پاشان بەڕێوەبەری قوتابخانەی سلێمانی.
- لەساڵی ١٩٣٥ لەسەر کوردایەتی خانەنشین کرا.
- یەکێ بوو لە دامەزرێنەرانی رۆژنامەی بانگی کوردستان لەسلێمانی ساڵی ١٩٢٢.
- لەساڵی ١٩٣٧ رۆژنامەی (ژیان)ی لەسلێمانی دەرکردووە.
- لە ئابی ساڵی ١٩٦٨ لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

## لەبەرهەمەکانی :

- مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمرۆ.
- بەراوردێکی تەئریخی.
- نەتەوەی کورد تورکمان نیە.
- لەوڵاتی گوڵە زەنبەقی سپیا.
- لەگەڵ کۆمەڵێك وتاری مێژوویی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا.

نرخی (6000) دینار